# ژیانی کوردەواریم

د. نورەدین زازا



وەرگێڕانی
باست حەمە غەریب

ناوی کتێب: ژیانی کوردەواریم

نووسینی: د. نورەدین زازا

وەرگێڕانی لە فەرەنسییەوە بۆ عەرەبی: دەروێش غالب- خەسرەو بۆتانی

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە بۆ کوردی :باست حەمە غەریب

بابەت: یادداشت

مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولرەحمان فەرەج

دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی

تیراژ: ٦٠٠ دانە

نرخ:٦٠٠٠ دینار

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپی یەکەم: بەشی یەکەم، هەولێر-٢٠٠٨، دەزگای ئاراس

چاپی دووەم: سلێمانی ٢٠١٢

کوردستان _ سلێمانی

www.serdam.org

بۆ پەیوەندیکردن بە زنجیرەی کتێبەوە: kteb@serdam.org

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتییەکان ژمارە (١٤١٦) ی ساڵی ٢٠١٢ پێدراوە

د. نورەدین زازا

# ژیانی کوردەواریم

یاداشت

وەرگێڕانی لەعەرەبییەوە
باست حەمە غەریب

سلێمانی ٢٠١٢

وێڕای گەلی کورد و وەفایەك بۆ براکەم د.نافیز، ئەم یاداشتە پێشکەش ئەکەم بە هاوسەرەکەم گیلبێرت ڤاڤر و کوڕەکەم شەنگۆ ڤالیری

نورەدین زازا

# پێرست

## تێبینی:

ئەم کتێبە لە دوو سەرچاوە وە کراوە بەکوردی، بەشی یەکەمی کەپێشتر چاپکراوە واتە تا کۆتایی لاپەڕە( )، ئەندازیار (دەروێش غالب)کردوویەتیە عەرەبی و من دوای ئەوەی کرمە کوردی، ئینجا تەواوی کتێبەکەم لەلایەن دەزگای ئاراسەوە بەدەست گەیشت، کە (خەسرەو بۆتانی) کردوویەتیە عەرەبی، بەناونیشانی(حیاتی ککوردی) و بەشی دووەمم لە کتێبەوە کردووە بەکوردی.

کەبەشی دووەمم تەواو کرد بڕیارمدا سەرجەم کتێبەکە پێکەوە چاپ بکەم، چونکە چەندین ناوی کەس و شوێن لەبەشی یەکەمدا هاتوون و لەبەشی دووەمدا دووبارە ئەبنەوە، و ئەو کەسەی بەشی یەکەمی نەخوێندبێتەوە، نازانێت سەرچاوەی ناوەکان چییە و کێن. جگە لەوەش بەشی یەکەم زۆر بەچاکی بلاّو نەبووەتەوە و زۆر کەس نەیانبینیوە. لەبنەڕەتیشدا خۆی هەر یەك کتێبە.

زۆرم هەوڵداوە بەشێوەیەك ئەم یاداشتە بکەمە کوردیی کە خوێنەر واهەست بکات کەنوسەر خۆی بەکوردی نوسیویەتی.

دوای ئامادەکردنی کتێبەکە پێویستم بەچەند وێنەی د.نورەدین زازا و خێزانەکەی بوو. لەرێی بەرێز (د.هۆمەر شێخ موس)ەوە پەیوەندیم کرد بە خاتوو گیلبیرت، هاوسەری د.نورەدین زازا،وە. ئەو وێنانەی بۆ ناردم کە لە کتێبەکەدا بلاّوکراونەتەوە و قایل بوون و مۆڵەتی بۆ چاپکردنی کتێبەکە و لەوبارەیەوە خۆشحاڵی دەربڕی کە سەرەنجام ئەم یادەوەرییانەی د. زازا بەزمانی نەتەوەکەی(کوردیی)بلاّو ئەکرێتەوە.

لێرەدا بەپێویستی ئەزانم کەزۆر سوپاسی ئەو خانمە بەرێزە ئەکەم.

باست حەمەغەریب

سلێمانی- نۆڤەمبەری ٢٠١١

## پێشەکی

سەعات ۱۹:۳۰ ی سەرەتای مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۸۸ و لەژوورێکی نەخۆشخانەی سیسیل لە شاری لۆزان، نورەدین زازا، لەوکاتەوەی دوو بڕبڕەی ملی شکابوو، لەسەر جێگەکەی بەبێ جووڵە راکشابوو و سەری چەقیبووە ناو سەرینەکە و چاوی بڕیبووە سکرین(شاشە)ێکی بچووك.

لەرێی رۆژنامەی لۆمۆندەوە کە تا رۆژێك پێش مەرگی، لە ۷ ی تشرینی یەکەمدا، ئەیخوێندەوە، ئەیزانی رووداوی گرنگ لەجیهاندا رووئەدەن و رژێمە دیکتاتۆرەکان لە فەرسۆفیاوە تا سانتیاگۆی چیللی، ئەلەرزن و بەرەو دارمانن.

(تەنیا بزووتنەوەیەکی جەماوەریی فراوان ئەتوانێت پۆلۆنیا و چیللی بەرەو دیمۆکراسیی بەرێت) بەدەم خۆیەوە و بەگەشبینییەکی زۆرەوە نا، بەڵام بەمتمانەیەکی تەواوەوە وای وت.

لەپڕ لەسکرینە بچکۆلەکەوە چەند دیمەنێکی ترسناکی بینی، تاڵییەکی بیرخستەوە کە خۆشی چێشتبووی: رەوی بێکۆتایی کوردی عێراق بۆ هەڵاتن لەدەست گازی کیمیایی.

چونکە دوای هەڵەبجەی بەهاری ساڵی ۱۹۸۸ کە تەنیا نارەزاییەکی شەرمنی لێکەوتەوە و پاش یەکەم هێرشی کیمیایی لەهاوینی ۱۹۸۷دا لەناوچەی بالیسان کەدوور لەچاوی جیهان روویدا، سەدام حسێن بڕیاری دا سەرلەنوێ دەست پێبکاتەوە بۆ دروستکردنی کۆڕەوێکی تر لە کاروانی قوربانیدانی کوردی عێراقدا.

دیمەنی ئەو منداڵ و پیر و ژنە بێوەیانەی هیچ تاوانێکیان نەبوو جگە لەوەی بەکورد لەدایك بووبوون، هێندە کارەساتبار بوو مرۆڤ بەرگەی نەئەگرت. ئەوانیش وەك نورەدین زازا کورد بوون، کە هەر لەتەمەنی خونچەییەوە بەگیان و جەستەی، نرخی پابەندبوونی

بەکوردبوونی خۆیەوە،دا- تەمەنی پێنج ساڵ بوو باوکی و براکەی خرانە زیندانەوە- خۆشی لەزیندانەکانی سوریاو عێراقدا مەینەتی زۆری بینی و یاساوڵەکان بەسەریدا ئەیانقیژاند:

-ها، کوردی جیقن، کاتی ئەوە نەهاتووە ببیت بەعەرەب؟!

ئێوارەی ئەو رۆژەی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ۱۹۸۸ پیشاندانی ئەوگەلەی زۆرجار وڵاتانی خۆرهەڵات و(برا موسڵمانەکانی)و رای گشتیی و ویژدانی جیهان، پشتگوێی خستووە، فرمێسك و نائومێدیی و هاوکات ئازایەتیی و دەروونی بەرزی ئەوی وروژاند.

لەئاست هەموو ئەودیمەنە کارەساتبارانەدا، نورەدین زازا ئەیتوانی دەست بنێ بەدوگمەی تەلەفزیۆنەکەدا بۆ ئەوەی ئیتر دیمنی میللەتە سەربڕدراوەکەی نەبینێت، بەڵام سەرەڕای ئەوەی بێتوانا و شەکەت لەجێگەکەیدا کەوتبوو، بۆ ساتێکیش دەستبەرداری چاودێریی رووداوەکانی جیهان و کورد نەبوو و تا هەڵمژینی دوا گەردیلەی ئۆکسجین، هاوسۆزیان بوو و نەیهێشت تەلەفزیۆنەکە بکوژێنینەوە.

نورەدین زازا، ئەگەرچی هێشتا خۆی نەیئەزانی، گەیشتبووە دواقۆناغەکانی نەخۆشی شێرپەنجە کە سێ ساڵ بوو لەبەرامبەریدا بەرگریی ئەکرد، کەچی وێڕای لاوازیی و ماندوویی، تا دە رۆژ پێشتر و بۆ حەڤدەهەمین ساڵی لەدوای یەك، بەردەوام بوو لە وانە وتنەوە لەزانکۆی لۆزان و ململانێی ئەکرد لەگەڵ ئازارەکانی و لەبیر خۆی ئەبردنەوە.

ئەیوت کە شادمانە بەوەی دوای چەند رۆژێك ئەگەڕێتەوە بۆماڵەکەی لە بوسینیی، چونکە باوەڕێکی تەواوی هەبوو بەموعجیزەکانی ڤیزیۆتیراپی(شێوازە سروشتیی و جەستەییەکانی)، کەساڵێك پێشتر و دوای نەشتەرگەرییەکی سەختی بڕبڕەی پشت، توانای رۆیشتنی پێ بەخشیبووەوە.

هەر لەمنداڵییەوە نوورەدین زازا راهاتبوو پێچەوانەی ئاڕاستە و دژی هەمووان بێت، دژی پێشبینیی هەندێك پزیشك و تەنانەت دژی خودی خۆشی، چونکە کێبڕکێی- ژیان

لەبەرامبەر مەرگدا — کە چارەنووسی مرۆڤایەتییە لە ململانێ لەپێناو مانەوەدا، بەشێوەیەکی توندوتیژتر بەسەر کورددا سەپاوە. و نەکرێت هەموو رەوتی ژیانی لەنێوان تورکیا و سوریا و سویسرا، لە کۆمەڵێك ململانێ و رووبەڕووبوونەوەدا چڕبکەینەوە، لەپێناو سەرکەوتنی ژیان و راستیدا.

لەساڵی ۱۹۷۰وە لەسویسرا ژیاوە و پێشتریش کاتێك لەساڵانی نێوان ۱۹٤٦ و ۱۹٥۷دا بۆ خوێندن لێرە بوو، توانیبووی پەیوەندیی دۆستانەی پتەو درووست بکات و ساڵی ۱۹۸۸ رەگەزنامەی سویسریی وەرگرت و سیستەمی سیاسیی هیلفیتی خۆشئەویست و وەك نموونەیەك سەیری ئەکرد کە ئەشێت لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستیش پەیڕەو بکرێت لەپێناو بەرژەوەندیی هەموو گەلانی ناوچەکەدا.

لەو رۆژانەی پاییزی ۱۹۸۸دا، کوردستانی سەردەمیی منداڵی ئەو، لەڕێی پەیوەندیی تەلەفۆنیی خوشکەکانی و برازاو خوشکەزاکانییەوە، بوون و ئامادەیی زیاتری هەبوو لەلای، و منداڵیی کوردستانی تورکیای بەڕەنگ و بەرامە و چیرۆك و نەهامەتییەکانییەوە، لەڕێی دەنگی ئەو خزمانەیەوە کە لەوێ مابوون، دووبارە هەڵئەقوڵایەوە.

نوورەدین زازا، دەساڵی سەرەتای تەمەنی لەکوردستانی تورکیا ژیا و دواتریش دوای زیاتر لە۳۰ ساڵ دووریی، لەنێوان ساڵانی ۱۹٦۷ و ۱۹۷۰دا، لەوێ نیشتەجێ بووەوە و لەماوەی ئەو سێ ساڵەدا چاوەڕێی ئەنجامی پرۆسەی دیمۆکراتیزەکردنی سیاسیی کرد، بەڵام نائومێد بوو و ناچار بوو بۆ دەربازکردنی سەری خۆی لەپەتی سێدارە و رزگار بوون لەدواکەوتنی پۆلیس، لەساڵی ۱۹۷۰دا پەنابەرێتە سویسرا. من ساڵی ۱۹۷۱ لەوێ بینیم.

سەرەڕای روووناکبیرییە فراوانەکەی، شایستەیی مرۆڤانە و خانەدانی و بیرێکی بێخەوش پێکەوە لە نوورەدین زازادا کۆبووبوونەوە. وێڕای ئەوەی شیعرەکانی ئیلوار و نازم حیکمەتی لەدڵەوە لەبەر بوو و ڤیکتۆر هۆگۆ و مۆزارتی ئەپەرست، ئەشیزانی چۆن گوێ بگرێت و تەماشای دیمەنەکانی رۆژانەی سروشت بکات و سەرسام بێت بەخوێندنی

باڵندەکان و بەری درەختەکانی بۆسینیی و لەدارستانەکانی ڤالی و ئاسمانی ئاگادین وردبێتەوە و چێژ لەئێستا ببینێت و شەیدای هەموو شتێکی جوان بێت.

سەرەڕای بوونی لەسویسرا یان لەهەر جێیەکی دیکەی جیهان، بەڵام ئەوە کوردستان بوو لەناخیدا چەسپی بوو و بانگی ئەکرد تا سەرەنجام دووبارە پابەندی کردەوە.

ئاخر چۆن- دوای ساڵانی زیندان و ئەشکەنجە و مناڵیی ئازاراویی ودوورخستنەوە و پەرتەوازە کردن و بەندکردنی براکانی و باوکی و مامەکانی- ئەتوانێت(ئەتوانین) بەئاشتی لە سویسرای بێلایەن و خۆشدا بژین، لەکاتێکدا کورد بەردەوام گرفتاری سەرکوتکردن و چەوساندنەوەن لە تورکیا و عێراق و ئێران و سوریا و تەنانەت میدیاش لەبەرامبەر ئەمەدا بێدەنگە و زۆربەی کات ورتەشی لێنایەت؟!

چۆن ئەشکەنجەدانت بیر ئەچێتەوە کەدوای تێپەڕبوونی زیاتر لە ٢٠ ساڵیش هێشتا شوێنەوارەکەی بەجەستەتەوە مابێت؟!

ئازاری چەندبارەی شانت کاتێك هەوا سارد ئەبێت، شوێنەواری ئەو ١٠٠ قامچییەی یاساوڵەکە لەزیندانی(المزە) ی دیمەشق لێیدایت و دانە جیرەی یاساوڵەکەت کە شەوت هەراسان ئەکات و ئەیکاتە مۆتەکە.

لەراستیدا ژیانی رابردووی، جیاواز نییە لەژیانی ئێستای و ئەکرێت بڵێین ئاوێزانی یەکتربوون.

ئەتوانم بڵێم بازنەی بایەخەکانی نورەدین زازا تەنیا لەکوردستاندا قەتیس ئەبوو و هەرگیز بوغز و کینەی لەدڵدا هەڵنەئەگرت؟

هەموو جۆرەکانی زوڵم و زۆر ئەیوروژان و هەراسانی ئەکرد. بەهاوسۆزیی و بایەخەوە سەیری هیچ مەسەلەیەکی نەئەکرد زیاتر لەمەسەلەکانی تر، کاتێك بابەتەکە پەیوەست بوایە بەسەروەریی هەرەشە لێکراوی مرۆڤەوە. وەك گەواهییەك خۆم بینیومە گریاوە کاتێك گوێی لەژنێکی رزگاربووی فەرەنسی بوو کە بەسەرهاتی هیرۆشیمای ئەگێڕایەوە و

نیگەرانی و سەراسیمەییم ئەبینی لەبەرامبەر بەسەرهاتی چیللی و رۆمانییەکان و چیرۆکەکانیان لەبارەی ئەشکەنجەوە. چونکە بەلای نورەدین زازاوە پێشێل کردنی مافەکانی مرۆڤ، هیچ کامیان زیاتر لەوی تریان مایەی قایل بوون نین.

کاتێ بیری لەپێویستیی رێزگرتن لەناسنامەی جولەکە و فەلەستینیی و ڤێتنامی و تیبتییەکان ئەکردەوە، مافی خۆی بوو لانی کەم بیر لەکوردیش بکاتەوە، چونکە ئەو کوردە هەتیو و بێزراوانەی سەرزەویش شایانی هەمان بایەخ پێدانن.

ئەو کوردانەی کەمزیاتر لەبیر کراون و لەلایەن سیاسییەکانەوە- واقیعی سیاسی ئەسەپێنرێت- و بێ کۆڵدان بەرگریی لەمەسەلەکە ئەکرد لەمیدیا و کۆنگرەکاندا، لەکاتێکدا کورد نەبووبوونە بابەتی لاپەڕەی یەکەمی رۆژنامەکان. سەرەنجام سەرەڕای بێهودەیی هیواکانی لەویستی راستەقینەی خۆرئاوا و نەتەوەیەکگرتووەکان لەوەی مافەکانی گەلی کورد بگێڕنەوە بۆی، تووشی خەم و ئازار و تەنانەت نائومێدیی بوو لەدابڕان و پارچەبوونی نێوان کورد و رەفتاری هەندێك لەسەرکردە و بەرپرسەکانی لە درێژەدان بەرێگەی خوارەخێچ و کەللەرەقیی و نەزانیی.

باوەڕی تەواوی هەبوو بە باشییەکانی گفتوگۆ و سیستەمێکی دیمۆکراسیی هاوشێوەی هیلفیتیی(کۆنفیدراڵیی سویسرا)، نەك زمانی هێز و توندوتیژیی.

لە٧ تشرینی یەکەمی ١٩٨٨ بەدواوە گەلێك گۆڕانکاریی و پێشهات لەجیهاندا روویاندا کە لە ناخیاندا تۆوی هیوا و هاوکات تەمومژیان هەڵگرتبوو. بەهۆی جەنگی کەنداوەوە مەسەلەی کورد ئەمرۆ باشتر ناسراوە، بەڵام ئایا ئەمە ئەبێتە یاریدەدەر بۆچارەسەرکردنی و رۆژێك لەرۆژان گەلەکەی ئاواتی ناسینی مافە هەرە بنەڕەتیی و لەپێشەکانی بەدی دێنێت؟

دوای ئەوەی لەمانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٩١ دا و دواتریش لەمایسی ساڵی ١٩٩٢دا کوردستانی عێراقم ناسی، گەیشتمە ئەو بڕوایەی کە کوردستان ئایندەیەکی

گەش و رووناکی هەیە. بەڵام وادیارە کە سەرەڕای درووست بوونی سیستەمێکی نوێی جیهانیی، کەچی هێشتا ترسنۆکی و دووڕوویی، ئایندەیان رووناکە.

((هەتا بەردەوام بن لە پلیشاندنەوەی مرۆڤ و چەوساندنەوەی لەسەرتاسەری جیهاندا، ئەوا مرۆڤایەتی سبەینێیەکی باشتری نابێت.))

بەم دەستەواژەیە نورەدین زازا کۆتایی بەیاداشتەکانی ئەهێنێت کە ئەمڕۆ چاپکراوە.

منیش ئەمڕۆ وەك ئەو، باوەڕم وایە کە ئەگەرچی شەڕەکە لەپێشەوە دۆڕاوە، بەڵام نابێت دەستبەرداربین و واز لە جەنگین بهێنین، چونکە تێکۆشان بەشێکە لە مرۆڤ و لەناخیدایە.

ئەمە ئەو وانەیەیە کە لەنورەدین زازاوە فێربووم.

**گیلبێرت ڤاڤر زازا**

**بوسینیی، ۱۸ی مایسی ۱۹۹۳**

# کوردستانی تورکیا

- لەبەهەشتەوە بۆ دۆزەخ

- لەدایکبوون و منداڵیی تا تەمەنی ١٠ساڵی

- ژیانی ڕۆژانەی خێزانی کورد

- بەهەشتی خێزانیی

- دابونەریتی گەلی کورد لەتورکیا

- دۆخی گەلی کورد لەتورکیا

- لەسایەی ئیمپراتۆریی عوسمانی و مستەفا کەمال دا

- چەوساندنەوە و قەسابخانەکان

لەشارێك لەدایكبووم بۆنی مسی لێئەهات، لەسایەی دەسـەڵاتی عوسمانییدا،ولـەنزیك سەرچاوەكانی رووباری دیجلە،لەوڵاتێكی شاخستانی زۆر جوانـدا كەكوردسـتانی توركیایـە. شارەكەی زێدم ناوی (مادن) بوو —لە(مەعدەن)ی عـەرەبی وەرگـیراوە، چـونكە كانزایـەكی زۆری تیایە- ودۆڵێكـی قـووڵ ئـەیكرد بەدووبەشـەوە. دێتـەوە یـادم هەمیـشە هەواكـەی ئالوودەبوو بەدووكەڵی كانەكان.

كانزاجیاوازەكانی وەك مس و قورقوشم و كـرۆم و زێـر، ئـاوی جۆگـە و رووبارەكانیـان رەنگ ئەكرد بەرەنگی زەرد و سەوز و وەنەوشەیی. چەندین سەعات چـاودێریی ئـەو جۆگـە رەنگاورەنگانەم ئەكرد پێشنەوەی برژێنە باوەشی دیجلەوە. زستانی سـەختم لەهەمووشـتێك زیاتر دێتەوە یاد،چونكە شارەكە لەسەرسنگی قەڵاكانی زنجیرە چیای(ئـەنتی تـۆرۆس)بـوو لەبەرزایی زیاتر لە ١٠٠٠ مەتردا، بۆیـە مـادن زسـتانێكی تـەوەریی(قطبـی)راسـتەقینەی هەبوو. سەرما هەر لەناوەراستی تشرینی دووهەمـەوە هاوكـات لەگـەڵ رەشـەبای سـاردی پڕوكێنەر دەستی پێئەكرد، و هێنـدەی نەئـەبرد سەرچـاوە و جۆگـە و رووبارەكـان ئـەبوون بەسەهۆڵ. لەمانگەكانی كانوونی یەكەم و دووەمیشدا فەرشێكی كـانزایی سـتوونیی بـەفر، سەرتاسەری شارەكە و چیاكانی دەوروبـەری دائەپۆشـی. هـەر هێنـدەی بەفرەكـە لـەبارین ئەكەوت، رەشەبای توندی خۆرهەڵات (بای رەش) هەڵئەكرد و گسكی ئەدا لەلوتكـەكان و بەفرەكـەی رائەماڵییـە ناودۆڵـەكان و دەوروبـەری درەختـەكان و تەنانـەت سـەردیوار و لەپەنجەرەكانەوە ئەیكردە ناوماڵەكانیش.

بـەڵام مـانگی شـوبات- وەك ئـەوترێت شـێتبوونی وڵاتـە شـاخاویەكان- سـەرما زیادئەكات تائەگاتە دووئەوەندە و سـێ ئەوەنـدی ئاسـتی ئاسـایی خـۆی و پلـەی گـەرما دائەبەزێت، هەندێكجار بۆ ٣٠ و تەنانەت ٤٠ پلەی سـەدی ژێـر سـفر. گـەردەلوولی بـەفر

دەستپێنەکات لەگەڵ ڕەشەبای ساردی سەیبیریا کەلەچیاکانی قەفقاسەوە هەڵئەکات و چەندین ڕۆژ بەردەوام ئەبێت وەك ئەوەی بەنیازنەبێت هێوربێتەوە.

ئێستاش مانگێك لەمانگە سەختەکانی شوباتم دێتەوە یاد. ئەوساڵە بەفرێکی هێندە زۆر باری، کەزۆربەی ماڵەکانی داپۆشی. باوکم لەماڵەکەی خۆمانەوە کەکەوتبووە بەرزاییەکانی شارەکە و درەخت دەوریدابوو، تونێلێکی بەژێر بەفرەکەدا هەڵکەند تادیوەخانەکەمان،بۆئەوەی ئاگای لەمیوانەکانی بێت. لەو زستانە نائاساییی و درێژەدا کەزۆر سەختبوو، نیوەی مەڕومالاّتی کوردستان تیاچوون و ڕەشەولاّخەکان هێندە برسیبوون پاشمەڕۆی خۆیانیان ئەخوارد.

شەوێك لەشەوەکانی مانگی شوبات، دایکم کە چەندین ساڵ بوو بەدەست نەخۆشی دڵەوە ئەیناڵاند، ژانگرتی. دەوروبەری سەعات یەکی پاش نیوەشەو دڵەکوتێی پێکەوت و باری تەندروستیی تەواو تێکچوو. سەرەڕای نەبوونی پزیشکێکی مۆڵەتدار لەشاری مادن کەژمارەی دانیشتوانەکەی ئەوکاتە ٢٠٠٠٠ کەسێك ئەبوو،و واچاوەڕوانئەکرا براگەورەکەم، دوای ئەوەی بڕوانامەی دکتۆرای پزیشکیی لەزانکۆی ئەستەمبوڵ وەرئەگرێت ببێتە یەکەم دکتۆر لەم شارەدا، بەلاّم ئەمانتوانی یارمەتی دایکم بدەین، چونکە شارەکە شانازیی ئەکرد بەپزیشکە میللییەکان و جەراحەکانی شکاویی و مامانەکانییەوە. بەناوبانگترینی ئەو مامانانە ژنێکی یۆنانی نەژاد بوو کەلەکۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا لەمادن نیشتەجێ بوو، و بەناوە کوردییەکەی(نارخاتوون) ئەناسرا، ولەسەردەستی ئەو، براکانم، چوارخوشکەکەم و من لەدایکبووین. بەلاّم لەوکەشە دۆزەخییە سەختەدا کە نزیکەی ٥ مەتر بەفر باریبوو، چۆن ئەیتوانی بگاتە ماڵی ئێمە؟ چونکە بەساڵاچوو، وپیرێکی لەرزۆك بوو. شاری مادنیش گالیسکەی سەر بەفر و تەختەی خلیسکێنەی تیانەبوو، ئەگەرچی بەفراوانی لەناوچەکانی خۆرهەلاّتی کوردستان بەکارئەهێنرا. بۆیە ناچار ئەبوو(کۆسما)،بەهێزترین خزمەتکارمان، بەکۆڵ بیهێنێت،وبۆ ئەوەی بەبێوەی بگات، لبادێکی خورییان لەسەربەفرەکە ڕاخستبوو

کەپانییەکەی مەترونیوێك و درێژییەکەی ٩ مەتربوو. کاتێـك (نارخـاتوون) ئـەو ماوەیـەی ئەبڕی، پیاوەکان لبادەکەیان هەڵئەگرت و لەپێشییەوە رایان ئەخستەوە. ئەمەش زۆرسـەخت و ناهەمواربوو، چونکە سەعات دووی بەرەبەیان کەچاو چاوی نەئەدی و هێـشتا ڕەشـەباکە لەوپەڕی هێزی خۆیدابوو، ئەم کارە ئەکرا.

لەماوەی سەعاتێکدا نارخاتوون ٣٠٠ مەتری بڕی و سەعات سێی بەیانی،بەشـەکەتیی گەیـشتە مـاڵی ئێمـە و لەسـەرمادا گرمۆڵـە بوویـوو. دانیـشتوانی ماڵەکـە کەوتنـە گەرمکردنەوەی و لەسەر کورسییەکی سەر تەنوورەکە دایاننا.

سەعات ٥ ی بەیانی من هاتمـە ئـەم جیهانـەوە. کـەس نـەیوێرا بـاوکم بێـداربکات و هەواڵەکەی پێبڵێت، وتابـەیانی رۆژی دوایـی کەلەخەوهەڵـساو چـوو بـۆ بەسـەرکردنەوەی دایکم، ئاگای لەرووداوەکان نەبوو. دایکیشم رووپۆشـی لەسـەرمناڵێکی قـژ زەردی خـرپن لابرد کەبەئارامی لەپەنایەوە خەوتبوو. بـاوکم پەنجەیـەکی هێنـا بەروومـەتی منـاڵەکـەدا و ناوچـەوانی دایکمـی مـاچ کـرد و تێـی تەقانـد بـەرەو دیوەخانەکـەمان،ئێوارەش پارچـە ئاڵتوونێکی بەزنجیرەوە پێشکەشی دایکم کرد، ئیتر ئەوە هەمووشتێك بوو.

سەبارەت بەلەدایکبوونی براکـانی تـرم دۆخەکـە جیـاواز بـوو، ئـەو کاتـە ئاهـەنگ و زەماوەند بۆ ماوەی حەوت شەو و حەوت رۆژ سازئەکرا و بـاوکم گۆرانیبێـژ و بەسـتەبێژانی بانگئەکرد و پێشبڕکێی ئەسپسواریی رێکئەخـست و خـوانی هـەزاران میـوانی پێـشکەش ئەکرد. ئەوجۆرە ئاهەنگانە پێش جەنگی یەکەمی جیهان سـازئەکرا، کاتێـك شـاری مـادن بەگشتیی و بنەماڵەی ئێمە بەتایبەتیی لەژیانێکی خۆش و شادیی و خۆشگوزەرانیدا بـوون. بەڵام من دوای چوارساڵ جەنگی وێرانکەر کەئیمپراتۆریی عوسمانیی پارچە پارچـەکردبوو، و چارەنووسی کوردستان نادیاربوو، لەدایکبووم.

لەکاتی رێکەوتننامەی ڤێرسای دا، وەفدی کورد بەسەرۆکایەتی شـەریف پاشـا هـەوڵی دابوو هێزەکانی سەرکەوتووی جەنگ بێنێتە سەر قایلبوون بەداواکانی کـورد لـەپێکهێنانی

ولاتێکی سەربەخۆدا، ئەوکاتە مستەفا کەمال سەرگەرمی ئازادکردنی ناوچەکانی ئێمە بوو لەیۆنانییەکان و دەرکردنی ئینگلیز و فەرەنسییەکان لەولاتەکە.

فەرەنسییەکان ناوچەکانی عەنتاب و ئورفە و سیلیسیا یان لەباشوور و باشووری خۆرئاوای تورکیا داگیربوو کەزۆربەی دانیشتوانەکەی کوردبوون، بەلام دانیشتوانی سیلیسیا زۆربەیان تورك بوون. فەرەنسییەکان بایەخیان بەم ناوچانە ئەدا بەمەبەستی دروستکردنی دەولەتێکی ئەرمینی لەپەنابەرە ئەرمەنەکانی سوریا.

سیاسەتەکانی مستەفا کەمال کوردییان نیگەران کرد، هەروەك چاوبڕینی ئەرمەن لەباکووری کوردستان نیگەرانی کردن، سەرەڕای ئەوە هەندێك ناسیونالیستی کورد ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ هاوکاریکردن لەگەل ڕێکخراوەکانی ئەرمەن لەپێناو پێکهێنانی دەولەتێکی ئەرمەنی و یەکێکی کوردیدا، و چەند ڕێکەوتنێکیش لەنێوان نوێنەرەکانیاندا ئیمزاکرا بەمەبەستی ئەوەی داواکانیان پێشکەشی پەیماننامەی (سێڤر) بکەن، کەسەرگەرمی ئامادەکاریی بوون بۆ لێکۆلینەوەی چارەنووسی گەلانی نیشتەجێ لەچوارچێوەی خاکی ئیمپراتۆریی عوسمانیدا. ئەوکاتە هێشتا بزووتنەوەی میللیی کورد بازووی بەهێز نەبووبوو، لەبەرامبەردا مستەفا کەمال سیاسەتێکی سەربازیی و مایکافیلیانەی دووفاقی گرتەبەر و بەخێرایی ئەو قازانجانەی چنییەوە کەدۆخەکە بۆی ڕەخساندبوو، و سوودی لەناژاوەکانی کورد و هیواکانی وەرگرت. ئەو لێکگەیشتنی نێوان کورد و ئەرمەنی لەپاریس بەخیانەت دانا و ئامادەیی دەربڕی بۆدانی ئۆتۆنۆمی بەکورد لەچوارچێوەی دەولەتی نوێی تورکی ڕزگارکراو لەداگیرکەری دەرەکی، و بڕوای وابوو ئینگلیزەکان لەم ئەرکەدا یارمەتی ئەدەن.

کورد تاڕادەیەکی زۆر بڕوایان بەبۆچوونەکانی هێنا، تەنانەت یەکەمین یەکەکانی خۆبەخش لەشارە کوردییەکانی (ئەرزرۆم، وان و بەدلیس) پێکهێنرا. ئەمانە ئەو شارانەن کە ئەرمەنەکان چاویان لەسەری بوو. مستەفا کەمال کۆمەلێکی ٦٠ کەسی لەسەرۆکە

دیارەکانی کورد لەخۆی کۆکردبۆوە و بەوانـە دژایـەتی ناسیونالیـستەکانی کـوردی ئـەکرد کەبـەدوای چارەسـەرێکی نێودەوڵـەتیی کێـشەی کـورددا ئەگـەڕان و لەمەشـدا پـشتیان بەپـشتیوانیی ئینگلیـز قـایم بـوو، چـونکە پـرۆژەی پێکهێنـانی دەوڵـەتێکی کـوردیی، ئینگلیزەکـانی هەراسـان نەئـەکرد کەپێـشتر کوردسـتانی دەوڵەمەنـد بەنـەوتی عێراقیـان داگیرکردبوو، وهەندێك بەڵێنیان دابوو بەعەرەب و هاوکات ڕێککەوتنێکیان لەگەڵ فرەنـسا ئیمزا کردبوو بۆ دابەشکردنی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست لەنێوان خۆیاندا.

لەڕاسـتیدا بایـەخی پـەترۆڵ بەتایبـەتی و خۆرهـەڵاتی ناوەڕاسـت بەگـشتیی، تـەنیا هەربەلای ئینگلیزەوە سـتراتیژیی نـەبوو، روسـیا کەشۆڕشـە بەڵـشەفییەکەی سـەرکەوتنی بەدەستهێنا بوو، بەهەموو توانایـەوە پـشتیوانی لەبزوتنەوەکـەی مـستەفا کـەمال ئـەکرد بەئامانجی فراوانکردنی دەسەڵاتی (نفوذ)ی سۆڤیەت لەم ناوچەیەی جیهاندا.

## بۆچی ئینگلتەرە هانی مافی نەتەوەکانی ئەدا لەدیاریکردنی چارەنوسیاندا؟

ئەمە ئەو پرسیارە گەورەیەبوو کەکورد ڕووبەڕووی بووەوە.

کـاتی لـەدایکبوونی مـن، کوردسـتان لـەدۆخێکی کارەسـاتباری راسـتەقینەدابوو. ناوچەکانی باکووری کوردستان کەشەڕی خوێناویی نێوان روسیا و عوسمانیی بەخۆوە دیبـوو، بەتەواوی وێران بووبوو، ودانیشتوانەکەی ناچاربووبوون وڵات بەجێبهێڵن، بـەڵام ناوچـەکانی تری کوردستان لەبرسێتییەکی ترسناکدا ئەژیان.

لـەمادن پرۆسـەی دەرهێنـان و تواندنـەوەی مـس وەسـتابوو، بێکـاریی زۆربـەی دانیشتوانەکەی گرتبووەوە، بێکارانی گوندەکانی دەوروبەر پەنایان ئـەبردە بەرخێزانـەکانیان یا رایان ئەکرد بۆ دەرەوەی وڵات بەدوای کاردا.

رۆژ بەرۆژ ژمارەی نەدارەکان زیادی ئەکرد، بەڵام سەرەڕای ئەوەش هـەژاریی و نـەداریی خۆیان دەرنەئەخست لەبەر سەربەرزیی خۆیان. بەپێی دابونەریت ئەبوو دەوڵەمەنـدەکان زۆر بەنهێنیی یارمەتی نەدارانی وەك نەخۆش و پەککەوتەو بێوەژن و هەتیوەکان بدەن.

باوکم، کەخەڵك نازناوی (وەلی)یان لێنابوو، شەوانە توورەکە ئـاردی ئـەبرد و لەبـەردەم دەرگەی ماڵی نەدارەکاندا دایئەنا، ئەو تامردنی لەساڵی ١٩٣٣دا ئەم کـارەی ئەنجامئـەدا. لەو ساڵەدا دەسەڵاتدارانی تورکیا هەموو کانەکانیان خۆماڵی کـرد و تـەکنیککاریان هێنـا بۆدەرهێنان و تواندنەوەی مس لەمادن.

باوکم هەست ناسك و سەنگین و کەم قسەبوو، بەڵام زۆر مرۆڤ و بەخـشندەبوو، چـەندی رێز لەمرۆڤ ئەگرت ،هێندەش بـەزەیی بەئاژەڵـدا ئەهاتـەوە، چـەندین جـار بینیومـە پێـی بەرزکردۆتەوە بۆئەوەی ئازاری مێروولەیەك نەدات.

بۆرژوازیی کـشتوکاڵیی ئەوکاتـە تینـوی فێربـوون بـوو، و ئەکەوتـە ژێـر کاریگـەریی هەرشتێك لەئەوروپا، یا لەئەستەمبوڵەوە بێت، بەڵام باوکم کەمتر ئەکەوتـە ژێرکاریگـەریی ئەوانەوە، و گیانە پاکەکەی خۆی پاراستبوو، و زۆری حەز لەئەدەبی کلاسیك و فارسی بوو، و زۆری هانئەداین بۆ خوێندن، ئەگەرچی بڕوای بەهەندێك سیمای نـوێی شارسـتانی نـەبوو. جارێکیان بەهۆی رووداوێکی ئۆتۆمبیلەوە برینداربوو، هاواری کرد (ئۆتۆمبیل دەسـتکردی شەیتانە) و دوایئەوە جارێکیتر پێی نەخستە ناو ئۆتۆمبیلەوە.

ژوورەکەی باوکم میحرابێکی راستەقینەبوو، و کەسمان بۆمان نەبوو کەخۆی لەوێ نـەبێ بچینە ژوورەکەیەوە. رۆژێك لەرۆژان، تەمەنم ٣ یان ٤ ساڵ بوو ئـەو قەدەغەیـەم شـکاند و چوومە ژوورەکەیـەوە و خەنجـەرێکم ماشـییەوە کـە دەسـکەکەی زۆرجـوان بـوو، وپێـشتر بینیبووم. بێگومان باوکم هەستی بەنەمانی خەنجەرەکەکردبوو، بەڵام بەسـەرخۆی نـەهێنا و هەرگیز باسی مەسەلەکەی نـەکرد، چـونکە رقـی لەدەمـەقاڵێ بـوو، و بەدەگمـەن لەگـەڵ مناڵەکانی قسەی ئەکرد، بەدەگمەنیش لەسـەر سـفرە دائەنیـشت بـۆ نـانخواردن، بەپەلـەو بێدەنگ نانی ئەخوارد، تەنانەت بەتیلەی چاویش سەیری نەئەکردین، پاشان ئەگەڕایـەوە بـۆ سەرۆکاری کردنی دیوەخانەکە.

لەبەرئەوەی ئەو سەردەمە مـادن ئـوتێلی لێنـەبوو، میوانـەکان لای ئـەو خواپێداوانـە ئەخەوتن کە دیوەخانیان هەبوو.

دیوەخانەکـەی ئێمـە چـەند سـەدمەترێك لـەماڵی خۆمانـەوە دووربـوو، لەوسـەریەوە میوانخانەیەکی خۆرهەڵاتی بوو، بەفەرش راخراوبوو، باوکم لەوپەڕی لای راسـتەوە لەسـەری دائەنیشت، چەندین سەعات لەوێ ئەمایەوە و راخەرەکانی رێکئەخست لەسەر زەوییەکە، و تەسبیحاتی ئەکرد و لەگەڵ میوانەکانی قسەی ئەکرد.

میوانەکان دوای ئەوەی پێڵاوەکانیان لەبەردەرگاکە دائەکەند بـەپێی تەمـەن و پێگـەی کۆمەڵایـەتییان لەنزیکییـەوە دائەنیـشتن، و منداڵـەکان هەمیـشە لەسـەر کومبارەکـان دائەنیـشتن، هـەروەها خزمـەتکارەکانیش کـە بەدەگمـەن ئەحەوانـەوە، بـەردەوام بـەپێوە ئەوەسـتان و خزمـەتی میوانـەکانیان ئـەکرد بـەدانانی قـاوە و چـا یـاخواردن، بـاوکم و میوانەکانیشی سەرگەرمی گفتوگۆی سیاسیی و فەلسەفی بوون.

لەو کاتانەدا ئەرکی ژنان زیاترئەبوو لەمویەقدا و ئەبوو ئـەرکی ئـەو هـەموو میوانـە و بەردەست و ولاخەکانیان جێبەجێ بکەن. هەندێك جار ژنـانی ماڵـەوە فریـای ئـەو هـەموو کارە نەئەکەوتن و ناچارئەبوون کچانی خزم و دەوروداوسێ بانگبکەن بۆ یارمەتیدان.

بەڵام من زۆر بەدەگمەن ئەچووم بۆ دیوەخانەکە. جارێکیـان گـوێم لەسـێ کـەس گـرت کەچووبوون بۆ میسر بۆچاندنی پەمو، هەستم ئەکرد لەئەستێرەیەکی ترەوە هاتوون. بیرمـە باوکم پرسیاری لێئەکردن سەبارەت بەدۆخی ژیان لەمیسر و سیاسـەتی پادشـا و بـارودۆخی خەڵکی میسر.

ئەوکاتە دووان لەخوشکەکانم ژوورێکیـان لـەقاتی دووەم گرتبـوو، و مـن لەژوورەکـەی دایکم ئەخەوتم. چەند جوان بـوو بەچاوەڕەشـەکانی و قـژە ئاوریـشمییەکەیەوە، ئەوەنـدەش توندبوو بەرامبەر منداڵەکانی و بەتایبەت دوامنداڵمان کە زۆری دایکی خۆشئەویست.

هەموو شەوێك كە خەوی لێنەكەوت من هەڵئەستام و شاڵەكەی سەریم لێئەكردەوە و وەكو تۆپێك لەسەرسنگم دامئەنا و بەهەموو توانای دەستەبچكۆلەكانم بەخۆمەوە ئەگوشی و بەیانیان ئەبوو دایكم بەزۆر لەچنگمی دەربهێنێ.

رۆژێكیان دایكم بەیەكێك لەخوشكەكانمی وت:

(دڵنیابە كە ئەم مناڵە منی زۆر خۆشئەوێت و بەداخی منەوە سەرئەنێتەوە).

لەتەنیشت ژوورەكەی دایكمەوە، ژوورێكی تر هەبوو كەزۆرم حەز لەبۆنەكەی بوو، چونكە سێو و هەناری لێدائەنرا لەگەڵ راخەر و نوێنی تایبەت بەمیوانەكان.

مامەكانم و پوورەكانم و(جاجۆ)- ئەو كچە بچووكە ئەرمەنییەی باوكم لەقەسابخانەكان رزگاری كرد- لەقاتی سێیەم ئەخەوتن، خزمەتكارەكانیش لەژوورێكی دیوەخانەكەدا ئەخەوتن.

زستانان كەسەرما زۆری ئەهێنا، گەرمای زۆپادارەكان كە لەهەموو ژوورەكانی ماڵەكەدابوون، بەشی گەرمكردنەوەی نەئەكردین، ئەچووین لەناومێزی سەرتەنوورەكەدا خۆمان گرمۆڵە ئەكرد. من خۆم حەزم لەگەرما پرۆكێنەرەكەی ئەبوو، و زستانم زیاتر پێ خۆشبوو كەتەنیا خواخۆی ئەزانێ چەند سەخت بوو.

سەرەرای قەبەیی بارستایی بەفرەكە كە زۆرجار ئەگەیشتە ٣ یان ٤ مەتر، ئێمەش نەمانئەزانی تەختەی خلیسكێنە چییە، بەڵام هەمیشە رێیەكمان بۆ خلیسكێنە ئەدۆزیەوە بەدانانی پلێتێكی گەورەی مس و دانیشتن لەسەری، و حەزیشم لەوەبوو بەبەفرماڵ سەكۆكان بماڵم.

هەرچەندە زستان خۆشترین وەرزی من بوو، بەڵام بەشادمانییەوە پێشوازیم لەنەورۆز ئەكرد. هەموو خەڵكی شار بەگەورە و بچووك و پیر و نەخۆشەكانیشەوە شارمان جێئەهێشت و لەباوەشی سروشتدا بەشداریی ئاهەنگی جەژنی سەری ساڵمان ئەكرد.

لەوانەبوو زستان تادوای ١٥ی ئازاریش درێژە بكێشێت، بەڵام لە٢١ی ئازاردا بێگومان باران خۆشئەكاتەوە و هەتاو هەڵدێت و بەفر دەستئەكات بەتوانەوە.

دوای زستانێکی بێبڕانەوە، نەورۆز هەڵیکبوو بۆ ئێمە، تابچینە دێهات و سواری کەر و ئەسپ ببین کەبەزستان لێمان دووربوون، بەڵام تەنیا لەمانگی حوزەیراندا شارمان بەجێئەهێشت و ئەچووینەوە بۆ سەر موڵەکەکانمان لەلادێ.

دابڕانەکە چەندین رۆژی ئەخایاند و ئەو ولاخە بەستەزمانانە ئەزموونێکی سەختیان تێئەپەڕاند، لەو کاتانەدا سەگەکانمان کەلای جوتیارەکان بوون ئەهاتنەوە بۆلامان و تادەورویەری ناوەڕاستی تشرینی یەکەم لەگەڵمان ئەبوون.

باوکم ئەیوت:(بەگەلەسەگێکی پۆلیسییان ناگۆڕمەوە). باسی سەگەکانی خۆمانی ئەکرد کە سەگی کوردیی دڕ و نەترس بوون.

هەر ئەڵێیت ئێستایە،(کۆرکین)،یەکێك لەسەگەکانمان دێتەوە بەرچاوم، ئەوپاسەوانە چاکەی شەوانە حەوت جار بەدەوری زەوییەکانماندا ئەسوڕایەوە تا بەدنیازان بترسێنێت. ناوبانگی بەشێوەیەك بڵاوبووبووەوە کەهیچ بێگانەیەك نەوێرێ لەزەوییەکانمان نزیکبێتەوە، و حەزیشی لەوەبوو کە بەچیاکاندا بسووڕێتەوە. رۆژێکیان گەلە بەرازێکی کێوی پەلاماریانداو پارچەپارچەیان کرد.

سەگێکی ترمان هەبوو ناوی(پۆڵات)بوو، ئەمیشیان هەر پاسەوانێکی چاکبوو، بەڵام وردە وردە بەرەڵابوو، بەکۆڵانەکانی مادندا ئەسووڕایەوە لەجیاتی ئەوەی پاسەوانی کێڵگەکانمان بکات و نیوەشەوان ئەهاتەوە بۆماڵەوە. بەڵام رۆژێکیان لەنیوەڕۆدا گەڕایەوە و سەری، کەشۆڕبووبۆوە، تۆزێك لەخۆڵەکە خشاند و کەوتەسەر زەوی.

پوورم سەیری ئەو لیکە سەوزەی کرد کە لەدەمییەوە دێتە خوارەوە،وتی:(کەسێك ژەهرخواردی کردووە).

پۆڵات مرد و زۆر بۆی گریاین هەروەك بۆ کۆرکین گریاین. لەبەرئەوەی لاشەکەی زۆر زل بوو قاچمان جووتکرد تا بتوانین چەند سەدمەترێك دووریخەینەوە و لەنزیك رووبارەکە ناشتمان.

هەروەها (کۆراە) کە سەگێکی دڕبوو ئەویشم دێتەوە یاد، ڕۆرژێکیان پشیلەیەکی کێوی بینی و بڕیاریدا ئەشکەنجەی بدات، بۆ ماوەی ١٠ ڕۆژ لەم دار بۆ ئەودار بەدوایەوەبوو تائێوارەی ڕۆژێکیان پشیلەکە بەشەکەتی لەدارەکە هاتەخوارەوە و(کۆراە) پەلاماری دا و پارچەپارچەی کرد.

لەناو پشیلەکانیشماندا- پشیلەی بەناوبانگی (وان) کە کلکیان درێژە- پشیلەیەکمان هەبوو بەناوی (ئەنگۆرا) کەپاسەوانێکی زۆر باش بوو، و لەگەڵ دراوسێکاندا تا بەردەرگاکانیان ئەڕۆیشت و لەوسەرەوە چالاکانە ئەگەڕایەوە بۆ ماڵ. بەڵام بەخت یاری نەبوو، پاش نیوەڕۆی ڕۆژێکی هاوین لەبێستانەکە گەڕایەوە و زەردەمارێکی بەدەمەوەبوو، هاوارمان لێکرد: بەریدە ئەتکوژێت. بەڵام گوێی لێنەگرتین، یا لێمان تێنەگەیشت، مارەکەی قووتدا و چوو بۆ ئەوەی شیربدات بەبەچکەکانی، دوای چەندسەعاتێك مرد و بەچکەکانیشی بەدوایدا مردن.

ژیانی لادێ تەنیا هەر ڕووداوی خەمهێنەری نەبوو، گەشت و گەڕان لەچیاکان و ڕاوەسوێسکە و مەلەکردن لەگۆمەکاندا، بۆ من واتای ئازادیی بوو.

چاکەی ئەم بەهەشتە زەمینییەمان ئەگەڕایەوە بۆ باپیرانمان. پێش زیاتر لەسەدەیەك باپیرەی باپیرم، کوڕی سەرۆکی خێڵی(شادیان)، بانگکرا بۆئەوەی ببێتە لێپرسراوی مادن و ئازناوی (ئەفەندی) وەرگرت، کەتەنها ئەدرایە میر و زاناکان، و بووە فەرمانڕەوای شارەکە. کاتی گەیشتنی، شارەکەی لەبارێکی خراپی وێرانەیی و پشتگوێخراودا بینی، ئەم شارە کەلەسەردەمی کۆن و سەردەمی ئیمپراتۆرییەکانی ئاشووریی، ماد، حەیسی، فارسی و سەلجوقی دا زۆر ئاوەدانبوو، هیچی لێ نەمابۆوە جگە لەشارۆچکەیەکی ٣٠٠٠ کەسیی. گەورەترین کێشەش خستنەوەگەڕی ئەو کارگە و کانە مسانەبوو کەچەندین سەدەبوو بەرنەهێنرابوون.

باپیرە گەورەمان لەناوچەکانی دەوروبەری مادن و شارە دوورەکانی تری کوردستان بەدوای پسپۆڕ و کرێکاردا ئەگەڕا، بەڵام بێسوودبوو، چونکە پەلامارەکانی مەغۆل و تورکمان و بەرگریی سەرسەختانەی میرنشینەکانی کورد دژ بەدەستێوەردانی بێزەنتییەکان و دواتریش دژ بەدەستێوەردانی عوسمانییەکان، بەدوای خۆیدا ئەو هەموو وێرانییەی هێنابوو، کەوڵاتی لەدانیشتوانەکەی چۆڵ کردبوو، و بووبووە هۆی دارِمانی کوردستان لەهەموو بوارێکدا.

باپیرەم ئەوکاتە هەواڵی پێگەیشت کەخێزانە یۆنانییە دەوڵەمەندەکانی کۆچکردوو بۆکۆلۆنی (مستعمرە)ی (سینۆب)کەئێستا لە(تراپزۆن) نیشتەجێن، ئامادەن کۆچبکەن بۆ مادن و لەوێ نیشتەجێ ببن و کانە دەوڵەمەندەکانی وەبەربێنن. باپیرەم بەپەلە خۆی گەیاندە ئەوێ و بەیارمەتی دەسەڵاتدارانی تورك كاری گواستنەوە و نیشتەجێکردنی ٥٠٠ خێزانی یۆنانی لەمادن رێکخست. لەناو کۆچکردووەکاندا جگە لەپسپۆڕانی مس، تەلارساز و وەستا و ئەندازیاری رێگەوبان و پرد، و بەرگدروو و پێڵاو دروویان تیابوو. ئەمانە خانووی پتەویان لەبەرد بۆخۆیان دروست کرد لەقاتێکەوە تا سێ قات بەشێوازی فارسی و مادن، کە سەکۆ و کەنارێکی لەمەرمەڕی سەوز بۆ دروستکرابوو. هەروەها ئیبراهیم ئەفەندی سوودی لەزانیاریی و بەهرەی کرێکارانی کورد وەرگرت کە پۆل پۆل لەگوندەکانی دەوروبەرەوە ئەهاتن، زانیاریی وەرگرت بۆ دروستکردنی تەلاری گشتیی و خوێندنگە و رێگەو پردەکان.

لەو ساڵەدا - ١٧٩٢- مس لەلایەن کارگەی تایبەتەوە دەرئەهێنرا و ئەتوێنرایەوە و ئەفرۆشرا، بەرامبەر دانی باج بەدەوڵەت، لەماوەی چەندساڵێکدا شاری مادن هەزاران تەن مسی پاکی فرۆشت، و شارەکە گەورەبوو تادانیشتوانی گەیشتە نزیکەی ٤٠٠٠٠ کەس کەئاستێکی بەرزی ژیانی ئابووریی و کەلتووریان هەبوو. شاعیر و بیریار و مۆسیقارو بەرگدروو لەشارەکەدا پەیدابوون و بووە جێی سەرنجی گەشتیاران و هاتووچۆکەران.

پاکوخـاوێنیی گـەرماوە تورکییـەکان و بـاخ و بێـستانەکانی کـە شـاخەکانی دەوروبـەری داپۆشیبوو، لەکاتێکدا پێشتر تەنیا شـاخی رووتـەن بـوون، بـووە مایـەی سەرنجڕاکێـشانی هەمووان.

ئەم سەرکەوتنە گەورەیەی باپیرەم بووە هۆی ئەوەی هەنـدێك کـەس بـەغیلی پێبـەرن و بەپەلـە (بابلعـالی) ئاگاداربکەنـەوە. سـاڵی ۱۸۳۰ ئیـبراهیم ئەفەنـدی بـانگکرا بـۆ ئەستەمبول، بەڵام باپیرەم بەپشتبەستن بەجەماوەرێتیی خۆی ئەو داوایەی رەتکـردەوە، بۆیـە کاربەدەستان هەڵمەتێکیان کردەسـەری و موڵـك و ماڵیـان دەستبەسـەرکرد و هەڕەشـەیان لەخێزانەکەی کرد و بەسوپایەکی ۱۰۰۰۰ کەسی و تۆپخانەوە دەوری مادنیان گرت.

سەرەنجام باپیرەم مادنی بەجێهێشت بۆئەوەی بیپارێزێت لەوێرانکردنی ئـەوەی بەدەسـتی خۆی بنیاتینابوو. توانی خۆی لـەهێزەکانی تورکیـا لادات و لەبـەرگی دەروێـشێکدا خـۆی حەشارداو گەیشتە یەمەن و لەفرمانەکەی سوڵتان رزگاری بوو، لەوێ بەتـەنیایی و نـامۆیی سەری نایەوە.

بەڵام شوێنەوارەکەی بێ سەرپەرشـت بەجێنەهێـشت، دوای دوومـانگ لەکۆچـکردنی، هاوسەرەکەی کەلەمادن مابۆوە کوڕێکی بـوو و ناوینـا مـستەفا، کـەلای بـاپیری (بـاوکی دایکی) پەروەردەکرا و دواتـر بـەڕێوەبردنی ئەوکارانـەی پێـسپارد کـە ئیـبراهیم ئەفەنـدی دەستی پێکردبوو، و ئەرکەکەی ئازایانە و زیرەکانـە راپەڕانـد و دەوڵەمەنـدبوو، وردە وردە هەموو موڵك و ماڵەکانی باوکی کڕییەوە. بەهۆی زیرەکییەکەیەوە بوو بەکەسێکی مەیلـەو نەفسانەیی. یەکێك لەداهێنانەکانی، دۆزینەوەی شێوازێکی تازەبوو بـۆ تواندنـەوەی مـس، نەگێڕنەوە جەستەی لەپەیکـەرێکی زەبـەلاح ئەچـوو و تەربووشـەکەی جێگـەی دووسـەری تیانەبووەوە. بەڵام باپیرەم- ئیبراهیمی کوڕی مستەفا-بوو بەفەرمانڕەوای مـادن. پیـاوێکی شیکپۆش بـوو، و تـەنیا ئـەوکراس و بۆینباخانـەی ئەپۆشـی کـە لەپاریـسەوە ئـەیهێنان، هەروەها پەروەردەکارێکی تایبەتیشی بۆ باوکم هێنا.

بـەهرەی ئـەو تـەنیا لـەبواری بەڕێوەبردنـدا نـەبوو، بـەڵکو لەبـەکارهێنانی چەکیـشدا سەرکەوتووبوو و لەیارییەکانی ئەسپسواریشدا ناوبانگی دەرکردبوو و تـوانی کارێـك بکـات تیرەوخێڵەکانی کورد و یۆنان و ئەرمەن و تورك پێکەوە بەئاشتیی و خۆشـگوزەرانیی بـژین. لەسەرەتای جەنگی جیهانیی یەکەمەوە (جۆن تـورك)ی هاوپـەیمانی ئەڵمانیا ... سیاسـەتی تێکدانی یەکگرتوویی تایەفەکانی مادنی گرتەبەر. لەبەرەبەری جـەنگی جیهـانی یەکەمـدا ڕێکخراوەکانی ئەرمەن بڕیاریاندا پشتیوانی ڕوسیا بکەن بۆبردنەوەی جەنگەکە. ئـەم بڕیـارە مەترسـیی ئەڵمانییـەکانی وروژانـد و بەپـشتیوانیی(جـۆن تـورك)، پیلانێکیـان دانـا بـۆ قەڵاچۆکردنی ئەرمەنەکانی نیشتەجێی ناو چوارچێوەی ئیمپراتـۆریی عوسمـانی. ئـەو پلانـە لەساڵی ١٩١٥ تا ١٩١٨ جێبەجێ کراو کاربەدەستان لەئەستەمبوڵ شـێوازی شـەیتانییان ئەدۆزییـەوە بەمەبەسـتی قەڵاچـۆکردنی تـەواوی میللـەتێك، و هەرکەسـێکی عوسمـانیی هەربێزارییەکی بەرامبەر بەم سیاسەتە دەربڕیایە بـەخۆفرۆش دائـەنرا و ڕووبـەڕووی سـزای لەسێدارەدان ئەبووەوە. سەرەڕای ئـەو مەترسـییانەش زۆر لـەکوردەکان سـامانی خۆیـان و تەنانـەت گیـانی خۆیـان بـەختکرد لـەپێناو ڕزگـارکردنی ئەرمەنـەکانی وڵاتەکـەیان و ناوچەکەیان و ئەوانەی لەناو خێڵەکانیاندابوون.

دانیشتوانی مـادنیش ئەرمەنـەکانی شـارەکەیان پاراسـت لەقەسـابخانەکانی سـەرباز و ژەندرمە و تاوانبارەکانی مافی گشتیی کەلێپرسراوانی تـورك بـۆ ئـەو مەبەسـتە لەزینـدان بـەرەڵایان کردبـوون. سـاڵی ١٩١٩ کوردەکـان یارمـەتی ئەرمەنەکانیانـدا بـۆ پەنابردنـە بەرسوریا و لەوساڵەدا باوکم کچێکی بچکۆلەی هەتیوی ئەرمەنی گرتەخۆ بـەناوی (جـاجۆ) کە ناوی خۆی (ماجدە)بوو و دوای ڕۆیشتنی ئەرمەنـەکان لـەمادن گەڕەکەکـەیان بوویـەوە خەرابەیەك، بـەڵام تایەفـەی یۆنـانی تارێکەوتننامـەی لـۆزان مانـەوە کەتیایـدا بڕیـاردرا دانیـشتوانەکان لـەنێوان تورکیـای کـەمالی و هەریـەك لـەیۆنان و بولگاریـا و ڕۆمانیـا و یۆگۆسـلاڤیادا بگۆڕدرێنەوە، و یۆنانییەکانی مادن ناچاربوون خانووە خۆشەکان و موڵکـەکان

و بێستانە جوانەکانیان کە وەك هاوڕێ کوردەکانیان لەدەوروبەری مادن هەیانبوو، بەجێبهێڵن.

بەشێکیان ڕۆیشتن بۆ یۆنان و هەندێکیتریان بەرەو ئەمێریکا و شوێنەکانی تر. و(کۆسما)ی مەیتەریشمان ناچارکرا بڕوات.

هەموو خێزانەکەمان و بەتایبەتی منداڵەکان خۆشمان ئەویست و سەرسامی سوارچاکییەکەی بووین و هەواڵی دوورخستنەوەی وەك هەموو یۆنانییەکانی تری مادن، هەموومانی تووشی شۆك کرد، خۆشی لەئێمە زیاترسەراسیمە بوو، چونکە کەمترین نارەزووشی نەبوو بۆ ئەوەی بچێت بۆ نیشتمانێك کە هەرگیز نەیدیبوو.

-(کۆسما، لەگەڵ ئێمە بێنەرەوە، بڕۆخۆت لەچیاکان بشارەوە و کاتێك لەبیریان چوویتەوە ناسنامەیەکی تازەت بۆ دەرئەکەین، کۆسما بەجێمان مەهێڵە).

لەکاتی کۆچکردنی یۆنانییەکاندا کۆسما لەبەرگی جوتیارێکی کورددا ڕۆیشت و لەنێو درەختەکانی بەشی سەرەوەی ئەو بێستانەدا خۆی شاردەوە کەهاوینەهەواری ئێمەبوو، بەڵام زۆری نەخایاند ژەندرمەکان دۆزیانەوە و ناچاریان کرد بچێتە پاڵ کاروانی یۆنانییەکان.

بەدەم گریانەوە لەژەندرمەکان پاڕاینەوە کەواز لەکۆسما بهێنن، هاوارمان ئەکرد:(ئەمانەوێت لەگەڵ ئێمە بێنێتەوە، بۆ ناچاری ئەکەن کۆچ بکات؟ وازی لێبهێنن).

بەڵام کەس گوێی لەپاڕانەوەی ئێمە نەگرت و کۆسما ناچارکرا بەبێ ویستی خۆی و لەکاتێکدا فرمێسك لەچاوی ئەباری بچێتە ریزی کاروانەکەوە، و دوای ئەوە هیچ شتێکمان لەبارەیەوە نەبیستەوە. لەو ڕۆژەوە ماڵەکەمان شەوق و زەوقی جارانی نەما.

لەوەرزی بەهاردا سەرتاسەری مادن دڵفڕێن و جوان بوو. سێ پارچە زەویمان لەباپیری باپیرمانەوە بۆ مابۆوە، دوانیان لەیەکێ لەکەنارەکانی دیجلەدابوون و شۆڕئەبوونەوە تا سەر ڕێڕەوی ڕووبارەکە، زۆریش لەیەکەوە دوورنەبوون، نزیکەکەیان لەشارەوە کەکەوتبووە کەناری ڕاستی ڕووبارەکەوە ناوی باخی (ئاش)بوو، چونکە باپیرمان ئاشێکی ئاوی تیادروستکردبوو.

باخی ئاش لەچاو ئەوناوچەشاخاوییەدا رووبەرەکەی زۆر گەورە بوو، چەندکیلۆمەترێك درێژ و زیاتر لە۲۰۰م پان. جۆگەیەك ئەیکرد بەدووبەشەوە و میوەکانی ئاو ئەدا، و خۆڵەکەشی زۆرگونجاو بوو بۆ هەموو جۆرەکانی کشتوکاڵ لەپاقلەمەنی و درەختی بەردارو درەختی جوانکاریی و درەختی بیناسازیی بەتایبەت سپی چنار کە لەکوردستاندا سەرچاوەیەکی بەپیتی داهاتە بۆ جووتیارەکان و خاوەن موڵك و بازرگانەکان.

دێتەوە یادم، لەهاویندا دارەکان ئەبڕدران و توێکڵەکانیان لێئەکرایەوە و لەبەهاری داهاتوودا کاتێك رووبارەکە هەڵئەسا، بەدیجلەدا رائەماڵران بەرەو بەغدا. لەمانگەکانی ئایار و حوزەیراندا ئاوی قوڕاویی رووبارەکە بەتوێکڵی دارچنار دائەپۆشرا، و هەندێك کات بەتایبەت لەپێچە تەسکەکانی ڕێڕەوی ڕووبارەکەدا، توێکڵی دارەکان بەکەنارە بەردینەکانەوە ئەمانەوە و ئاوێکی زۆریان کۆئەکردەوە، لەو کاتەدا یەکێك لەکرێکارانی پسپۆڕی ئەم گواستنەوەیە خۆی هەڵئەدایەسەر لق و پۆپەکان و بەدارێکی درێژ سەوڵی لێئەدا بۆ رزگارکردنی لق و پۆپەکان و لەکاتی کارەکەشیدا قیژەی بەرزی ئەکرد، ئەگەر مرۆڤ بۆ یەکەمجار بوایە گوێی لێبێت لەترسا زراوی ئەچوو، دیمەنێکی زۆر دڵڕفێن بوو، چەندین سەعات لەتۆفانی ئەو لق و پۆپانە وردئەبووینەوە کە ئەبوونە نێچیری لافاوەکە.

لەبنەڕەتدا باخی ئاش بۆ ماوەی پێنج ساڵ بەکرێ درابوو بەپیاوێك کەئاشەوانی ئەکرد و هاوکات باخەوانیش بوو.

ئاشەوانەکە پیاوێکی کورتەباڵای قەڵەوی ریشن بوو، ئارد سەروقژ و شانی داپۆشیبوو، هەمیشە سەرقاڵبوو، من جارجارە سێ کوڕەکەیم ئەبینی کە سێ کەسی بەخۆبوون، لەرێگەی چوون بۆ خوێندن یاچنینەوەی میوە یافرۆشتنی لەبازارەکەی مادن.

لەهەمووشت زیاتر باخی ئاشی تووەسپییەکەی بەناوبانگبوو.

سەبارەت بەماڵەکەی ترمان کەکەوتبووە قەراغی دیجلە و نزیکبوو لەبەرزاییەکانی رووبارەکە، ناسرابوو بەباخی ئاوپرژێنەکان. لەراستیدا ئەو شاخانەی سەرچاوەکانیان

لێئەهاتە خولرەوە بۆ ئاوەدانی باخەکە، زۆر لێژبوون، بەشێوەیەك باپیرم توانیبووی دابەشیکات بەسەر نزیکەی ١٠ئاوپرژێندا کە هەریەکەیان بۆ زیاتر لەمەترێك ئاوەکەی بەرزئەکردەوە.

ئەو ئاوپرژێنانە مەلەوانگەیەکی مەرمەڕینی گەورەیان رازاندبۆوە کە زۆر دڵرفێن بوو، و بووبووە مایەی سەرنج و هەوای دەوروبەرەکەشی فێنك ئەکردەوە.

لەبەرئەوەی رێگەی سەرەکی مادن بەسەرووی ئەم بێستانەدا تێئەپەڕی و رێگەیەکی تەسك جادەکەی ئەگەیاندە ئاوپرژێنەکان، هاوینان زۆربەی ئەو رێبوارانەی بەو شوێنەدا تێئەپەڕین، بەپێ یا بەسواریی یا بەگالیسکە، ئەو رێگەیەیان ئەگرتەبەر بۆ لای ئاوپرژێنەکان تا تینوێتیان بشکێنن و لەسایەی درەختەکانی دەوروبەریدا بحەوێنەوە.

ئەم باخە بەدرەختی هەنجیر بەناوبانگ بوو کە لەدوو ریزدا و بەدرێژایی ٢٠٠ مەتر چێنرابوون، بەتایبەت هەنجیری رەش کە تامێکی زۆرخۆشی هەبوو. دیارە ئەم باخەش هەردرابوو بەکرێ، بەڵام بەهەندێك مەرجی زۆر تایبەت. سەرەڕای کرێی ساڵانەی دیاریکراو، ئەبوو کرێچییەکە بڕێکی دیاریکراو میوەمان بۆ بهێنێت بەتایبەت لەو رۆژانەدا کە ژمارەیەکی زۆر میوانمان هەبوو، جگە لەوەش ئێمەی منداڵان ئەمانتوانی بەئازادی بچینە باخەکەوە و چەندی بمانەوێت میوە لێبکەینەوە، بەڵام لەباخی ئاشی ئەم مۆڵەتەمان نەبوو.

سێهەم باخ، کە هاوینەهەواری خێزانەکەمان بوو، ئەکەوتە باکووری خۆرهەڵاتی باخی ئاوپرژێنەکانەوە بەدووری نزیکەی ٣٠٠ مەتر، وئەیڕوانییە سەر رێگەی سەرەکی مادن و ئەو باخچانەی لەنێوان خۆی و دیجلەدابوو.

هاوینمان لەم باخەدا بەسەرئەبرد کەدوومەلەوانگەی گەورەی بەگوڵ و سەوزایی دەورەدراوی تیابوو، یەکێکیان نزیکبوو لەسەرچاوەیەکەوە کەکرابووە دووجۆگە بۆسەر حەوزەکان.

ئەم باخە ناوی بـاخی مەلەوانگـەی(گولـدار)بـوو، زەوییـەکـە لەهەنـدێك شـوێنیدا زۆر سەرەولێژبوو و کۆتاییەکەی پێکهاتبوو لـەریزێك بـەردی تیـژ، کەلەسـەرەوە بـۆ خـوارەوە سەیرت دەکرد لەپەیکەرێکی زەبەلاح ئەچوو.

درەختەکانی ئەم باخە لەچاو باخەکانی تردا تازە نێژراوبوون، جگە لـەدووداری گـەورەی سوورەچنار. ئەم باخە هەموو جۆرەکانی داری بەردار و دارەکانی تری تیـابوو کـەگونجاوبوون بۆکەشی ئەوناوچانەی زسـتانیان سـەختە. ئـەم دووسـوورە چـنارە گەورەیـە ماڵەکـەمان و مەلەوانگەکە و سەرجەمی گۆڕەپانەکەیان داپۆشیبوو.

لەهاویندا سەرەڕای کەشی گەرمی ناوچەکە، ئەکرا لەژێر ئـەم دوودارەدا بحـەوین، بـۆ ئـەم مەبەستە کەپرێکی تەختـە بـۆ منداڵـەکان دانرابـوو، بـەلاّم بـەرزبوو، ئـەبوو بەپەیـژە پیایـدا سەرکەوین، و پێنج جێگەی لەتەنیشت یەکدا لەسەر راخرابوو، و کاتێك لەمانگی ئەیلولدا باران ئەباری چادرێکی گەورە لەژێر کەپرەکەدا هەڵئەدرا. لەمناڵیدا هیچ شتێك بەلامـەوە هێنـدەی ئەوە خۆشنەبوو کە گوێم لەدەنگی دڵۆپەکانی باران ئەگرت کاتێك ئەکەوتنەسەر چادرەکە.

لەخوارەوە و بەدووری ١٠٠مەتر، دیوەخانەکەمان بوو کە ئەویش بەسەرشـاخەکەوەبوو، و سـەکۆیەکی گـەورەی هـەبوو. لەوێـدا بـاوکم پاشـنیوەڕۆکانی لەگـەڵ میوانـەکانی و ئەوکەسانەی لەدەوروبەرەوە ئەهاتن بەسـەرئەبرد. شـەوانیش جێگـەی میوانـەکان ئامـادە ئەکرا و هەندێك جاریش هەر لەسەر زەوییەکە جێگـەکان رائـەخرا. هەنـدێك لەمیوانـەکان بەیانیان زوو بێدارئەبوونەوە و ئەچـوونە ژوورەوە بـۆ دۆزینـەوەی پەنایـەك دوور لەتیـشکی خۆر، چونکە درەختەکانی دەوروبەری میوانخانەکە هێندە بەرزنەبوون کە سێبەر بۆ سـەکۆکە بکەن.

ولاّخی میوانەکان کەزۆربەیان ئەسپ بوون، دوای ئەوەی ئالیکیـان لەتێکەڵەیـەکی جـۆ وکا یاگیای وشك(پووش) ئەدرایە، لەنزیك دارتووەکـان ئەحەوانـەوە. کاتێـك میوانـەکانمان ولاّخەکانیان لەباخەکەدا بەجێئەهێشت و بەپێ ئەچوون بۆناو شـار، ئـەو رۆژە بـۆ مـن وەك

جمژن وابوو، چونکە کاتێك کەس لەبراو ئامۆزاکانم لەوناوە نەئەمان بانگی هاوڕێکانم ئەکرد لەباخەکانی دەوروبەر، و پێشنیازم بۆ ئەکردن کە بەناوی ئاودانی ولاخەکانەوە تەدیجلە پیاسە بەو ئەسپە جوان و چالاکانە بکەین کە ئەسپی پێشبڕکێ بوون.

لەوێش کەنارێکمان هەڵئەبژارد و دەستمان ئەکرد بەغاردانی شێتانە تاڕادەی شەکەتکردنی ئەسپەکان. بۆ ئەوەی خاوەنەکانیشیان گومان نەکەن، بەپەلە لەرووبارەکەدا ئەمانشتن و وشکمان ئەکردنەوە و شانەمان ئەکردن تاهیچ شوێنەوارێکی ئارەق بەلەشیانەوە نەمێنێ.

ئێمە حەزمان لەیاریکردن بوو لەگەڵ حوشترەکانیش، کەپاییزان لەگاورانەوە- دەشتێکی فراوانە لەنزیك دیاربەکر- بەرەو مادن ئەهاتن. لەوێ زیاتر لە ۱۰۰۰ هێکتار زەویمان هەبوو، هەمووساڵێك دوای دروێنە جووتیارەکانی هاوبەشمان سواری حوشترەکانیان ئەبوون و ئەهاتن بۆلامان بۆ فرۆشتنی بەشێك لەبەرهەمەکانیان لەمادن. دوای داگرتنی بارەکانیان، جووتیارەکان حوشترەکانیان ئەهێنا بۆ ماڵی ئێمە ولەسەر کادانەکانی تەویلەکە کەتایبەت بوو بەولاخی میوانەکان ئەیانبەستنەوە. سەرەتا ئەترساین لێیان نزیك بینەوە، پاشان وردە وردە ترسەکەمان شکا و بۆمان دەرکەوت کە ئارام و بێوەین.

لاسایی ئەو دەنگ و وشانەمان ئەکردەوە کە حوشتروانەکان ئاراستەی حوشترەکانیان ئەکرد، ئەمانتوانی دایاننیشێنین و کاتێك پخیان ئەکرد ئەچووینەسەر کۆپارەکانیان (سەنم) و هانمان ئەدان بووەستن، لەپڕ قاچی دواوەیان بەرزئەکردەوە و پێشنەوەی لەسەرقاچی پێشەوەیان بوەستن پاشوویان ئەلەرانەوە، بەرەوخوارییەکەی هێندە لێژبوو کە هەمووجارێك لەسەر پشتی حوشترەکان ئەخزاینە خوارەوە.

ئەم هەستە تێکەڵە لەترس و سەرکێشیی و شادیی، زۆرخۆشبوو، بەشێوەیەك کە چەندین جار دووبارەمان ئەکردەوە.

رۆژێکیان یەکێك لەحوشترەکان بەلەسەبووبوو، لـەناکاو ناوڕیدایـەوە  و ویـستی قـەپاڵ لەقۆڵم بگرێت، خۆشبەختانە تەنیا توانی پارچەیەك لـەقۆڵی کراسـەکەم بکاتـەوە و منـیش قایل بکات دەستبەرداری بم.

شتی تریش هەبوو کە سەرنجیان ڕادەکێشام، لەوانە (کیلەر)- جۆرێکە لەئەشکەوت کـە ئازووقە وپێویستییەکانمان تیا ئەمبارنەکرد بۆ زستانی سەخت،ئەوکاتەی لەدنیا دائـەبڕاین- چ شوێنێکی ئەفسانەیی بوو، تیایدا چەندین کوپە وکەندوو بەشێوەیەکی جوان ڕیزکرابـوون و بـەرەنگێکی سـەوزیی تـۆخ بۆیـە کرابـوون کـە هـەر لەبۆرسـلین ئەچـوون. ئـەم کوپانـە تەرخانکرابوون بۆ ڕاشی، دۆشاوی هەنگوین، خەیارشۆر، بیبەری سـوێرکراو، پـەنیری سـپی ناو سوێراو، بەڵام کەنـدووەکان تـەرخانکرابوون بـۆ بـستە و یـەتیس و خواردنـە بەلەزەتـە کوردییەکانی تر.

کوپەکان لەڕاستی دیوارەکەدا بەبـەرزی مـەترونیوێك لـەزەوی لەسـەر سـێپای تەختـە دانرابوون، و هەرکەسێك بیویستایە لێیان بخوات ئەبوو پەیژەیەکی بچووك بـەکاربهێنێت تـا ئەگاتە سێپاکە و سەرقاپە تەختەکە لاببات پێشئەوەی دەستبەرێت بۆ ناو کوپەکە. تا شـتی ناوکوپەکە کەمتر بوایەتەوە ئەبوو زیاتر دەستڕۆکاتە نـاو کوپەکـەوە. ئەمـە بـۆ گـەورەکان ئاسان بوو، بەڵام بۆ منداڵ سەخت بوو.

یەکێك لەڕۆژەکانی زستان سەیرم کـرد دەرگـەی کیلەرەکـە کراوەیـە، بۆیـە بەدزییـەوە خۆمکرد بەژووردا و پەیژەیەکی بچووکم لەبەردەم ئەو کوپەیەدا دانا کـە خۆشـترین خـواردن بەلای منـەوە (بـستیلی-ملـبن)،ی تیـابوو، دەستێکم درێـژکرد بۆنـاو کوپەکـە، پاشـان دەستەکەی تریشم بردە ناوەوە، لەپڕ هاوسەنگیم تێکـچوو و بەسـەردا کەوتمەناوکوپەکـەوە. خەریکبوو بخنکێم:

(فریامکەون ، فریامکەون)

وردە وردە زیاتر هەناسە تەنگبووم و گوشارکەوتە سەرملم، تۆ بڵێی لەکوپەکـەدا بمـرم و کەس نەیەت بەهانامەوە؟ سەرئەنجام تەکانێکم دایە خۆم و بەدەنگێکی بەرز هاوارم کرد:

(جاجو، جاجو)

دواهاوارم بەسەختیی تەواوکرد، کاتێك هەستم کرد قاچم رائەکێشرێت. جاجو گوێی لەدەنگێك بووبوو کە لەولاوە دێت و لەدڵی خۆیدا وتبووی:

-لەوانەیە کەسێك لەناو بەفرەکەدا ون بووبێت.

هاتبووە دەرەوە بزانێت چییە. چەند سەری سوڕمابوو کە هەردووقاچی منی دیبوو لەکوپەکە هاتوونەتەدەرەوە و خەریکە ئەخنکێم. بەپەلە بردمییە دەرەوە بۆ ئەوەی هەوای باخچەکە هەڵبمژم، و دوای ئەوە بەرامبەر کیلەرەکە زۆر بۆم گریا.

چێشتخانەکەمان جوان و رێکوپێك بوو، هەموو دیوارەکەی بەرەفەیەکی گەورە لەشێوەی کتێبخانەدا داپۆشرابوو کە کیسە ئاردەکانی تیاهەڵئەگیرا.

کاتێك گەرمای تیشکدەری ناو مەقەڵییەکان و زۆپاکە بەشی گەرمکردنەوەی نەئەکردین، نانمان لەقاتی سەرەوە یا ژووری ناخواردن یا هۆڵەکەدا ئەخوارد، ئەگەر ژمارەمان زۆر نەبوایە. زۆرجار کاتێك خۆمان ئامادەئەکرد بۆ نانخواردن لەپڕ قاپە چێشتە بەلەزەتەکان لەبەردەممان هەڵئەگیرا:

(میوانمان هات)

ئەوکاتە ئەبوو لەگۆشت و چێشتە بەلەزەتەکان دوورکەوینەوە و بەخواردنێکی کەم رازی بین.

من حەزم لەگۆشت نەبوو. لەرووداوی گیسکەکەوە من تەنیا میوە و سەوزەم ئەخوارد. ئەو رووداوەش ئەوەبوو: رۆژێکیان میوانێکی گرنگمان هات کەحەوت پیاوی لەتەکدابوو، و دایکم دوودڵبوو، نەیئەزانی چ خواردنێکیان پێشکەش بکات. ئازووقەمان کەمبوو. لەپڕ یەکێك لەماڵەکە ئەو گیسکەی بیرکەوتەوە کە باوکم پێشکەشی منی کردبوو، هەرچۆنێکبوو بەفێڵ و قسەی خۆش منیان لێدوورخستەوە.

(وەرە، وازی لێبێنە) جەمالی مەیتەر وای پێوتم، (وازی لێبێنە و لەگەڵ خۆم ئەتبەم بۆلای ئەسپەکە).

(سواری ئەسپ؟!) هەر هێندەی گوێم لەو وشەیەبوو بەهێمنی دوای جەمالی هاوڕێم کەوتم، و تا من گەڕامەوە گیسکەکەیان سەربڕیبوو و لێیاننابوو بۆ میوانەکان. قاچم کێشا بەزەوییدا و وڕکم گرت و قیژانم:

(نا، نا، چیتان لەگیسکەکەم کردووە؟ بۆ کوشتووتانە؟ گیسکەکەمم ئەوێتەوە)

بەداخەوە سەرەڕای گریان و فرمێسکەکانم هیچ نەگۆڕا، کاتێکیش گۆشتی گیسکە سەربڕاوەکەیان لەبەردەمم دانا زیاتر فرمێسکم ڕشت و هەستم بەتامێکی ناخۆش کرد. لەوکاتەوە تا تەمەنم گەیشتە ١٣ ساڵ تامی یەك پل گۆشتیشم نەکرد و لەجیاتی ئەوە بەپەرۆشەوە چاوەڕێی وەرزی سەوزە و میوەم ئەکرد. بەڵێ میوەو و سەوزە بەحاڵە حاڵ سکیان تێرنەکردم.

باخەکانمان بەهەشتێك بوون بۆ خۆیان، ئەو میوەیانەی لەو باخانەدا هەبوون لەناوچەکانی تری کوردستاندا دەگمەن بوون: ٣٢جۆر تری، تووی ڕەش و سپی، لیمۆی ترش و شیرین، چەندین جۆری گوێز و بوندق و هەنجیر و بستەی نەرم و بەلەزەت.کە هەر جۆرەیان تامی تایبەتیی خۆی هەبوو.

زۆرم حەز لەراکردن بوو بەدەوری هەردوو پەرەدارەکەدا و هەڵمژینی بۆنیان و چێژوەرگرتن لەمیوەکەیان. منداڵیم لەو بەهەشتەدا بەسەربرد. بەهەشتێکی راستەقینەبوو بەدرەخت و مێو و ڕێگە تەسکەکانی و جۆگە بچووکەکانییەوە، وئاژەڵەکانی کەپەنجا سەرمانگا و بزن و مەڕ و پشیلە و سەگ و ئێستر و کەر و ئەسپمان هەبوو. مەیتەرەکەمان سەرەڕای کارەکانی خۆی، ئەبوو سەرپەرشتیی کاری شوانەکانیش بکات، کە بەگشتیی لەناو کوڕەکانی خۆیدا هەڵیئەبژاردن و یارمەتی ئەدان لەچاودێریکردنی ماڵاتەکەدا.

من دەستبەتاڵ بووم بۆ چاودێریکردنی مەڕە جوان و گوێڕایەڵەکان. کاتێك تەمەنم بوو بە ٥ ساڵ، باوکم پێی وابوو، هێندە گەورەبووم کە بتوانم ئاگام لەگوێدرێژێێت، لەبەرئەوە جاشوولکەیەکی بچووکی خۆشەویستی پێشکەش کردم و ناوم نا(بۆزۆ)- ناوەکە لەرەنگە

سپییەکەیەوە سەرچاوەی گرتبوو- لەو ڕۆژەوە بـۆزۆ بـووە یەکـەمین شـتی جێـی بایـەخم. ڕێنادەم کەس جگە لەخۆم سواری بێت و، هەموو ئێوارەیەك پێشخەوتن بەسـەرمنەکردەوە و پێویستیی حەوانەوەی شەوم بۆ دابین ئەکرد و بەشی خۆی ئالف و ئاوم بۆ دائەنا. هەنـدێك جـار دژی ئـەوەبووم کەئێمـە بـرنج بخـۆین لەکاتێکـدا بـۆزۆ کـاوجۆ بخـوات، و هێنـدەم خۆشەویست کە جارجار قاپێکی پڕ برنجم ئەماشییەوە و دامئـەنا بـۆ بـۆزۆ. گـەر هەسـتم بکردایە دەنگی نووساوە یا زەڕین ئازاری ئەدات، دۆخی دەروونیشم تێك ئەچوو، و هێلکـەم ئەدزی و ئەمدایە بەدەڵەمەیی بیخوات، چونکە پێموابوو دەنگی بەوە وەك جـاران بـەهێز و زوڵاڵ ئەبێتـەوە. لەسـایەی ئامۆژگاریـیـەکانی هـاوڕێ مەیتەرەکەمـدا دەسـتم کـرد بەسواربوونی. بەیانیان زوو هەڵئەستام و خۆمئەکرد بەناو جێگەکـەی جەمالـدا. جەسـتەیم بیردێتەوە کە عارەقێکی زۆری ئەکردەوە، بەڵام زۆرم حەزئەکرد لەپەنایدا پاڵکەوم.

ئەم سوارچاکە سمێڵ زلەی بەشارەزایی و چـاو نەترسـییەوە ئەسپـسواری ئـەکرد بـەلای منەوە پاڵەوان بـوو. دایکـم لـەو پەیوەسـتییەی مـن بەجەمالـەوە رازی نـەبوو، بەتونـدی سـەرەکۆنەی ئەکردم و بەبۆڵە بۆڵەوە ئەیوت: (ئاوا ئەبیت بەمەیتەر، ئەبیت بەکەر).

پیاسـەکانم لەسەر پشتی بۆزۆ بەردەوام بوو و هیچ گـوێم بەڕەخنـەکانی دایکـم نەئـەدا، چونکە کەرەکەم زۆر زۆر خۆشئەویست، تا تەمەنم بوو بە٩ ساڵ، ئەوکاتە ئەسپم دۆزیـیەوە. ئەمەش لەهاویندا بوو. لەگەڵ باوکمدا ئەچووین بۆ (بـەرحاز) کـە دەشـتێکی بـچووك بـوو لـەنێوان مـادن و ئەلعـەزیز لەبـەرزایی ١٢٥٠ مـەتردا، شـاخەکان دەورەیـان دابـوو، و دەریاچەیەکی سوێریشی تیابوو. باوکم سواری ئەسـپەکەی بـوو بـوو ومنـیش لەسەرپـشتی کەرەکەم بووم، کاتێك دابەزین بۆ ئەوەی لەژێر درەختەکانی گوندێکدا بحەوێنـەوە، پیاوێـك جوانوویـەکی سـێ سـاڵەی جـوانی پیـشانی باوکمـدا، دوای ئـەوەی لەهـەموو لایەکـەوە سەیریکرد لێی پرسم: (ئەتەوێت واز لەبۆزۆ بێنێت و لەجیاتی ئەو ئـەم جوانـووە ببـەیت بـۆ خۆت؟)

-(حەزئەکەم بۆزۆ هەر هی خۆم بێت، بەڵام پێموایە هێندەش گەورەبووم بتـوانم سـواری ئەو جوانووە ببم، پاشان حەزیشم لێیەتی)

-(باشە جڵەوەکەی بگرەو بیبە بۆ ماڵی مامت تا زینێك و پاڵوویەکت بدەنێ).

دووچـاوی شـینی خەنـدەداری خـاوێن وەك پـاکیی چـاوی منـداڵ، سـیمای مـامی گەشاندبووەوە، بەردەوام شمشێرە درێژەکەی پێبوو کەبەبەردی گرانبەها رازابـووەوە. تەمـەنی خۆی ئەدا لە ٦٥ ساڵ، بەڵام تین و تاوە سەیرەکەی و قسەخۆشەکانی هەروەك خـۆی مـابوو. پیاوێکی گەورەبوو، لەگوندی(کری سوور) ئەژیا و سەرەڕای کشتوکاڵ، مەڕی بەخێوئەکرد و چەند هەزار سەرێکی هەبوو. مەڕەکانی لـەگردە بـەرزە سـەوزەکانی بـاکووری خۆرهـەڵاتی کوردستان ئەلەوەڕێنران و زسـتانان ئەیانهێنانـەوە بـۆ گـەوڕەکانیان. هـەروەها نزیکـەی ٦ ئەسپی پێشبڕکێ و کۆمەڵێ سەگی رەسەنی کوردیی هەبوو، یەکێکیان سـەگێکی زەبـەلاح بوو کەهەر وەڕینەکەی بەس بوو بۆ ئەوەی ئەو گورگانەی ئەیانەوێت پەلاماری مێگەلەکانی بدەن بقوچێنن.

یەکێك لەسەگەکانی رقی لەژەندرمەبوو، هەرهێندەی ببیبینیایـە بەتفەنگـە ئەڵمانییـە درێژەکانی سەرشانیانەوە لەگوندەکە نزیك ئەبنـەوە یەکـسەر ئەکەوتـە مرەمـڕ. رۆژێکیـان یەکێك لەو ژەندرمانە بەبەردەم ماڵی مامدا تێپـەڕی، سـەگەکە پەلاماریـدا، سـەربازەکە ترس گرتبووی و تفەنگەکەی نابوویەشانییەوە، خـۆی ئامـادەکردبوو بـۆ تەقـەکردن، بـەڵام پێشئەوەی فریابکەوێت دەستبنێت بەپەلەپیتکەدا، سـەگەکە دابـووی بەزەویـدا. شـوانەکان بەپەلە ژەندرمە بریندارەکەیان لەکاتێکی گونجاودا لـەژێر چـنگی سـەگەکە دەرهێنـا، ئـەو ژەندرمەیە سکاڵای کردو مامیان لەگەڵ سەگەکەیدا بانگکرد بۆ بـەردەم دادگـە، سـزایەکی پارەیان بەسەر مامدا سەپاند، سەگەکەش کە لەسـزای کوشـتن رزگـاری بـوو، لـەو رۆژەوە خرایە ژێر چاودێرییەکی توندەوە.

لەو رۆژەی هاویندا مامم لەسێبەری کۆمەڵێك دارچناری کەناری یەکێك لەجۆگەکانی ئاودێریدا دانیشتبوو. کۆمەڵێك پیاو دەوریان دابوو کەهەندێکیان لەسەرخۆڵەکە دانیشتبوون و هەندێکیشیان بەپێوە. کە لێیان نزیکبوومەوە سەرێکی بەلای مندا بەرزکردەوە، پاشان بەسووکی سەیرێکی سەرتاپای جوانووەکەی کرد و پێیوتم: (ها پاشا، ئەم جوانووە جوانە هی تۆیە؟)

وەڵامم دایەوە: بەڵێ، ئێستا باوکم بۆی کڕیم.

-یوسف شتێکی باشی کردووە، لەوەئەچێ جۆرێکی باش بێت، بەلاَم تۆزێك تووڕەیی پێوەدیارە، لەبەرئەوە ئاگاداربە، ئەبێت کەسواری ئەبیت خۆت چاك بگریت ئەگینا بەنگێکت پێئەدات.

-بێخەمبە مامە ئاگام لەخۆمە.

یەکێك لەخزمەتکارەکان بەپەلە جوانووەکەی بۆ زین کردم، و دوای کەمێك خۆم گەیاندەوە باوکم.

بەناو کێڵگەکاندا کەوتینەرێ کەئەمگەیاندینە رێگە قیرتاوەکەی مادن، لەدەشتەکەدا پان بوو و کە لەرووبارەکە نزیك ئەبووەوە پێچاوپێچ و تەسك بوو. رێکەوتی کەسمان نەکرد هەندێك کەرسوار نەبێت، هەستم کرد رێگەکە چۆڵە، بۆیە ئەسپەکەم دایە غار و پێشی باوکمم دایەوە و زۆر شادمان بووم کە ئەتوانم کۆنترۆڵی بکەم.

ئەسپەکەم لەناوەڕاستی رێگەکەدا لێئەخوڕی و ئاگام لەدەوروبەری خۆم نەمابوو. لەپڕ گوێم لەدەنگی هۆڕنێکی تیژبوو لەپشتمەوە.

پێشئەوەی بتوانم ئاوڕ بدەمەوە بەرەو سەرچاوەی دەنگەکە، ئەسپەکە بەو دەنگە نامۆیە رەویەوە و لەپێشبڕکێیەکی شێتانەدا بەرەوپێشەوە کەوتە غاردان، کەمێك خۆمم لەسەر زینەکە بەرزکردەوە و گوشارم خستەسەر ناوقەدی ئەسپەکە و توند جڵەوەکەیم راکێشا. گوێم لێبوو باوکم بانگی ئەکرد:

-نورۆ، نورۆ، ئاگات لەخۆت بێت، وریابە.

سەرەڕای ئەوە نائومێدنەبووم، بەهەموو هێزی خۆم جڵەوەکەم راکێشا تاپچڕا، ئیتر دەستمگرت بەیاڵی جوانووەکەوە و توانیم بۆ ماوەی چەندکیلۆمەترێك خۆم بەسەر پشتییەوەبگرم تا گەیشتینە پێچێکی سەخت، قایشەکەی ژێر سکی پچڕاو من بەزینەکەوە پەڕیمە دۆڵێکەوە کە ١٠٠ مەتر لەرێگەکەوە دووربوو وکەوتمە ناوی دیجلەوە.

باوکم وایزانی مردووم، جارێکی تر بانگی کرد، پاشان ئەسپەکەی لای یەکێك لەجووتیارەکان بەجێهێشت و کابرای خاوەن ئۆتۆمبیلی لەگەڵ خۆی هێناو بەوردیی کەوتنە گەڕان، یەکەمجار جڵەوەکەیان دۆزیەوە، پاشان زینەکە، بەڵام هیچ شوێنەوارێکی جوانووەکە و سوارە بچووکەکەی دیارنەبوو. لەپڕ گوێیان لەنوزەنوزێك بوو لەلای رووبارەکەوە، من لەهۆشخۆم چووبووم.

کاتێك چاوم کردەوە لەنەخۆشخانەی مادن کەوتبووم. کاکم (نافیز) کە ئەوکاتە سەرۆکی شارەوانی و سەرۆکی پزیشکەکانی نەخۆشخانەی مادن بوو، چارەسەری کردم و ئۆکسجینی دامێ، منیش بەدەم وڕێنەوە ئەموت:

-کوا جوانووەکە؟

دوای چەند خولەکێك لەسەر تەختەیەکی دەستیی بردیانەوە بۆ ماڵی خۆمان لەمادن، پاشان بۆ باخەکەمان، و ئێوارە خەریکی راکردن و هەڵبەزودابەزبووم وەك ئەوەی هیچ رووی نەدابێ.

مناڵیم هەر تەنیا رابواردن و سەرگەرمی نەبوو.

دوای گەرمای تەموز لەناوەڕاستی مانگی ئابەوە باران بارین دەستیپێئەکرد، و لەئەیلوودا رەشەبای توند هەڵئەکرد، و بۆنی خۆشی تریێ رنین ئاماژەبوو بۆ کردنەوەی قوتابخانەکان. تەمەنم ٥ساڵ بوو کە باوکم ناردمی بۆ قوتابخانەیەکی تایبەت. لەسەر فەرش و هەندێکجاریش لەسەر زەوییەکە دائەنیشتین و نیوە بازنەیەکمان دروستئەکرد لەدەوری

میرزا،کە لەسەر سەکۆیەکی بەفەرش داپۆشراو دائەنیشت. ئێستاش وێنەی ئەو فەرشەم لەبەرچاوە بەنەخش و نیگار و وێنەی باڵدار نەخشێنرابوو،هەندێکجار سەیرکردنی نەخشەکان ئاگای لای وانەکانی میرزا نەئەهێشتین.

میرزا کە لەناوەڕاستەکانی تەمەنیدابوو، سیمایەکی کراوەی هەبوو، ریشێکی جوان دەوری دەموچاوی دابوو. باوکی منداڵەکان لەبەرامبەر فێرکردنماندا پاداشتیان ئەدایە، و سەرەڕای بەشداریکردن لەخەرجی گەرمکردنەوەی پۆلەکەدا، خۆشمان کۆڵەدارمان بۆ ئەبرد. میرزا پیاوێکی باشبوو و من زۆر ڕێز و خۆشەویستیم بۆی هەبوو، هەندێکجار کەیەکێك لەخوێندکارەکان دەنگە دەنگی ئەکرد، بەشولکە درێژەکەی دەستی هەڕەشەی لێئەکرد و بەهێواشی ئەیکێشا بەتەپڵی سەریدا -وەك جۆرێك لەلێبوردەیی زیاتر لەوەی توندوتیژی بێت- تەنانەت ئەگەر لەگەڵ هەندێك خوێندکاریشدا توند بوایە و لای کەسوکاریان شکاتیان لێبکردایە، وەڵامی ئاسایی باوکان ئەوەبوو:

-(دەستی خۆش بێت، جێگەی بەهەشت بێت).

باوکان، میرزایان بەپیاوێکی پیرۆز ئەزانی. ئەی ئەوکەسێکی زانا نەبوو؟ و پەیامەکەی ئەوەنەبوو کە ئەو زانست و زانیارییانەمان فێربکات؟ بەدانبەخۆداگرتنێکی کۆڵنەدەرانەوە ئەلف و بێی فێرئەکردین لەسەر شێوازی قوتابخانە کۆنەکان (قوتابخانەی قورئانی). پیتەکانمان بەکۆرس بەتۆنێکی دووبارە یا بەگۆرانی ئەوتەوە.

هاوپۆلەکانم پێکهاتبوون لەکورد و منالی فەرمانبەرە تورکەکان. ئەو رۆژانە شتێکی ئاسایی بوو کە مرۆڤ کوردبێت، خەڵك عوسمانیی بوون و جیاوازیی نەبوو لەنێوان عەرەب و کورد و تورکدا، ئێمە منداڵ بووین وبیرمان لەو جۆرە شتانە نەئەکردەوە و تەنیا یاریی و سەرگەرمیمان بەلاوە گرنگ بوو.

پایزی ئەوساڵە تەندروستی دایکم زۆر تێکچوو، چیمان لەدەستهات کردمان بۆ چارەسەرکردن و بایەخپێدانی، بەڵام ئەو ڕووداوە کارەساتبارانەی کوردستانیان بەگشتیی و

خێزانەکەی ئێمەیان بەتایبەتی هەژاند، جۆرێك نەبوون یارمەتی نەخۆش بدەن بۆ چاکبوونەوە.

هەموو ئەو رووداوە خراپانە دەرئەنجامی سیاسەتی مایکافیلیی مستەفا کەمال بوون.

بەپشتیوانیی یارمەتی فراوان و گەرموگوڕی کورد توانی بەسەر فەرەنسییەکان و یۆنانییەکان و ئیتاڵییەکاندا سەرکەوێت و ئینگلیز ناچاریکات لەگەڵی رێکبکەون. بەرامبەر ئەم پشتیوانییەی کورد، کەمال ئەتاتورك بەئاشکرا بەڵێنی ئۆتۆنۆمی تەواوی لەچوارچێوەی کۆماری تورکیادا بەکورد دا، بەڵام دوای ئەوەی رێککەوتننامەی لۆزان جێی رێککەوتننامەی سیڤری گرتەوە، هەڵوێستی بەرامبەر بەکورد گۆڕا و هەر خێرا ئەو راگەیاندنە ئاشکرایەی بیرچووەوە کەئەیوت: (تورکیا هی دوو گەلە: تورك و کورد) و هەڵوێستێکی دوژمنکارانەی ئاشکرای بەرامبەر ئەو کوردانە وەرگرت کەداوای ئۆتۆنۆمییان ئەکرد و هەموو ئەو کاسێتانەی کەگۆرانی و پیاهەڵدانی کارە سەربازییەکانی کورد و ئازایەتییان بوو لەکاتی جەنگی سەربەخۆییدا، دەستییان بەسەرداگیراو قەدەغەکران- ئەو کاسێتانەی کە پێشتر تەنانەت پەرلەمانی تورکیاش گوێی لێئەگرت- پەرلەمانە کۆنەکە هەڵوەشایەوە و لەپەرلەمانی تازەدا کەسانی تورك بەنوێنەرایەتی ناوچە کوردییەکان دانران، قوتابخانە کوردییەکان داخران و زۆر لەپەرلەمانتارە کۆنەکان گیران و درانە ئەنجومەنی عورفی و دەستی دەسەڵاتی ناوەندیی ئەنکەرە لەناوچە کوردییەکاندا توندتر و بەزەبرتربوو.

گەڕانەوە بۆبیرۆکە شۆفێنییەکانی(پان تۆران)ی(جون تورك)ی پێش جەنگی جیهانی یەکەم، ئاگادارکردنەوەیەك بوو بۆنیشتمانپەروەران و کەسایەتییە کاراکانی کورد، بەتایبەت ئەوانەی لەنزیکەوە هاوکاریی مستەفا کەمالیان کردبوو. سەرەنجام بۆ رێگرتن لەسیاسەتی جیاکاریی و چەوساندنەوە، رێکخراوێکی بەرگریی کوردی دامەزرا و خۆی لەگۆڕەپانەکەدا سەپاند.

خالید بەگی جەبری، یەکێك لەسەرۆك خێڵەکانی(جوبران)ی نیشتەجێی ناوچەکانی مووش، کە پیاوێکی ڕووناکبیر و پڕ جۆشی نەتەوەیی بوو، ئەو ئەرکەی خستە سەرشانی و چالاك و لەخۆبووردوو ئەنجامیدا. لەماوەیەکی کەمدا ڕۆشنبیران و فەرمانبەرانی لەخۆی کۆکردەوە، و توانی کەسانی دەستەبژێر و پیاوماقوڵان و کەسایەتییە ناودارەکانی ناوچەیەکی بەرفراوانی کوردستان کۆبکاتەوە. نوێنەرەکانی بەهەر چوارلای وڵاتدا کەوتنەگەڕ بەمەبەستی کۆکردنەوەی زۆرترین ژمارەی لایەنگر. ٢٦ی مارسی ١٩٢٥ دیاریکرا وەك ڕۆژی دەستپێکردنی ڕاپەڕینی چەکداریی، بەڵام ڕێکەوت دەستی وەردایە ڕووداوەکان، پێشئەوەی ئامادەکارییەکان بۆ شۆڕش تەواوبێت، زووتر و لە ٧ی شوباتدا بەرگریی دەستپێکرد، ئەویش لەئەنجامی پێکادانێك کە لێپرسراوانی ئەنکەرە لەنێوان مەفرەزەیەکی تورك و هەندێك لەپیاوانی شێخ سەعیدی پیراندا هەڵیانگیرساند.

شێخ وەك پیاوێکی ڕێزدار و باوەڕدار لەباکوور و باکووری خۆرهەڵاتی کوردستان ناسرابوو،وسوێندیشی خواردبوو هاوپەیمانی کۆلۆنیل خالید بەگ بێت.

شێخ سەعید کە یەکێك بوو لەسەرانی ڕێبازی نەقشەبەندی- ڕێبازێکی سۆفی ئیسلامییە- ڕێزێکی گەورەی هەبوو لای زۆربەی خەڵکی کورد بەهۆی زانایی و باوەڕدارییەکەیەوە. خۆی بەرەچەڵەك خەڵکی (باڵوو)بوو و لەئەرزڕۆم دائەنیشت، هەمووساڵێك سەردانی مەزاری باوباپیرانی ئەکرد لە(باڵوو).

کاتێك کە شێخ سەعید ئەرزرۆمی جێهێشت، کاروانەکەی و ژمارەی هاوڕێکانی لەڕێڕەوەکەدا زیادیان ئەکرد، و تا گەیشتە (باڵوو) بوون بەدەهەزار کەس. ئەوساڵە شێخ سەعید و پیاوەکانی لەپیران لایاندا کە شارۆچکەیەکە بەدووری ٥ کم لەدیاربەکر و ١٠ کم لەباڵوو. هەموو دانیشتوانی ناوچەکە بەخۆیان و دیارییەکانیانەوە هاتنە پێشوازی شێخ.

حکومەتی تورکیا زانیاریی لەبارەی ئامادەکارییەکانی کوردەوە هەبوو و ئەترسا لەجۆش و خرۆشی دانیشتوانەکە و پشتیوانیکردنی تەواویان لەشێخ سەعید. بەمەبەستی

ترساندن و دروستکردنی بیانوو، فەرماندەی ژەندرمەی تورك گەڕی ئەوەی پێگرتن کە هەندێك لەپیاوەکانی شێخ سەعید بەشێوەیەکی ئاشکرا هێرشیان کردووەتە سەر سیاسەتی حکومەت، و بەپەلە دەستگیریکردن و ویستی بیانخاتە زیندانی پیرانەوە، هەر هێندەی ئەو کەسانەیان لەکەمپەکەی شێخ هێنایەدەرەوە فەرمانـدەی ژەندرمەکان کەلەپچەی کردە دەستیان و فەرمانیدا بەژەندرمەکان دارکاریـیان بکەن.

کاتێك هەواڵەکە بەشێخ سەعید گەیشت، وای بەباشزانی دەستوەرنەداتە مەسەلەکەوە، بەڵام کامپەکە کە ئەم ڕووداوە وروژاندبووی، بەشێوەیەکی سەرکێشانە هەڵسوکەوتیان کرد، وهەنـدێك لەلایـەنگرانی شـێخ سـەعید دەسـتیاندایە چـەك و کەوتنـە دوای شـێخ (عەبدولڕەحیم)، برا گەنجەکەی شێخ سەعید، کەئەیویست نەیەڵێت دۆخەکە خراپتربێت، بۆیە دە پیاوی لەگەڵ خۆی برد و بەمەبەستی دانوستاندن چووەلای ئەفسەرە تورکەکە، بەڵام ئەفسەرەکە هەڕەشەی گرتنی ئەویشی کرد.

شێخی لاو وەڵامی دایەوە:

-ئەبێت هۆکاری ماقووڵ هەبێت بۆ گرتنی خەڵك.

ئەفسەرە تورکەکە بەلووتبەرزییەکەوە وەڵامی دایەوە:

-(ئەوە هۆکاری دەوڵەتە)و ئاماژەی دایە دووژەندرمە بۆ گرتنی شێخ.

پێشئەوەی دوو ژەندرمەکە فریای جوولەبکەون، پیاوەکانی شێخ عەبـدولڕەحیم دووانیـان لەژەندرمەکان کوشت و فەرماندەی مەفرەزەکە تێیقوچاند و ئەنکەرەی ئاگادارکردەوە کە:

-شۆڕشی کورد دەستی پێکرد.

لەگەڵ گەیـشتنی ئـەو هەواڵـە، مـستەفا کـەمال لەخـەڵوەتی رابـواردنی نـاو ژنـان و مەینۆشی هاتـەدەرەوە و وەزیرەکـانی کـۆکردەوە و داوای ڕێوشـوێنی تونـدی لێکـردن بـۆ نوقمکردنی (چەتەکانی کورد لەخوێندا)، بەڵام (فەتحی ئۆکیـار)ی سـەرەك وەزیـران ئـەوەی رەتکردەوە دەستبخاتە خوێنی گەلی کوردی دۆست و بێتاوانەوە.

بـۆ جێبـەجێکردنی سیاسـەتەکانی، مـستەفا کـەمال پێویـستی بەچـنگێکی تونـد و گیانێکی جەلادانە هەبوو، ئەم جۆرە کەسانەش لەدەوروبـەری ئـەتاتورک دەگـمـەن نـەبوون. لەراستیدا ژمارەیەکی زۆر لەسـڤیل و کەسـایەتییە سـەربازییەکان خـەونیان بـەوەوە ئـەدی پۆستێکی لێپرسراویی وەربگرن. لەناویاندا کەسـایەتییەك کەپێـشتر خـۆی سـەلماندبوو وەك ژەنراڵێـك و وەك دیپلۆمـاتێکیش، وچـەندین سـەرکەوتنی سـەربازیی و دیپلۆماتیـشی بەدەستهێنابوو.

(ئەنینۆ) کەخەڵکی مالاتیایە لەکوردستان، ونازناوەکەی لەئەنجامی سەرکەوتنی بەسـەر یۆنانییەکانـدا هـەڵگرتبوو. سـەرکەوتنێکی دیپلۆمـاتیی گەورەشـی ئـەوەبوو کـە تـوانی ڕێکەوتننامـەی سـیڤر بگۆڕێـت بەڕێکەوتننامـەی لـۆزان، ئەوڕێکەوتننامەیـەی هـەموو هیواکانی کوردی لەئۆتۆنۆمیدا تێکشکاند، لەپاداشتی ئەم کارەش لەسـاڵی (١٩٢٣)وە بـۆ (١٩٢٤) پۆسـتی سـەرەك وەزیرانـی پێـسپێردرا، دواتـر ئـەنینۆ لەئـەنجامی پەیوەندییـە خێزانییـەکانی و لەبەرئـەوەی ڕقـی لـەو شـەوبێدارییە سـووکانەبوو کـە دیکتـاتۆر خـوی پێوەگرتبوو، لەگۆڕەپانەکە کـشایەوە. زۆرشـت لـەبارەی ئـەنینۆوە وتـراوە، پێـشی ئـەوترا عیسمەتەکەر، چونکە لەبواری دیپلۆماتیدا کەڕبوو، لەبارەیەوە ئەیانوت: حەوت ڕێوی لـەناو سەریدا هاتووچۆئەکەن بێ ئەوەی هـەرگیز تووشـی یـەك بـن. ئەشـیانوت کەسـایەتییەکی چاوبرسی و قین لەدڵ بووە.

کاتێك سەرۆکی وەفدی تورکیابوو لەڕێکەوتننامەی لۆزاندا، عیسمەت ئەنینۆ بەئاشـکرا ڕایگەیاند:(تورکیا موڵکی هەردووگەلی تورك و کوردە، و ئەم دووگەلە لەم وڵاتـەدا هـەمان ماف و ئەرکیان هەیە).

لەراستیدا ئەم قسە شیرینکراوە، بەمەبەستی لەبیربردنەوەی ڕێکەوتننامەی سـیڤرو ئـەو بەڵێنە ئاشکرایانەبوو کەدرابوو، بۆ پێکهێنانی وڵاتی سەربەخۆی کوردستان.

مستەفا کەمال، عیسمەت ئەنینۆی لەلوتکەی حکومەتدا دانا بەمەبەستی سەرکوتکردنی کورد و کەوتە هەوڵ بۆ ترساندنی دانیشتووانە تورکەکان لەبزووتنەوەی کورد و داوای چەکهەڵگرتنی لێکردن و لەپەرلەمانیشدا قیژاندی:

-تورکیا لەمەترسیدایە، ئینگلیز پشتیوانی کوردەکان ئەکات و چەك و پارەیان ئەداتێ.

سەرەك وەزیرانەکەی راسپارد کاربکات بۆ ریشەکێشکردنی ئەو(گانگرینە)ی هەڕەشە لەجەستەی نەتەوەی تورك ئەکات، و فەرمانیدا بەوالی بەدلیس بۆ میوانداریکردنی کۆلۆنیل خالید بەگی جەبری بەبیانووی گفتوگۆ سەبارەت بەچارەنووسی کوردستان،پاشان هەر لەهۆڵی کۆشکەکەی خۆیدا گوللەبارانی بکات.

خالید بەگ باوەڕی بەڕەوایی ئەو مەسەلەیە هەبوو کە بەرگریی لێئەکات، بۆیە بڕوای بەشێوازی برایانەی نامەکەی والی کرد و بێ هیچ دوودڵییەك لەگەڵ دە ژەندرمەی تورکدا کە بەناوی گاردی شەرەفەوە نێردرابوون بۆلای، کەوتەڕێ و ئەوەی بەخەیاڵدا نەهات کە چەندکەسێك لەگاردی تایبەتی خۆی لەگەڵ خۆیدا بەرێت، هەروەها هەواڵی رووداوەکەی پیرانی نەبیستبوو، ونەیئەزانی لەئەنکەرە چ پیلانێك دژی خۆی و گەلی کورد دارێژراوە.

لەبەردەم هۆڵی کۆشکەکەدا فەرماندەی کاروانەکە بەپەلە چووە ژوورەوە بۆ گەیاندنی هەواڵی گەیشتنی میوانەکە. ئەفسەری راسپێردراو بەفەرماندەیکردنی دەستەی گوللەبارانکردنەکە، فەرمانی پێکرد:

-تۆ بچۆ دەرەوە، باخۆی بەتەنیا بێتەژوورەوە.

خالید بەگ بەتەنیا چووە هۆڵی کۆشکەکەوە کەکۆشکێکی کۆنی میرە کوردەکانی بنەچەی شەرەفخان بوو. چاوەڕێبوو والی خۆی پێشوازیبکات، کەچی دەرگا گەورەکە لەدوایەوە داخرا، چەند هەنگاوێکی نا بەرەو ناوەڕاستی هۆڵەکە و چاوێکی بەپایەکۆنەکانی کۆشکەکەدا گێڕا، چاوی کەوت بەچەندین لولەی تفەنگ کە ئاراستەی کراوە، لەو ساتەدا

تێگەیشت کە کەوتۆتە بۆسەوە، ویستی بکشێتەوە بەرەو دەرگاکە، هەر لەگەڵ یەکەم جولَەیدا لەشوێنی خۆی، دە تفەنگ پێکەوە تەقەیان لێکرد و کەوتە سەرزەوی مەرمەڕینی هۆڵەکە. هەمان ڕۆژ زۆر بەنهێنی و بەبێ ئاگادارکردنەوەی خێزانەکەی بەخاك سپێردرا.

لەهەمان سات و کاتدا مستەفا کەمال فەرمانی بەسوپای چوارکرد کە لەدیاربەکر جێگیربوو، بەرەو پیران بەرێبکەوێت بۆ تێکشکاندنی یاخیبوونی کورد(کە بێگانە پاڵپشتی نەکات)، وهاوکات سەربازگیریی گشتیی لەوڵاتدا ڕاگەیاند.

دوای ئەو ڕووداوەی کەدوو ژەندرمەکەی تیاکوژرا و فەرماندەکەیان ڕایکرد، شێخ سەعید گەیشتە ئەو ئەنجامەی حکومەت بەوەندەوە ناوەستێ و هەموو هێزی خۆی ئەخاتەگەڕ بۆ سەرکوتکردنی خۆی و جەنگاوەرەکانی.

لەتەمەنی ۸۰ ساڵیدا، لەزانا و ڕێبەری تەریقەتێکی ئایینیەوە، بووە سەرکردەیەکی سەربازیی و سیاسی.

لەبەرئەوەی زۆربەی ئەوانەی لەگەڵی بوون چەکداربوون، بێ هیچ زەحمەتێك لەیەکەی سەربازیدا ڕێکیخستن، و پیاوانی بەئەزموون و ناسراو بەئازایەتیی و توانای فەرماندەیی بەلێپرسراوی ئەو یەکانە دانا.

لەو کاتەدا هیچ ئەفسەرێکی پیشەیی نەیتوانی پەیوەست بێت بەهێزەکانی کوردەوە، بەشێکیان لەلایەن خالید بەگەوە بەئەرك نێرابوون بۆ ناوچەکانی تری کوردستان و خۆرئاوای تورکیا، و ژمارەیەکی زۆرتریان لەناو شورای دیاربەکردا گیریان خواردبوو، کەشارێکی ناسرابوو بەشوورە گەورەکانی و هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ دەرەوەدا نەبوو لەڕێی چوار دەروازەکەیەوە نەبێت. لەڕۆژی یەکەمی پێکهەڵپژانی نێوان فەرماندەیی ژەندرمەکان و پیاوانی شێخ سەعید، لێپرسراوانی سڤیل و سەربازیی، پیاوانی خۆیان گێڕایەوە ناو شارەکە و دەرگەکانیان داخست و ڕێی چوونە ژوورەوە و هاتنەدەرەوەیان لەهەمووکەسێك قەدەغەکرد، لەبەرامبەریشدا هەریەکسەر هێزەکانی تورکیا هەرچوار دەرگاکەیان داخست و

بەرگرییان لەپشت شووراکانەوە ڕێکخست. نزیکەی سەد ئەفسەر و پزیشك و ئەندازیار و پارێزەر و ڕووناکبیری تری کورد گیریان خوارد و بێبەشبوون لەمافی پەیوەستبوون بەبزووتنەوەی چەکداریی نیشتمانییەوە.

سەرەڕای گرفتە سەختەکان، شەڕی نێوان هەردوولا بەقازانجی هێزەکانی کورد دەستیپێکرد و سوپای تورکیا پاشەکشەی کردە ناو شووراکانی دیاربەکرەوە و کوژراو تەقەمەنی و کەلوپەلە جەنگییەکانی لەگۆڕەپانی شەڕەکەدا بەجێهێشت، هاوکات کەوتە بەرگریی لەشارەکە، و تۆپی قورس و شەستیرەکانی لەسەر شورا پان و کۆنەکان و ڕوانگەی بورجەکان دانا، و لەماوەی پێنج مانگدا شارەکەیان بەدەنگی تەقینەوەکانیان دەهەژاند.

دوای شکستی سوپای تورکیا، کوردەکان کۆنترۆڵی هەموو ناوچەکانی هەردوو پارێزگەی دیاربەکر و ئەلعەزیزیان کرد.

شێخ عەبدولڕەحیم برای بچووك و بەجۆشی شێخ سەعید هاتە ناوشاری مادن. بەماوەیەکی کەم پێش گەیشتنی، هێزی پارێزەری شارەکە رایانکرد و فەرمانبەرە بەرەچەڵك تورکەکانیش بەبەرگی جووتیاری کوردەوە دوایانکەوتن و رایانکرد بەرەو خۆرئاوا بەرێگە شاخاوییەکاندا، ژن و منداڵەکانیشیان پەنایان بردەبەر ماڵی پیاوماقوڵانی شارەکە. دێتەوە بیرم ماڵەکەمان پڕبوو لەو ژنانەی بەگریانەوە لەباوکم ئەپاڕانەوە لای شێخ عەبدولڕەحیم تکا بۆ مێردەکانیان بکات، هەندێکیشیان لەبەر پێیدا کەوتنە سەرچۆك:

-(بمانپارێزە ئەفەندی، تکات لێدەکەین، مەیەڵە پیاوانی شێخ بمانکوژن).

بەو شێوەیە هاواریان هێنا بۆ باوکم کە هەوڵی ئەدا ئارامیان بکاتەوە:

-(بەڵام کەس هیچ نیازێکی خراپی نییە بەرامبەرتان، مێردەکانتان هەڵەیانکرد شوێنەکانی خۆیان بەجێهێشت و ڕۆیشتن، ئەبوو لەنوسینگەکانیان بمێننەوە و درێژە بەکارەکانیان بدەن، کوردەکانیش وایان پێخۆش ئەبوو. ئێمە هیچ رقێکمان بەرامبەر بەگەلی تورك نییە و کە کوردەکان ڕاپەڕیون، تەنیا لەپێناو ناچارکردنی ئەنکەرەیە بۆ

ڕێگرتن لەپابەندییەکانی سەبارەت بەئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان لەچوارچێوەی دەوڵەتی تورکیادا).

باوکم کەبەدەنگێکی هێمن ودڵنیاییەوە ئەم قسانەی ئەکرد، لەراستیدا ململانێیەکی ناوخۆیی لەناخیدا هەبوو،چونکە لەسەر عوسمانیبوونی خۆی مابوو، واتا ولاتێکی فرە میللەتی پێباشبوو کەهیچ تایبەتمەندییەکی نەتەوەیی تیا نەبێت و لەلایەکی تریشەوە هەرگیز ئەو شێوازەی پێ باشنەبوو کە شۆڕشی کوردی پێ هەڵگیرسا.

ئەو بزووتنەوەیە فەرماندەی بەتوانای کەمبوو، جەنگاوەرەکانیش لەبنەڕەتدا خۆبەخش بوون، ئەگەرچی وەستای شارەزابوون لەبەکارهێنانی تفەنگ و خەنجەردا، بەڵام هەر بیرۆکەیەکیان رەت ئەکردەوە کە داوای دیسپلین و سیستەمی سەربازیی و سیاسیی بکات.

بەهۆی سەرکەوتنە سەربازییەکانیانەوە هەندێك خەڵکی گومانلێکراو پەیوەستبوون بە جەنگاوەرەکانەوە، و لێرەولەوێ بەشداریان کرد لەتاڵانکردنی ئەمبارەکاندا و پەنایان بردەبەر تۆڵەکردنەوەی خۆبەخۆیی، وەك: تیرۆرکردنی ئەفسەر و سەربازانی تورك لەوانەی بەرەزامەندیی خۆیان، خۆیان تەسلیمی ئەو سەرکێشانەکردبوو.

ئەم رووداوە نەگبەتی هێنانە، ئەبوونە مایەی نیگەرانیی باوکم کە حەزی لەقانون و دادپەروەریی بوو، و لەوەش زیاتر نیگەران بوو لەخراپیی دەستنیشانکردنی بەرپرسانی بەڕێوەبردنی شار و گوندە رزگارکراوەکان. بۆنمونە،(قەدریە فەندی) کرا بەفەرمانڕەوای مادن، کە کەسێکبوو ناسراو بەهەلپەرستی و پیلانگێڕیی و دووفاقی، خۆی کردبوو بە(قسەکەر بەناوی نەتەوەی کوردەوە) و گەیشتە ئەوەی داوای سەربەخۆیی تەواوی کوردستان بکات، و کەوتە دژایەتی هەرشتێك کە تورك بێت. دوای تێکشکاندنی شۆڕشەکەی شێخ سەعید، قەدریە فەندیش حوکمی لەسێدارەدانی بۆ دەرکرا، لەو ساتەدا کە جەلادەکە پەتەکەی کردە ملی، هاواریکرد:

(بۆی کۆماری تورکیا)، بەڵام ئەم هەڵوێست گۆڕینـە ژیـانی پێنەبەخـشییەوە و لەگـەڵ ژمارەیەکی زۆر کوردی تردا گیانی لەدەستدا.

پەلەپەلی ئەنکەرە بـووە هـۆی کـاری دوژمنکـاریی لـەنێوان تـورك و کـوردا و کـاری دوژمنانەی زۆر و لەژماردن نەهاتوو دژ بەکورد ئەنجام درا.

دوای کـۆنترۆڵکردنی شـارە بـچووکەکانی هـەردوو پارێزگـەی ئەلعـەزیز و دیاربـەکر، فەرماندەکانی چواردەوری شێخ سەعید بڕیاری رزگارکردنی شاری دیاربەکریانـدا. لـەماوەی چەند مانگێکدا دەستەبژێری هێزە هەڵبژاردەکانیان لەدەوری شوراکانی شـارەکە کـۆکردەوە بەمەبەستی ناچارکردنیان بۆ خۆبەدەستەوەدان، یان چوونە ناوشـارەکە و دەستبەسـەراگرتنی لەناوەوە، هەموو ئەمەش بەبێ تۆپ و تانکی هێرشبەر و فڕۆکـە، لەبەرامبـەر شـورایەکی پتەودا وەستابوون کە سوپایەکی مەشقدیدەی چەکدار بەهەموو جـۆرە چـەکێکی قـورس و سووك بەرگری لێئەکرد. ئەو کوردە خۆبەخـشانەی توانییـان خۆیـان بگەیەننـە ناوقەڵاکـە، بەدیل گیران و کوژران و لاشەکانیان شـێوێنرا وبەمەبەسـتی پاراسـتنی ناویـانگی سـوپا و رووخاندنی ورەی دانیشتوان، سوپای تورکیا کەللەسەری دیلەکانی کرد بەدارەوە وبۆ چەندین رۆژ بەکۆڵان و شەقامەکانی شارەکەدا گێڕایان.

بەم شێوەیە، لەکاتێکـدا هێزەکـانی کـورد لەبـەردەم دەرگاکـانی شـارەکەدا لاوازبـوو، لەجیاتی ئەوەی دەستبەسـەر بەشـەکانی تـری کوردسـتاندا بگـرن و بیخەنـە ژێـر رکێفـی خۆیانەوە، مستەفا کەمال و عیسمەتە کەر بەشێوەیەکی زیرەکانـە سیاسـەتێکی بـەهێزیان بەکارهێنا و هانی کوردەکانیان ئەدا بۆ ئەوەی دژ بەیـەك بجـەنگن بەمەبەسـتی لـەناوبردنی یاخیبووەکان. هـەروەك چـۆن پێـشتریش عوسمانییـەکان توانیبوویـان بەبـەکارهێنانی ئـەم سیاستە میرنشینە کوردەکان لەناوبەرن، و هاوکـات شـەڕی بـۆرژوازیی کوردیـان ئـەکرد و هانی لێکهەڵوەشانی خێڵەکانیان ئەدا، هەروەها نانەوەی دووبـەرەکی و شـەڕ لـەنێوان ئـەو خێڵانەدا.

کەمال، کوردەکان و کوردستانی ئەناسی، و پەیوەندیی زۆر نهێنی لەگەڵ سەرۆک خێڵە گەورەکانی کورد بەست، و نامەی دۆستایەتی و پیاهەڵدانی بۆناردن، لەنامەکانیدا بەبرا نازیزەکان ناوی ئەهێنان و ئەیتۆقاندن بەوەی شێخ سەعید بەکرێگیراوی ئینگلیزە و دوژمنێکی رەوشت نزمە، کە هەمووشتێك ئەکات لەپێناو دابەشکردن و نەهێشتنی ئیمپراتۆریی عوسمانیدا، و هەستی شەرەف و ئازایەتی و پەیوەست بوون بەئیسلامی تیا ئەبزواندن، و بەڵێنی درۆی پێئەدان بۆ ئەوەی پشتیوانی بکەن لەململانێکەی لەگەڵ ئەو (خۆفرۆشە رسوایە). توانای رازیکردنی بەجۆرێك بوو کە ژمارەیەکی زۆر سەرۆك خێڵ و کەسایەتییە گرنگەکانی لەخۆی کۆکردەوە و دژی هێزەکانی شێخ سەعید چەکداری کردن، سەرەرای ئەوە لەگەڵ ئینتیدابی فرەنسا لەسوریا رێکەوت بۆ گواستنەوەی هێزەکانی بەو هێڵی شەمەندەفەردا کە سنووری نێوان هەردوو وڵاتی پێکئەهێنا. ئەم رێکەوتنە دژی پەیاننامەی ١٩٢١ ی ئەنکەرەبوو کە بەهەموو شێوەیەك قەدەغەی کردبوو ئەو هێڵە بۆ ئامانجی سەربازیی بەکاربهێنرێت، بەو هێڵەدا دەیان هەزار چەکداری گواستەوە بۆ ناوچەکانی ئورفە و ماردین ولەوێشەوە بۆ بەرەکانی جەنگ، کوردەکانیش کاتێك بەخۆیانزانی گەمارۆدراون و هیچ کادرێکی مەشقدیدە و پشتیوانی دەرەکییان نییە.

توانییان چەندین مانگ بەرگری بکەن، و کاتێك بڕوایان بەشکستی خۆیان هێنا یەك لەدوای خۆیاندا بەدەست هێزەکانی تورکەوە.

لەحەوتی تشرینی دووەمی ١٩٢٥دا هێزەکانی تورکیا کوردستانی تورکیایان داگیرکرد، کە لەوماوەیەدا رەشترین رۆژەکانی مێژووی خۆی بەخۆوە بینی، و کوردستان بەئاگر و ئاسن لێدرا، پیاوان ئەشکەنجەدران و کوژران و گوندەکان سووتێنران و بەرهەمە کشتوکاڵییەکان لەناوبران و ژنان و منداڵان رفێنران و دواتر کوژران. تورکەکانی مستەفا کەمال قەسابخانەیەکیان بۆ کورد دانا کە درندەییەکەی ئەگەیشتە ئاستی ئەو قەسابخانەیەی تورکەکانی سوڵتان بۆ یۆنانیی و بولگاریی و ئەرمەنەکانیان دانا.

مستەفا کەمال دادگەیەکی سەربازیی نارده کوردستان بەناوی(دادگەی سەربەخۆیی)و بەخێراییەکی سەربازیی بێوێنە، هەزاران کەسی لەسێدارەدا و دوورخستەوە و زیندانی کرد.
لەو گوندانەدا کەبەرامبەر سوپای تورکیا بەرگریی کرابوو، منداڵان و ژنان لەحەوشەی ماڵەکاندا کۆکرانەوە و سەربازەکان لەسەریانەوە گوللەبارانیان کردن، ئەو روناکبیرانەی دوور یا نزیك هاوسۆزییان لەگەڵ شۆڕشی کورد دەربڕیبوو، چارەنوسێکی کارەساتباریان هەبوو، نزیکەی ٢٠ کەسیان پارچە پارچەکران و خرانە گونییەوە و فڕێدرانە دەریاچەی وانەوە.
لەمادن ٣٠ کەس دەستگیرکران، لەناویاندا باوکم و براگەورەکەم و مامم و عوسمانە فەندی ئامۆزام کە تاوانەکەی تەنیا ئەوەبوو لەکاتی گەیشتنی شێخ عەبدولڕەحیمدا بۆ مادن هیوای سەرکەوتنی بۆ خواستبوو.
لەشەوێکی سەهۆڵبەنداندا عوسمانە فەندییان راپێچی پیران کرد و بۆ رۆژی دوایی بردیانە گۆڕەپانە گشتییەکەوە و کەلەپچەیان لەدەستکربوو وبەستبوویان بەزنجیرێکی درێژەوە، و داوایان لێکردبوو لەبەردەم ئەو خەڵکەدا کە کۆبووبوونەوە، دانبنێت بەوەدا کە هاوکاریی و پشتیوانیی شۆڕشی کردووە و جنێو بەشێخ سەعید بدات، بەڵام ئەو بێدەنگ بووبوو.
کاتێکیش ئەفسەرەکە هەوڵیدابوو ناچاری بکات دان بەو تاوانە گەورەیەدا بنێت و جێو بەشێخ سەعید بدات، عوسمانی ئامۆزامان نەیتوانیبوو لەوەزیاتر خۆی رابگرێت و بەدەنگێکی بەرز هاواری کردبوو:
-سەرکەوتن بۆ شێخ سەعید و شۆڕشەکەی.
ئەفسەرەکە ئەم کاردانەوەیە ئەبلەقی کردبوو، و فەرمانیدابوو یەکسەر زیندانییەکان بەرنەوە بۆ زیندان نەوەکو خۆپیشاندانێکی جەماوەری دروست بێت، و دوایەوە هەموو هونەرەکانی ئەشکەنجەدان و سوکایەتی پێکردنیان لەگەڵدا بەکارهێنابوو.

دنیا تاریك بووبوو كاتێك ئەفسەرەكە لەحەوشەی زیندانەكەدا عوسمانە فەندی بەستبوویەوە بەقەدی دارێكەوە و فەرمانی دابوو بەسەربازەكان چەند سەتڵێك ئاوی پێدابكەن تاهەموو لەش و جلەكانی تەڕبوو بوو، و بەو شێوەیە بەجێیان هێشتبوو.

ئەو شەوە گەرمیپێو ٣٥ پلەی سەدیی ژێر سفری پیشان ئەدا، بۆ بەیانی ئامۆزاكەمان بوویبووە قاڵبێك سەهۆڵ.

هەواڵی ئەم مەرگە ناخۆشە دانیشتوانی مادنی تۆقاند، بەتایبەت كەسوكاری گیراوەكان.

ئەمە سەرەتای دۆزەخ بوو. من ئەوكاتە تەمەنم شەش ساڵ بوو، لەهەموو ئەوەی رووئەدا تێنەئەگەیشتم، بەڵام جگە لەباسی تیرۆر و كوشتن هیچی دیم نەئەبینی و نەئەبیست. دایكم شەو و رۆژ ئەگریا، خەڵك نەیانئەوێرا باسی كوردستان بكەن. بێگومان من ئەمزانی شتێكی نائاسایی و ترسناك رووئەدات.

ئیتر لەقوتابخانە ناچاربووین كە بەخۆمان بڵێین تورك، و گفتوگۆ سیاسییەكان لەماڵەوە راگیران.

لەترسی چارەنووسی باوكم و براكەم و مامم، شەو و رۆژ نیگەرانیی باڵی بەسەر ماڵەكەماندا كێشابوو، لەچارەنوسیان ئەترساین كە ئاخۆ ئێستا ئەوانیش تووشی ئەشكەنجەدان و سوكایەتی پێكردن ئەبنەوە؟! و لەوانەشە لەمەودوا ئیتر نەیانبینینەوە.

هەموو خێزانەكان لەم كەشە تۆقێنەرەدا ئەژیان، هیچمان نەئەبیست، جگە لەباسی كوشتنی كوردەكان لێرە و سوتاندنی تەواوی چەندین گوند لەوێ و دۆزینەوەی لاشەی منداڵانی بچووك لەولا. زۆرجار دێتەوە یادم: شەوێكیان دەنگەدەنگێكی تۆقێنەر لەخەو رایچڵەكاندین، سەرەڕای ئەوەی رووبارێكی فراوان كەوتبووە نێوان ماڵی ئێمە و ئەو فەرمانگە حكومییەوە كە زیندانی تێدابوو، دەنگە دەنگێكی نامرۆڤانە ئەهات و مەحاڵبوو هیچ ئاژەڵێكیش بتوانێت بەرگەی ئەو ئازارە ترسناكە بگرێت.

رۆژی دوایی راستییەکە دەرکەوت، دەنگەکان هی ئەو کوردانەبوون کە ئەشکەنجە ئەدران، و فەرمانبەرە تورکەکان لەیارییەکەیاندا بۆ ناچارکردنی گیراوەکان کە زمان لەهاوڕێکانیان بدەن ئاسنی سوورەوکراویان بەکارئەهێنا.

لەهەگبەی هەر بەیانییەکی نوێدا کۆمەڵێ هەواڵی خراپی تیابوو. رۆژێکیان لێپرسراوانی تورك داوایان لەکوردەکان کرد هەموو ئەو چەکانەی لایانە رادەستی حکومەتی بکەنەوە. ئەم بڕیارە هۆیەکی تربوو بۆ تۆقاندنی خەڵك، چونکە پێشتر ئازادیی تەواویان هەبوو لەخاوەنداریێتی هەر جۆرە چەکێك کە پێیان خۆشبوایە.

ئێستاش دیوارەکانی ژوورەکەی باوکم دێتەوە بەرچاو کە رازابوونەوە بەتفەنگی کۆن و شمشێری زیوین و خەنجەری مشت و کێلان رازاوە بەبەردی دەگمەن و گرانبەها، ژوورەکە مۆزەخانەیەکی راستەقینەبوو کە پڕبوو لەو خشڵانەی خێزانەکەمان چەندین سەدەبوو پاراستبوویان وەك بیلبیلەی چاویان، بەڵام توندیی حکومەت لەمبارەیەوە ناچاریکردین دەستبەرداریان بین.

زۆری پێنەچوو لێپرسراوانی تورك بڕیارێکی نوێیان دەرکرد: هەر کوردێك فیشەك یا گوللەیەکی پێ بگیرێت، ئەگیرێت و بێبەزەییانە تووشی ئەشکەنجە و دوورخستنەوە ئەبێت.

زۆرترساین، چونکە گوڵشەنی خوشکم لەکاتی گەڕان لەدۆڵابەکەیدا فیشەکێکی تفەنگی راوی دۆزییەوە و بەپەلە خستییە ناو زۆپا دارەکەوە، و لەپڕدا بیری کەوتەوە کە فیشەکەکە بەکارنەهێنراوە.

(دوورکەونەوە) دایکم هاواری کرد. چاوەڕێی تەقینەوەی فیشەکەکە و ماڵەکەمان بووین، بەڵام فیشەکەکە نەتەقییەوە بارووتەکەی پێش تەقینەوە سوتا، و تەنیا گوێمان لەفیشکەفیشکێك بوو.

لەو ماوەیەدا ماڵەکەمان لەشانەی هەنگ ئەچوو و ئارامی بەخۆوە نەئەبینی، لەلایەکەوە ژن و منداڵ ئەهاتنە ژوورەوەو لەلایەکی ترەوە باوکان و هاوڕێیان و دراوسێکان

و دۆستەکان کە نیشتەجێی گەڕەکە دوورەکان بوون هاتوچۆیان نەکردین. ئێستاش ئامۆژنم دێتەوە بەرچاو، ژنێکی بەتەمەنی سەنگین، هەر پێنج کچەکەی بەدەوریەوە بوون و دەستی تاقە کوڕەکەی گرت و بەپلیکانەی دەروازەی ماڵەکەماندا سەرکەوت و کچەکانی بەخەمباری و باریٚ مەینەتەوە بەدوایەوە بوون، کە پێش گیرانی باوکیان زۆرچالاك و بزێوبوون. ژنەکان ئەیانقیژاند وبەدەم گریانەوە قژی خۆیانیان ئەرنییەوە و ئەیانوت:

-(چیمان بەسەر دێت خوای گەورە؟ مێردەکانمان و کەسوکارەکەمانیان گرتووە و کوشتووە، کە نانبدەر و پشتیوانمان بوون لەم ژیانەدا، مرۆڤ چۆن ئەتوانێت هەڕەشەی کوشتن لەبەرێزێکی وەك یوسفە فەندی بکات؟ ئەو مرۆڤەی کە رۆژێك لەرۆژان ئازاری هیچ زیندەوەرێك تەنانەت مێروولەیەکیشی نەداوە، بێگومان ئەمە کۆتایی دنیایە، بەڵێ دنیا ئاخرە).

لەئەنجامی ئەم قسانە هەندێك لەدۆستانی دانا و لەسەرخۆ هەوڵیانئەدا دایکم دڵنیابکەنەوە:

-(خانم، گرفتی مێردەکەت وەك عوسمانە فەندی نییە، ئەو هەمیشە دووربوو لەرووداوە سیاسیی و سەربازییەکان، و لەماڵەکەی خۆشیدا پێشوازیی لەژن و منداڵی کارمەندە تورکەکان کردبوو، جگە لەوەش پایەیەکی کۆمەڵایەتی گرنگی هەیە. ئەبینیت کە لەماوەی ١٠ رۆژدا ئازادی ئەکەن، و تورکەکانیش داوای لێبوردنی لێئەکەن).

دایکم کەکوژرانی عوسمانەفەندی لەناخەوە هەژاندبووی لەوەڵامدا ئەیوت:

-(گەر تاوانباریشی نەکەن،ئەوا لەسەر پایە کۆمەڵایەتییەکەی لای خۆیان ئەیهێڵنەوە).

بیری باوکمم ئەکرد و رۆژەکانیش هێواش، بگرە زۆر بەخاویی تێئەپەڕین لەناو کەشێکی نیگەرانی و خەمدا.

بڕیارمدا سەردانی باوکم بکەم. سواری بۆزۆ بووم و پێکەوە چووین بۆ زیندان، ئێستاش ئەڵێیت دوێنێ بووە دێتەوە یادم: پاسەوانەکە دەرگا قورسەکەی کردەوە، لەوکاتەدا باوکم

دەرکەوت و کەمنی بینی خەمباربووم و تـەنیا، چـاوەکانی پڕبـوون لـەئاو. ویـستم ماچـی بکەم، بەڵام پاسەوانەکە ڕێی نەدام ودەرگا گەورەکەی داخست بـەبێ ئـەوەی بـاوکم بتـوانێ یەك وشەش بڵێ، دوای ئەوە بەسەرپشتی بۆزۆوەوە گەڕامەوە و بەدرێژایی ڕێگەکە ئەگریام.

جگە لەخزمەتکارەکان کەس لەماڵەکەدا نـەمابوو، جگـە لـەپیاوێك، ئـەویش مـامی ئازام(نافی)برا گەورەی بـاوکم بـوو. کـە بەسـۆفی ناسـرابوو، چـونکە پیـاوێکی شـەرمنی گۆشەگیربوو، و بێئەزموون لەفێڵی ئیـداریی و سیاسـیدا، بـەڵام ئێـستا ناچـاربوو هـەموو کارەکـانی بـاوکم لەئەسـتۆ بگرێـت و هاوکـات لەبەرامبـەر فێڵـە ئەهریمەنییـەکانی فەرمانگەکانی حکومەتدا بەرگریی بکات.

ڕۆژ بەرۆژ تۆقاندنی دادگەکانی سـەربەخۆیی زیـادی ئـەکرد، ئـەو حـوکم و بڕیارانـەی سێدارەدان کەئەم دادگە تایبەتە دەرینەکردن و خێرایی جێبەجێکردنی بڕیارەکـان کەشـێکی ترس و تۆقاندنی دروستکردبوو.

(عەلی ساحیب)ی سەرۆکی دادگەی سەربەخۆیی لەدیاربەکر لەدیـدارێکی ڕۆژنامەیـدا بەشانازییەوە وتبووی:

-(سێدارەکان بەهێشوو یاخیبووانیان گرتووە)

ئەم قسەیە زیادەڕەویی نەبوو، ئەی هەر عەلی ساحیب پەنجاوپێنج فەرمانـدەی شۆڕشـی دوای تـەنیا مانگێـك لـەگرتنیان بەسـێدارەدا هەڵنەواسـی، لەنێوانیانـدا سـەرکردەی ڕاپەڕینەکە،شێخ سەعید کە تەمەنی لە ٨٠ساڵیدابوو؟ لەجیاتی ئەوەی تەرمی شـەهیدەکان بدرێتەوە بەکەسوکاریان، دەسەڵاتدارانی تورك تەرمەکانیان خستەناو گـۆڕێکی بەکۆمەڵـەوە لەباخچەیەکی نزیك گۆڕەپانی لەسێدارەدانەکە، بەرامبەر دەرگای ناسراو بەدەرگای چیا.

دادگای سەربەخۆیی دۆسێیەکی کـۆن یـا ڕاپـۆراتێکی پـۆلیس و تەنانـەت قـسەیەکی سادەی بەس بوو بۆ ئەوەی حوکمی لەسـێدارەدانی پزیـشك و پـارێزەر و شـاعیر و پیـاوانی ئایینی دەربکات.

ئەو دووشەهیدەی کە تا ئـەمڕۆش گـەلی کـورد شـانازیی بەیادەوەرییانـەوە ئـەکات ، (دکتۆر فوئاد خـەڵکی دیاربـەکر و پـارێزەر حـاجی ئـاختی خـەڵکی لیجـە)بـوون، پـێش شەهیدکردنیان دکتـۆر فوئـاد داوای کـرد هاوسـەرەکەی لـەژوورێکی تـەنیادا ببینێـت، و داواکەی بۆ جێبەجێ کرا، بەڵام ئاختی کـە گەیـشتە سـەر سـێدارەکە بەهێمنییـەوە رووی قسەی کردە بەرپرسانی تورك:

-(ئێوە بەکوشـتنی ئێمـە پەیوەنـدیی مێـژوویی و ویـژدانیی نێـوان کـورد و تـورك ئەپچڕێنن، ئێوە هەڵەیەکی زۆرگەورە ئەکـەن، دڵنیـابن کەگـەلی کـورد لەتۆڵەکردنـەوە دواناکەوێت).

لەوساتەدا کـە جەلادەکـە پەتەکـە دەکاتـە ملـی، هێنـدەی هێـز تیـا ئـەمێنێت کـە هاواریکات:

(بژی کوردستان...)

سـەربازەکان بەقەمـەکانیان ئەکەونـە گیـانی، ئـاختی سـەربەرزئەکاتەوە و کـۆنترۆڵی ئازارەکانی ئەکات و بەهەموو هێزەوە ئەقیژێنێت:

-(بژی کۆماری داهاتووی کوردستان، بڕوخێ...)وپێـشئەوەی قـسەکانی تـەواوبکات جەلادەکە کورسییەکەی لەژێر قاچی دەرهێنا، و ئـاختی بەهـەواوە مایـەوە، و کاتێـك دوا هەناسەیدا، خوێن وەك فوارە بە بەسێدارەکەدا چۆراوگەی بەست.

بێگومـان، گـەر دادگـەی سـەربەخۆیی ئـاوا بـەجۆش و خرۆشـەوە بـەردەوام بوایـە، ژمارەیەکی زیاتری کورد شەهید ئەبوون، بەڵام ئەو قەسابخانە بەپەلە و یەك لەدوای یەکانـە، بـووە مایـەی هەژانـدنی هـەموان، و هەڵوێـستی ئازایانـەی قوربانییـەکانیش سـەرانی ئەنکەرەی ناچارکرد بیر لەمەسەلەکە بکەنەوە، و رێنمایی لەئەنکەرەوە بـۆ عـەلی سـاحیب دەرچوو کە سنووری بۆ کارەکانی دابنێ و هیچ مرۆڤێـك بـەبێ بەڵگـە تاوانبـار نـەکات و توندوتیژیش کەمبکاتەوە. ئەم گۆڕانکارییە سیاسییانە دەنگدانـەوەیان هـەبوو، سێدارەکان

لەدیاریەکر دیارنەمان و زۆر لەرۆشنبیرانی تۆمەتبارکراو بەو تاوانانەی کـە دکتـۆر فوئـاد و پارێزەر ئاختی پێ تاوانبارکران، حوکمدران بە زیندانی ١٥ سـاڵ و هـەتا هـەتایی بـەکاری سەختەوە.

لەگەڵ خاوبوونەوەی تیرۆردا، بەپەلە بەرتیل وخزمایەتی باڵیان کێش بەسەر دادگەکانـدا و عەلی ساحیب سامانێکی زۆری کۆکردەوە لـەرێی شـاردنەوەی فایـل و دۆسـییەکان، یـا تۆمەت دروستکردن بۆ گیراوەکان.

باوکم بەوە ناسرابوو کە عوسمانییە، بۆیە عـەلی سـاحیب دەسـتی کـرد بەهەوڵـدان بـۆ تۆمەت دروسـتکردن بۆ براکەم کە نەچووبووە رێکخراوە کوردییەکانەوە.

دوای دەرچوونی ئەو رێنماییانـە لەئەنکـەرەوە، نیـشتمانپەروەرانی کـورد بەمەترسـیی دائەنران کە ئەبێت زۆر بەسادەیی لەناوبرێن یا بۆ زۆرتـرین مـاوە لەزیندانـدا بهێڵرێنـەوە. دادوەری لێکۆڵینەوەی دادگەی سەربەخۆیی فەرمانی بەتۆمـەتبارەکان ئـەکرد تـادان بنـێن بەتاوانێکدا کە ئەنجامیان نەداوە، لەبابەتی ناردنی چەك بۆ شـێخ سـەعید و بەشـداریکردن لەشۆڕشدا، یاتیرۆرکردنی ئەفسەرانی تورك و تۆمەتی تر.

لەبەرئەوەی باوکم و براکەم و مامم زۆر بەتوندی بەرگرییان لەخۆیان کرد بەرامبـەر ئـەو تۆمەتانەی خرابووە پاڵیان، بۆیە فەرمانبەرانی تـورك هەوڵیانـدا شـایەتی درۆ بدۆزنـەوە، و ئەم کارە گەیشتە رادەیەك کە بەرێوەبەری ناوچەی مادن هەرەشەی لە(رەسۆ)ی برام کرد کـە تەمەنی ١٨ ساڵ بوو بۆ ئەوەی شایەتی درۆ دژی باوکم بدات، بەڵام ئەم پیلانەش شکـستی هێنا. لێرەدا تورکەکان پەنایان بردەبەر تۆقاندن. براکەم کە لەدیاریەکر گیرابوو گواسـتیانەوە بۆ زیندانی پیران کـە ژەندرمـەکانی بەدڕنـدەیی و توندوتیـژیی ناسـرابوون. دوای نیوەشـەو زیندانەکانیان ئەهێنایە حەوشەی زیندانەکە و ناچاریان ئەکردن بەچاوی بەسـتراوەوە بکەونـە سـەرئەژنۆ و هەرەشـەیان لێئەکردن،ئەگـەر داننـەنێن بـەو تاوانانـەدا، تەقـەیان لێئەکـەن،

هەندێك جاریش سەربازەکان فیشەکیان بەئاسماندا ئەتەقاند یا لەدووری چەند سانتیمەترێك لەگیراوەکانەوە، سەرەڕای ئەوەش گیراوەکان هەرگیز خۆیان نەدابەدەستەوە.

ئەوکاتە زیندانییەکانی مادن گوێزرانەوە بۆ دیاربەکر بۆ رووبەڕووبوونەوەی ئەو زیندانیانەی پێشتر بەسزای قورس حوکم درابوون، ودادوەری لێکۆڵینەوەی کۆماریی بەڵێنی پێدابوون،ئەگەر بەڵگە پێشکەش بکەن سەبارەت بەوەی خەڵکی مادن هاوکاریان کردوون ئەوا چاو بەدۆسییەکانیاندا ئەگێڕنەوە، لەوانەیە زیندانییەکانیش لای خۆیانەوە بەڵێنیان دابێت بەشداری ئەم یارییە قێزەوەنە بکەن، بەڵام کاتێك گیراوە مادنییەکان برانە بەردەمیان، زیندانییەکان بێدەنگبوون و دانیان بەهیچدا نەنا، هەندێکیشیان دەستیانکرد بەگریان، ئەمەش شکستێکی تری لێپرسراوانی تورك بوو.

دوای ١٠ مانگ لەبردنی گیراوەکانی مادن بۆ دیاربەکر، دادگەی سەربەخۆیی گوێزرایەوە بۆ(ئەلعزیز) و بڕیاریدا هەموو ئەو گیراوانەی، دادوەر لەبەر بێبەڵگەیی حوکمی نەداون بگوێزرێنەوە بۆ زیندانی ناوەندیی ئەلعەزیز- ناوەندی پارێزگایەکە لەخۆرئاوای مادن-. مانگی شوبات بوو، مانگی زریان و هەڵکردنی رەشەبای ناوچە شاخاوییەکان، کاتێك پڕوپاگەندەی ئەوە بڵاوبووەوە کە نزیکەی ٣٠ زیندانیی لەگەڵ ٥٠ پاسەوانی ژەندرمەی سوارەدا دێنە زیندانەکەی مادن بۆ حەوانەوە، ئەمە هەواڵێکی لەناکاویی نائاسایی بوو بۆ دانیشتوانی شارەکە، نەك تەنیا بۆ ئەو خێزانانەی خەڵکیان گیرابوو یا کەسوکارەکەیان، بەڵکو بۆ هەموو دانیشتوانی مادن.

دیوەخانەکەمان وەك پوورەی هەنگی لێهات، رەسۆی برام بەپەلە ئەهاتەدەرەوە و بەراکردن ئەگەڕایەوە، دەرگای لەسەرخۆی دائەخست و بەدرێژیی لەگەڵ دایکم قسەی ئەکرد، رۆژێکیان بینیم لەگۆشەیەکی تاریکیماڵەکەماندا لەگەڵ گەنجانی خێزانەکەمان چرپە چرپی ئەکرد، بەتایبەت لەگەڵ حەسەن کە لاوێکی بەهێزبوو، ولای ئێمە مەیتەربوو. بەرەبەیانی رۆژێکی خۆش حەسەنم بینی بەپێ ئەو رێگە شاخاوییەی گرتەبەر کە ئەچێت بۆ

ئەلعەزیز، پێشبینیم ئەکرد کە شتێکی ترسناك گەڵاڵە ئەکرێت، بەڵام نەمئەوێرا لەبارەیـەوە بۆ هیچ کەسێك قسەبکەم.

رۆژی ١٨ شوباتی ١٩٢٦ مادن چاوەڕێی پیاوماقوڵـە گیراوەکـانی ئـەکرد، بـەڵام بـێ سوودبوو، ژنان رانەمەڕی بریانییان بـەبرنج و بـادەم و پـاقلاوە و میـوە و خـواردنی تـرەوە ئامادەکردبوو، بـەڵام ئەمانـە هـیچ سـوودێکی نـەبوو چـونکە هێنـدە بەپەلـە گیراوەکـان گوێزرانەوە کە خێزانەکانیان ئەبلّەق کرد.

خەڵك کەوتنە ترسی ئەوەی لەوانەیە بەرپرسان بەنیازبن گیراوەکان لەرێگـە بکـوژن، یـا لەوسێدارانەی لەشاری ئەلعەزیز دانرابوون لەداریان بدەن.

دایکـم کـە لەنیگەرانیـدا ئـاگری گرتبـوو، بەرێگەکـەدا کەوتـەرێ تـا لەچارەنووسـی مێردەکەی و کورەگەورەکەی دڵنیابێت، و ئامادەبوو بڕوات و لەئەلعەزیز جـێگیر ببێـت تـا لەنزیکیانەوە بێت و هەموشتێکیان لەپێناودا بکات و هەوڵبـدات ژیانیـان لـەناو زیندانـدا مسۆگەر ببێت، بێگومان هەوڵیش ئەدات بۆ ئازادکردنیان.

سەرەڕای ئەوەی باری جەستەی زۆرخراپ بوو، و ئەم زەمانە کـە هـیچ رەحـم ناکـات و پشتی پێ نابەسترێت، هەرچی لەتوانایدا بوو لەشساغیی و پـارە، هـەمووی خـستەگەڕ بـۆ رزگارکردنی ئەو کەسانەی بەنرخترین شتی ژیانی بوون، لەزیندان و مـەرگ. بـەڵام خراپیـی رێگەکان و ئەو وەرزە زۆرساردەی سـاڵ و ئامرازەکـانی گواسـتنەوە، رێگـەیان بەسـەفەری ژنێکی نەخۆشی وەکو دایکم نەئەدا. زۆر بەزەحمەت توانیمـان قـایلی بکـەین سـەفەرەکەی دوابخات و رێبدات رەسۆ بۆ ئـەم ئەرکـە بـچێتە ئەلعـەزیز. براکـەم بـەڵێنی پێـدا لـەکاتی درێژەکێـشانی مـاوەی دادگەکـەدا، خانوویـەك لەدەوروبـەری زیندانەکـە بـەکرێ بگرێـت، بۆئەوەی دایکم بچێت و لەوێ نیشتەجێ بێت. دوای کۆبوونەوەیەکی خێزانیی، رەسـۆی بـرام پاڵتۆیەکی خووری ئەستووری لەبەرکرد و جـوانترین بـارگیری تەویلەکـەمانی بـرد و بـەرەو ئەلعەزیز بەرێکەوت.

چاوەڕێی بووین لەماوەی هەفتەیەکدا بگەڕێتەوە. دایکم بڕیاریدا بچێت بۆ ئەلعەزیز و ماوەیەك لەوێ بمێنێتەوە بە هاوڕێیەتی دەستەیەك لەکچانی ئامۆزاو کارەکەرەکان کە ئەو خواردنانەی باوکم و کاکم پێیانخۆشە ئامادەی بکەن.

ئەمزانی گوڵشینی خوشکە گەورەم کە ئەوکاتە تەمەنی ١٠ ساڵ بوو لەماوەی سەفەرەکەی دایکمدا ئاگای لێم ئەبێت، خوشکەکەم کچێکی بچکۆلەی بەئەدەب و هەست ناسك بوو. بەم بیرۆکانە دڵخۆشیی خۆم ئەدایەوە، بەڵام دایکم بەپەلە سەفەری نەکرد، ئەبوو یەکەمجار پارەیەکی زۆر لەگەڵ خۆی بەرێت، بۆیە لەدوڵابەکەی باوکمدا بەدوای پارەدا ئەگەڕا، هەروەها لای قەرزدارەکانمان و ئەوانەی دوکان و ماڵ و ئەمبار و ئاش و باخچە و زەوییەکانمانیان بەکرێ گرتبوو. کاتێك گەیشتە ئەو بڕوایەی کە ئەو پارەیەی کۆیکردۆتەوە بەش ناکات، وای بەباشزانی هەندێك لەخشڵەکانیشی بفرۆشێت. بەڵام گرفتی پارە تەنیا کێشەنەبوو و بۆئەوەی دڵنیابێت کە لەکاتی نەبوونی ئەودا هەمووشتێك بەرێکی بەڕێوەئەچێت، سەرگەرمی راوێژبوو لەگەڵ ئامۆزاکانمان و دۆستە نزیکەکانمان وژنانی گەڕەك، و زیاد لەپێویست ئامۆژگاریی و رێنمایی ئەدایە خوشکە گەورەکەم و نافی مامم و کەسانی تری خێزانەکەم:

-(ئاقڵانە هەڵسوکەوت بکەو لەئاستی بەرپرسیارێتییەکانی سەرشانت دابە، لەبیرت نەچێت کە وەختی شووتە).دایکم بەردەوام قسانەی ئەدا بەگوێی گوڵچیندا.

گوڵچینیش دڵنیای ئەکردەوە:

-(بەڵێ، نیگەران مەبە هەمووشتێك بەدڵی تۆ ئەبێت).

کێشەیەکی تر، دۆزینەوەی عەرەبانچییەکی گونجاوبوو، کە جێ متمانە بێت و لەخۆی و ئەسپەکانی عەرەبانەکەی دڵنیابین و لەم وەرزەی ساڵدا بتوانێت بەرێگەی باریك و پێچاوپێچی نێوان مادن و ئەلعەزیزدا بڕوات. ئەم رێیە بەپەنا رووبارەکاندا ئەڕوات و لێرەو لەوێش بەقەراغی چەندین دۆڵی هەزار بەهەزاردا، هەروەك بەسەر چەندین پردی تەختەی کاتیدا تێئەپەڕێت کە چەندین رووداو لەسەریان روویداوە. دوای گەڕانێکی ورد و بێزارکەر پیاوێکی

بەهێزمان دۆزییەوە کەداوای پێنج ئەوەندەی کرێی ئاسایی خۆی ئەکرد و ئەو مەرجەشی لەسەرداناین کە دوو پیاوی بۆ بگرین بۆ یارمەتیدانی لەلابردنی بەفر لەوشوێنانەی رێگەی رۆیشتنی عەرەبانەکە ئەگرن. دایکم بەهەموو مەرج و داواکانی رازی بوو.

لەرۆژێکی خۆرەتاودا کە لەقوتابخانە گەڕامەوە زانیم دایکم بەعەرەبانەیەکی چوارئەسپی سەفەری کردووە و رەسۆ و جەمالی لەگەڵ خۆی بردووە بێئەوەی خواحافیزیم لێبکات یا تەنانەت ماچێکم بکات. بەگریانەوە رامکرد بەرەو ژوورەکەی و کردم بەهاوار هاوار:(جاجو جاجو) بۆ ئەوەی بەپەلە دەرگاکەم بۆ بکاتەوە. ئەو چەند خولەکەی خایاندی تا جاجو لەقاتی خوارەوە بگاتە قاتی دووەم، بۆ من ماوەیەکی درێژبوو وەك سەدەیەکی تەواو، سەرئەنجام دەرکەوت و جلەکانی بەدەستییەوەبوو. لەگەڵ پێ بەزەوییدانندا پێم وت:

-هەر ئێستا ئەم دەرگەیە بکەرەوە.

بەخۆشەویستییەکەوە وەڵامی دامەوە:

-ئارامبە و جوان گوێم لێبگرە، کە دایکت سەفەریکرد و تۆ لەقوتابخانەبوویت، لەترسی ئەوەبوو کە ئەوەکو لەکاتی جیابوونەوەدا تۆ بگریت و ئازاربچێژیت، زۆر نیگەرانبوو لەبارەی تۆوە و داوای لێکردین بەچاکیی ئاگامان لێت بێت.

-نامەوێت بزانم چی وتووە، تەنیا ئەمەوێت ژوورەکەی ببینم.

-باشە، باش.... ئێستا دەرگەکەت بۆ ئەکەمەوە، بەڵام بەو مەرجەی دەستکاریی هیچ نەکەیت.

-بەڵێن بێت، بەڵام تەنیا رێم بدە بچمە ژوورەوە.

کاتێك جاجو دەرگەی کردەوە، جێگەکەیم بەچۆڵیی بینی، بەراکردن رۆیشتم و چەرچەفەکەم لەسەرلابرد و لەسەردەم، خۆمدا بەسەریدا و کەوتمە بۆنکردنی پشتی و بەتانییەکان بۆ ئەوەی بۆنی دایکم هەڵمژم. زۆر بەدوای ئەو سەرپۆشەیدا گەڕام کە حەزم ئەکرد بینێیم بەسنگمەوە، بەڵام بۆم نەدۆزرایەوە، سوچێکی بەتانییەکەم گرت و دام

بەخۆمدا. نازانم ماوەی چەند بەم شێوەیە مامەوە، تەنیا دێتەوە بیرم کە فرمێسکی گەرمم بەسەرپشتییەکەدا ئەرشت و بەگریانەوە بانگم ئەکرد:

-دایە...دایە خێرا وەرەوە بۆ لامان، دایەگیان.

دوایئەوە بەئارامی هەستام و لەبەردەم ماڵەکەدا یاریم ئەکرد.

چەند مانگێك تێپەڕی بێئەوەی هیچ شتێك لەقوتابخانە رووبدات، زۆر بایەخم ئەدا بەوانەی ئەو مامۆستایانەی تازە لەخوێندنگە گشتییەکانی خۆرئاوای تورکیا دەرچوو بوون، هەوڵێکی زۆریان ئەدا بۆ ئەوەی ئایدۆلۆژیای کەمالیزمان فێربکەن:(کۆماری تورکیا کە مستەفا کەمال دروستی کرد، مەزنترین پاڵەوانی هەموو سەردەمەکان و دیمۆکراسیترین و پێشکەوتووترین و وڵاتی جیهانە،وجگە لەتورك کەسیتری تیانییە). پێیان ئەوتین:(ئێوە کورد نین،کورد شتێك نییە، جگە لەو درندە و رێگرانەی لەشاخەکاندا ئەژین)،ئێمەش ناچاربووین کە بەخۆمان بڵێین تورك و تەنیا بەتورکیی قسەبکەین.

لەبەرئەوەی باوکان بەگشتی ئامۆژگاریی رۆڵەکانیان ئەکرد گوێڕایەڵی مامۆستاکانیان بن و گوێ لەقسەکانیان بگرن، هیچ خوێندکارێك نەیئەوێرا دژیان بوەستێت.

لەگەڵ ئەوەی زۆربەی خوێندکارەکان خۆیان وایپیشان ئەدا کە بەجۆشن بۆگوتارەکان و پیاهەڵدانەکان، بەڵام لەناخی خۆیاندا هەر کوردبوون. هەرچەندە هەندێك لەخوێندکارانی پۆلە بەرزەکان باوەڕیان بەبیرۆکە و ئایدیای مامۆستاکانیان هەبوو، و چوونە ریزی لایەنگرانی مستەفا کەمالەوە.

بەڕێوەبەرێتیی قوتابخانەکە هانی ئەوانەی ئەدا و بەڵێنی پێئەدان بەرامبەر بەوەی زمان لەوهاوڕێیانەیان بدەن کە بەکوردی قسەئەکەن یا بەخراپ ناوی مستەفا کەمال ئەبەن. خۆشبەختانە ئەوانە ژمارەیان کەمبوو و بەئاسانیی هاوپۆلەکانیان ناسیانن و ئافەرۆزیان کردن، هەندێك جاریش بەدەستی هاوپۆلەکانیان لێدانیان ئەخوارد، بەڵام بەڕێوەبەرێتی قوتابخانەکە هەمووجارێك ئەچوو بەهانایانەوە و یارمەتی ئەدان و بەبێ دوودڵی توندترین

ڕێوشوێنیان ئەگرتەبەر لەدژی نەیارەکانیان و جۆرەها پەلپ و بیانوو و سەرئێشەیان بۆ دروست ئەکردن.

لەلای خۆمەوە یەك وشەشم لەبارەی ئەو کەشەوە کەبالّی بەسەر قوتابخانەکەماندا کێشابوو لەلای کەس باس نەئەکرد. بەم شێوەیە کات ئەڕۆیشت و هەموو خێزانەکە هەولّی زۆریان ئەدا تا ژیانم ئاسوودە بکەن.

جارجارە هەوالّە ناخۆشەکان نیگەرانیان ئەکردین، وەك ئەوەی زانیمان دادگەی سەربەخۆیی لەنەلعەزیز بەردەوام ئەبێت لەکارەکانی و سەدان کوردی ناردووە بۆ سێدارە. ئەوەشمان بیست کە ئەفسەرێکی گەنجی ژەندرمە لەگاردی تایبەتی مستەفا کەمال نێردراوە بۆ کوردستان بۆ سوکایەتیی پێکردن و ئەشکەنجەدانی ئەو کوردانەی کاربەدەستان بەمەترسییان ئەزانن.

ئەم جەللادە خووی وابوو کەجنێویدات و گیراوە سیاسییەکان بوروژێنێت، هەندێك جاریش بەرێکەوت لەناو گیراوەکاندا پیاوانی بەتەمەنی هەلّئەبژارد و تفی ئەکردە دەموچاویان، زللەی لێئەدان و ئەیخستن بەئەرزدا و بەپێوە ئەچووە سەریان. ئێمە بیرۆکەی ئەوەی کەئەو پیاوە بێویژدانە بەو شێوازە ناشرینە لەگەلّ کەسوکارمان هەلّسوکەوت بکات، گیانی ئەهێنایەنە لەرزین.

پشووی هاوین دەستی پێکرد و دایکم هەرنەگەڕایەوە.

هەندێك لەو میوانەی من حەزم لێیان بوو پێگەیشبوون، وەك، گێلاس و هەرمێ و ترێی کشمیشیی و تووی سپی بریقەداری وەك مرواری کە تامی هەنگوین ئەدا، بەسەر لقەبەرزەکانی یەکێك لەدارتووەکاندا سەرئەکەوتم و ئەو توواتەم لێئەکردەوە کە لەبەرهەتاوەکە بوون. یەکێك لەنیوەڕۆ خۆشەکانی حوزەیران، دوای ئەوەی هەلّبەزودابەزم کرد و مەلەم کرد و تا تێربووم میوەم خوارد بەهاوڕێیەتی ئامۆزاکەم دابەزیمە خوارەوە بۆ

مادن، کاتێك ئەمویست خۆم هەڵدەمە سەرپشتی کەرەکەم، حەسەنە فەندی دراوسێمان بەرەورووم هات:

-(چاوەڕێبە پاشا چاوەڕێبە، هەواڵی گرنگم پێیە). منیش کەرەکەم دایەدەست کوڕی مامەکەم، کاتێك گەیشتمەلای باوەشی پیاکردم و ناوچاوانی ماچکردم و وتی:

-(ئەوا یەکێك لەئەندامانی خێزانەکەتان سەری بەرزکردینەوە، ئێمە شانازی پێوەئەکەین، چونکە کەرامەتانی بۆ گێڕاینەوە، بڕۆ بەماڵەوە بڵێ کە براگەورەکەت، دکتۆر، زۆر خراپ لەعەلی حەیدەری داوە و جارێکی تر ناوێرێت خراپە لەگەڵ زیندانییەکان بکات، خێرا بڕۆرەوە بۆ مادن و خوا ئاگای لێت بێت).

کە گەیشتمە مادن هەواڵەکە وەك تەنینەوەی ئاگر لەناو پووشدا بەشارەکەدا بڵاوبووبووەوە، لەماڵی ئێمە هەمووان بیستبوویان و دڵخۆشی خۆیان دەرئەبڕی، بەڵام کەس وردەکارییەکانی بۆ باس نەکردبوون کە دواتر زانیم:

ڕۆژێکیان پێش ڕووداوەکە، عەلی حەیدەر هێرشی کردبووەسەر باوکم، هێنابوویە بەردەمی خۆی و ڕیشی ڕاکێشابوو و بەم وشانە سوکایەتیی پێکردبوو:

-(تۆ ئەو چڕوچاوەت کە لەپیرەمێردێکی ساداتی ئۆلۆمپ ئەچێت، وا دیارە هەمیشە تەحەدامان ئەکەیت، بەڵام پێت بڵێم لەدەستمان دەرناچیت و زوو بێت یان درەنگ، بەڵگە ئەدۆزینەوە کە کاری تێکدەرانەت کردووە و دوژمنایەتی نەتەوەی تورك ئەکەیت.)

باوکم وەڵامی ئەداتەوە:

-(گەر بەدوای ڕاستیدا ئەگەڕێن هیچ بەڵگەیەك نادۆزنەوە تاوانبارم بکات.)

-(بێدەنگ، کوردی بێقیمەتی پیس).

ئەمە ئەڵێت و ئەچێتە دەرەوە.

براکەم کەراهاتبوو باوکم بەڕێزەوە ببینێ کەپایە و ڕێزی خۆی هەیە لەناو خەڵکدا، لەم ڕەفتارەی عەلی حەیدەر زۆر تووڕە ئەبێت و بڕیارئەدات تۆڵەی لێبکاتەوە. بۆیە بەدوای

شتێکدا نەگەڕێت. شیشێکی ئاسنی دەستنەکەوێت و بڕیارئەدات گەر جارێکیتر ئەو ئەفسەرە بەرۆکی باوکمی گرت شیشەکە بکێشێت بەسەریدا.

شیشەکە ئەشارێتەوە، بەڵام هاوڕێ زیندانییەکانی ئەیدۆزنەوە و وای بەباش ئەزانن لێی بشارنەوە.

رۆژی دواتر کاتێک عەلی حەیدەر دێت، روونەکاتەوە باوکم و دەستنەکاتەوە بەدووبارەکردنەوەی هەمان شانۆگەریی پێشوو، لەوکاتەدا براکەم بەهێمنی لەریزەکە دێتە دەرەوە و بەدوای چەکەکەیدا ئەگەڕێت، بەڵام کاتێک شیشەکە نادۆزێتەوە تووڕەییەکی شێتانە ئەیگرێت، پەلاماری ئەفسەرەکە ئەدات و بۆکسێکی توند ئەکێشێت بەدەموچاویدا، لەئەنجامدا نێردراوەکەی مستەفا کەمال ئەکەوێت بەزەویدا، کاتێک زیندانییەکانی تر ئەم دیمەنە ئەبینن ئەکەونە شەق و بۆکسبارانی عەلی حەیدەر کە لەئەرزەکەدا کەوتبوو، پاسەوانەکانیش کە هەموویان کوردبوون و هەندێکیشیان مادنی بوون تا دواچرکە خۆیانبوارد و لەکۆتاییدا سەرۆکەکەیان لەمەرگێکی مسۆگەر رزگارکرد.

لەکاتی لێکۆڵینەوە لەو رووداوە، ئەو سەربازانەی بانگکرابوون بۆ شایەتیدان، بەرپرسیارێتی رووداوەکەیان خستەسەرشانی عەلی حەیدەر و بەجەلاد و دڕندە وەسفیان کرد. بەهۆی پشتیوانیی پاسەوانەکان و براکەشم بروسکەی نارد بۆ مستەفا کەمال و سەرۆکی پەرلەمان کەکاریگەریی باشیان هەبوو، عەلی حەیدەر سزادرا و دوایئەوە جارێکیتر سەردانی زیندانەکەی نەکردەوە.

دوای چەند مانگێك دادگەی سەربەخۆیی گەڕایەوە بۆ دیاربەکر، ئەم گۆڕانکارییە بووەهۆی ئەوەی گیراوەکان لەئەلعەزیزەوە بگوێزنەوە بۆ دیاربەکر، ئەمجارەیان پێشتر کات و رۆژی تێپەڕبوونی گیراوەکانمان بەمادندا ئەزانی، یەکێك بوو لەرۆژەکانی ناوەڕاستی مانگی تشرینی دووەم لەدەوروبەری نیوەڕۆدا. لەو رۆژەدا زۆربەی دانیشتوانی مادن بەپێ کەوتنەرێ بۆ پێشوازیکردنی کاروانەکە. کاتێک گەیشتنە بەرزایی ئاستی بێستانی

ئاوپرژێنەکان، ژەندرمەکان رێگریی خەڵکیان نەکرد لەبەرەوپێشچوون و تێیان گەیاندن کەکاروانەکە لای مەلەوانگە گەورەکەی باخەکە لائەدات.

ئەوکاتە من تەمەنم شەش ساڵ و نیوبوو، بەراکردن چووم بۆ ئەوێ تالەنزیکەوە بیانبینم و باوکم و کاکم رزگاربکەم، لەگەڵ نزیکبوونەوەی کاتەکە کۆمەڵێکی زۆر سەربازی سوارەی پڕچەك دەرکەوتن کە دەوری گالیسکەیەکی قورسی سەربەتاڵیان دابوو.

لەناو گێراو و دەستبەسەرەکاندا دەموچاوی باوکم ناسییەوە، بەهەموو هێزی خۆم کەوتمە بانگکردنی و دەست راوەشاندن:(بابە بابە) ئەو سەربازە تورکەی لەبەردەممدا وەستابوو فەرمانی پێکردم کە بێدەنگ بم: (ئەو جوڵەجوڵەمەکە ئەگینا کەلەپچە ئەکەمە دەستی تۆش)، بەبۆڵە بۆڵێکەوە ئەمەی پێوتم. دەموچاوی و تفەنگەکەی و شێوازی قسەکەی بێدەنگی کردم و کەوتمە هەنسکدان. کاتێك کاروانەکە نزیك بووەوە سەربازەکان جەماوەرەکەیان ئاگادارکردەوە لەگیراوەکان نزیك نەکەونەوە، و ماوەی چەند سەدمەترێك لێیانەوە دوور بوون، رێگەش بەمناڵەکان نەدرا بچن و دەستکەنەملی باوك و براو خزمەکانیان، هەروەها رێگە بەگیراوەکانیش نەدرا سەیری ئێمە بکەن، بەڵام ئەمە رێگرنەبوو لەوەی کە بیانبینین دوو دوو پێکەوە کەلەپچەکراوەتە دەستیان و زنجیرێکی درێژی پێوەیە کە ئەوسەرەکەی بەدەست یەکێك لەژەندرمەکانەوەیە. چوونە خوارەوە بۆ باخەکە بەرێگەیەکی باریکدا کە ئەچووەسەر حەوزەکە. سەربازەکان نەیانهێشت ژنەکان هەموو ئەو کەلوپەل و دیارییانەی هێنابوویان بۆ کەسوکارە گیراوەکانیان بیاندەنێ، بەبیانووی ئەوەی لەوانەیە شتی ترسناکیان تیا شاردرابێتەوە، تەنانەت خواردن و خواردنەوەشیان وەرنەگرت، جگە لەوانەی کە لەژێر چاودێری بەرێوەبەری ناوچە و فەرماندەیی ژەندرمەی ماددا ئامادەکرابوون، چونکە ئەوان جێی گومان نەبوون.

دوای کەمتر لەسەعاتێك فەرماندەی سەربازەکان فەرمانیدایە خەڵکەکە ئەوناوە چۆڵ بکەن و بچنەوە ماڵی خۆیان، سەربازەکان بەتوندی کەوتنەدوای ئەو کەسانەی کەللەرەقییان

کرد یا خۆیان دوائەخست و تەنانەت کەوتنە قامچیکاریی کردنی ئـەوژن و کـچانەی دڵیـان نەئەهات هاوسەرەکانیان و باوکیان جێبهێڵن. سەرەنجام خەڵکەکـە بەدڵـشکاویی و سـینەی پڕخەم و چاوی پڕفرمێسکەوە گەڕانەوە بۆ ماڵەوە.

دوای مانگێك دایکم گەڕایەوە بۆ مادن. بـەڵام تەندروسـتیی زۆرخراپتربووبـوو بـەهۆی شەکەتیی سەفەرەکەوە. بانگی کردم و سەیری سەرتاپای کردم و ماچیکردم وتی:

-(کوڕە بچکۆلەکەم دیارە بابەخی چاکیان پێداوی، زۆرشادمانم کە تەندروستیت باشـە، شکور نەدرەوشێیتەوە، دیارە خوشکەکەت شایەنی ئەو ئەرکـەبوو کـەتۆم بەئەمانـەت لای بەجێهێشتبوو، و تـەنیا هێنـدەم لەدەسـتێت سـوپاس و دەستخۆشـی لێبکـەم کـە ئاگـای لەهەموو شتەکان بووە).

بەحاڵ قـسەکانی تـەواوکردبوو کـە دەسـتی لەسەرسـەرم کەوتـەخوارەوە ودەموچـاوی عارەقی دەرداو ڕەنگی سپی بوو و کەوتەسەر ئەرزەکە. ئامۆژنم و خوشکە گەورەکەم و ئـەو ژنانەی تر کە هـاتبوون بـۆ بەخێرهاتنـەوەی بەپەلـە کەوتنـە شـێلانی دەسـت و قاچـی و دەوروبەری دڵی و وایان لێکرد هەوا هەڵمژێت، بەڵام تـا دوای سـەعاتێك نەهاتـەوە هـۆش خۆی.

کاتێك هۆشـی هاتـەوە، دایکـم بـەئارامی کەوتەگێڕانـەوەی ئـەوەی ئـەم بوورانەوەیـە ماوەیەکە دووبارە ئەبێتەوە و جارجـار ماوەکـەی درێژترئـەبێت و لـەهۆش خۆچوونەکەشـی توندترئەبێت، ئەم شەکەتییەی دایکـم هـەموومانی خـەمبارترکرد لـەوەی خۆمـان پێـشتر تیایدا ئەژیاین.

بەم شێوەیە و لەتامەزرۆیی و نیگەرانی و ترسـدا زسـتان و بـەهار تێپـەڕین، دەزگـای دادوەریی و پۆلیس کە هەردووکیان بەتەواوی بڕوایـان بـەبێتاوانی بـاوکم و براکـەم هـەبوو، فەرمانبـەرەکان کەوتنـەخۆ بـۆ ئـەوەی زۆرتـرین بـەرتیلمان لێـوەربگرن. بەمەبەسـتی

بەدەستهێنانی بڕێك پارەی زۆرتر، دایكم و خوشكەكەم و ئامۆژنم خشڵەكانیان فرۆشت و ناچاربووین دووجوانوو و دووئەسپیش بفرۆشین بۆ رزگاركردنی ژیانی باوكم و كاكم.

ماوە ماوە مستەفاكەمال هەندێك رێوشوێنی ئەگرتەبەر بۆ گۆڕینی دابونەریتەكان و بەخۆرئاواییكردنی توركیا. دوای ئەوەی تەربووش و تۆربانی قەدەغەكرد، لەسەركردنی شەپقە و سدارەی بەزۆر سەپاند. مستەفا كەمال بڕیاریدا بنەماكانی كۆمەڵی كورد بەتەواوی لەق بكات، ئەویش بەپەلاماردانی یەكێك لەنەریتە پیرۆزەكانی، و دیوەخانداریی قەدەغەكرد، بۆیە بەپەلە كەوتینە داخستنی دیوەخانەكەمان و بەڕێكردنی ئەو خزمەتكارانەی كاریان ئەكرد. دژایەتی كردنی بڕیارەكانی ئەنكەرە و مستەفاكەمال و هێشتنەوەی دیوەخانەكان قوربانیدانێكی گەورەئەبوو لەلایەن گەلی كوردەوە، بەتایبەت باری خێزانەكەی ئێمە رێی پێنەداین بڕیارێكی ئیمزاكراو لەلایەن مستەفاكەمالەوە پشتگوێ بخەین. ئەو كەسانەی وا ڕاهاتبوون كەلای ئێمە پەنایەك بدۆزنەوە، ئەم هەلگەڕانەوەیەی ئێمەیان پێ قبوڵ نەئەكراو زۆركەس كاتێك دەرگەی دیوەخانەكەمانیان بەداخراویی ئەبینی ئەم رەفتارەی ئێمەیان بەخیانەت دائەنا.

ئێستاش كاردانەوەی (كارك ئاغا)م دێتەوە بیر، كە یەكێك بوو لەپیاوماقوڵانی گوندی كریسوور. پیاوێكی ناسراوبوو بەئازایەتی و ململانێكانی لەگەڵ حكومەت. كە ئەهات بۆ مادن چەندین هەفتە لەدیوەخانەكەمان ئەمایەوە، پیاوێكی رێك و راست و ئازابوو. لەهەرزەكاریدا و لەكاتی یەكێك لەشەڕە زۆرەكانیدا گوللەیەك بەگەردنیدا تێپەڕێت و حەكیمێكی شارەزای ئەلعەزیز رزگاری ئەكات، بەڵام دوای ئەوە دەنگی گڕئەبێت و لەوەشەوە نازناوی (كارك ئاغا)ی لێئەنێن واتە ئاغای مل كورت- خۆی ناوی عیزەت بوو.

رۆژێكیان من لەبەردەم دیوەخانەكەدا یاریم ئەكرد بینیم كارك ئاغا پاڵ بەدەرگەی حەوشەی دیوەخانەكەوە ئەنێت كە رانەهاتبوو بەداخراوی ببینێت، زۆری پاڵنا، بەڵام دەرگە گەورە كۆنە لەدارگوێز دروستكراوەكە نەجوڵا و رێگەی نەدا بچێتە ژوورەوە، ئیتر ئاوڕێكی بۆ لای ئێمە دایەوە و منی لەناو منداڵەكاندا ناسییەوە و بانگی كردم:

-ئا..ئەفەندی بچکۆلە پێم بڵێ، ئەوە ئێرە کەسی لێنییە.

-نەخێر.

بەشڵەژاوی وەڵامم دایەوە.

-ئەی خزمەتکارەکان لێرەنین دەرگەکەمان لێبکەنەوە؟

-نەخێر لێرە نەماون؟

-لێرە نەماون، چۆن؟

-ئیزنماندان.

-بۆ هیچییان کردبوو؟

-نا..نەخێر، بەڵام بەپێی بڕیاری حکومەت دیوەخانەکەمان داخست.

-ئەوە چی ئـەڵێیت ئەفەنـدی؟! دیوەخانەکـەتان داخـست؟! واتـە پێـشوازی لـەمیوان ناکەن؟! بەڵام شتی وانابێت! دیارە شێت بوون؟!

-هەراسـان مەبـە کـارك ئاغـا، ئێمـە وامـان نـەکردووە، حکومـەت داوای ئـەوەی لێکردووین.

-مادەم خێزانەکەتان ئـەژین ئەگـەر خـواش داواتـان لێبکـات نابێـت دیوەخانەکـەتان داخەن، ئەمە لاوازییە، بگرە ترسنۆکییە.

پاشان بەتووڕەییەوە هاواری کرد:

-ئێستا دەرگەکە ئەشکێنم.

بەسنگە پانە بەهێزەکەی کەوتـە پاڵنـان بەدەرگەکـەوە، بەهـەموو هێـزی خـۆی پـاڵی پێوەئەنا و قوڵفە ئاسنەکەی بەرزکردبۆوە، بەڵام هەموو خۆماندووکردنەکەی بەباچوو، ئـاخر ئەو کارە دە پیاوی بەخۆی ئەویست تا ئەو دەرگە زلە بـشکێنن، کـە دەرگەیـەکی دێرینـی کەلتووریی بوو و دارتاشێکی ئەرمـەن لەدیاربـەکر دروسـتی کردبـوو. کـارك ئاغـا چـەند

خولەکێکی تریش هەر خەریکی دەرگەکە بوو، بەڵام کەزانی هەوڵەکانی بێهودەیە دەستی هەڵگرت و بەبۆڵەبۆڵەوە وتی:

-(ئەمە ترسنۆکییە، گەر یوسفە ئەفەندی ئازاد بوایە ملکەچی ئەم بڕیارە خراپەی نەنکەرە نەئەبوو، دیوەخانەکانمان ماڵی باوو باپیرانمانن و نابێت هەرگیز دابخرێن، وەك چۆن ماڵی خوا داناخرێت).

بەدەم ئەم قسانەوە کارك ئاغا دوورکەوتەوە. کاردانەوەکەی زۆر کاری تێکردم و ئیتر تاقەتی یاریم نەما لەگەڵ هاوڕێکانم. چووم و رووداوەکەم بۆ دایکم گێڕایەوە کە بەهێمنی گوێی لێگرتم پێشئەوەی دەستبکات بەگریان:

-(کارك ئاغا هەقێتی ئەو قسەیە بکات، بەڵام ئێمە لەمبارەیەوە هیچمان لەدەستنایەت، ئەبێت لەخوا بپاڕێینەوە سزای ئەو زاڵمانە بدات کە زوو یا درەنگ سزای پڕ بەپێستی خۆیان وەرئەگرن). بەدەم هەنسك و سڕینی فرمێسکەکانییەوە ئەم قسانەی ئەکرد.

کۆتایی بەهاربوو کە هێشتا زاڵمەکان هەر حوکمیان ئەکرد، هەواڵی خۆشمان پێگەیشت، لەئەنجامی ئەو پارە زۆرەی دایکم دابووی بەسەرۆکی دادگەی سەربەخۆیی و یاریدەدەرەکانی، پێیان وتین لەماوەیەکی کورتدا و بەشێوازێکی سادە و ئاسان چاو بەدادگایی باوکم و کاکم و مامم-دا ئەگێڕنەوە. هەروەها پێیان وتین کە هەرسێکیان بێتاوان دەرئەچن. لەدەوروبەری ناوەڕاستی حوزەیراندا وەك پیشەی هەمیشەیمان بارەگامان گواستەوە بۆ زەوییەکەمان، ئەو رۆژانە بەخێرایی تێپەڕین و لەسەرەتای هاویندا بەنیگەرانییەوە چاوەڕوانبووین. چەندین پرسیار بەمێشکمدا ئەهات و ئەچوو سەبارەت بەکاتی دادگاییەکە و بۆچی ئازادیان ناکەن؟ و کەی ئەیانبینین؟.

مـانگی حـوزەیران پڕبـوو لەپرسـیار. سـەرەنجام و لـە ١٠ی تـەمووزدا رەسـۆی بـرام بروسکەیەکی کرد کـە بـاوکم و کـاکم و مـامم بێتـاوان دەرچـوون و ئازادیـان کـردوون و دەوروبەری نیوەڕۆی ١٥ی تەمووز ئەگەنەوە مادن.

ئەو پێنج رۆژەی چاوەڕێمان کردن بـە ١٠٠ سـاڵ لێمـان رۆیـی. کـە بیرمـان ئـەکردەوە بەسەلامەت و ئازادیی ئەیانبینین دڵمان لەخۆشیدا تەپەتەپی ئەکرد و خەومان لێزڕابوو.

سـەر لەبـەیانی ١٥ی تـەمووز بـێ ئـەوەی کـەس ئاگاداربکەمـەوە سـواری جوانـووە سـپییەکەمان بـووم و رێـی دیاربـەکرم گرتەبـەر، لـەماوەی سـەعاتێکدا ١٥کـم لـەمادن دوورکەوتبوومەوە. کە کەسم نەبینی، راوەستام و بەدوای لەوەڕگەیەکدا ئەگەڕام بـۆ ئـەوەی جوانووەکە ماندوویی رێگەی بحەسێتەوە و بۆخۆی بلەوەڕێت. کانییەکی بچووکم بینی کە بۆ ئەوەی، بیگەمێ تەنیا پێویستم بەوەبوو بەبەرەوخوارەیەکدا تۆزێك بچمەخوارەوە تا بگەمـە سێبەری دارییەك کە بەشێوەیەکی سەیر لەبزنـە برسـییەکان رزگـاری بووبـوو. لەسـێبەری دارەکەدا دانیشتم و چاودێریی جوانووەکەم ئەکرد کەبەزەوقەوە لەگیا تەڕەکەدا ئەلەوەڕا.

گوێم لەدەنگی ئۆتۆمبیلێك بوو، لەشوێنەکەی خۆم هەڵبەزیمەوە، ئاوڕم بۆدایـەوە، بـەڵام لەپێچەکەدا ونبوو. دڵنیابووم کەباوکم لەناو ئەو ئۆتۆمبیلەدایـە، بۆیـە سـواری جوانووەکـە بـووم و بـەغار کەوتمـە دوای ئۆتۆمبیلەکـە کـە دوای ١٠ خولـەك راوەسـتا، و کەسـێکی لێدابەزی، بابەگیان بوو کە دوای ١٨ مانگ زیندان زۆر زۆرم بیرئەکرد، زۆربەگەرمی ماچـی کردم و سەیرم کرد چاوی پڕبووە لـەئاو و زۆر لـەخۆی ئـەکات کـە فرمێـسکەکانی نەیەتـە خوارەوە، باوکم بەخەمبارییەوە لێیپرسیم:

-ئەوە هەر بەتەنیا هاتوویت بۆ بینینمان؟

-بەڵێ بابە، چونکە دایکم لەترسی پێشوازییەکی جـەماوەریی کـە دەسـەڵاتداران لێـی نارازی بن هەواڵەکەی ئاشکرا نەکرد.

بەدەنگێکی نزمەوە ئەمەم پێوت.

-(ئا..بەڵێ) بەپێکەنینێکی چاوە بچووکە جوانەکانییەوە وەڵامی دامەوە.

لەوکاتەدا براکانیشم لەئۆتۆمبیلەکە دابەزین بۆ ماچکردنم، ماندوویی و شەکەتیی بەسیمایانەوە دیاربوو، سەرنجیشم دا رەسۆی برام زۆرماندووبوو، و دەموچاوە سپییە جوانەکەی ژاکابوو، چونکە بەدرێژایی ماوەی زیندانیی باوکم و کاکم، هەموو توانای خۆی خستبووەگەڕ بۆ یارمەتیدانیان و رزگارکردنیان لەمۆتەکەی مەرگ. ئەرکێکی لەوجۆرە بواری حەوانەوەی بۆ لاوێکی تەمەن ١٨ بەهار نەئەهێشتەوە.

رەسۆ داوای لێکردم لەشوێنی ئەو سواری ئۆتۆمبیلەکەببم، چونکە حەزی ئەکرد بەسواربوونی وڵاخەکە تۆزێك قاچەکانی بحەوێنێتەوە، ئەوەش گەورەترین هیوای من بوو، چونکە زۆرم حەزئەکرد لەگەڵ باوکم و کاکمدا بم. بەبێ دەنگ کەوتینە رێ . کاتێك گەیشتینە سەر رێی باخەکەمان لەپڕ خەڵکێکی زۆرمان تووش بوو کە لەباخەکانی دەوروبەرەوە بەهەڵەداوان هاتبوون. پرسیمان ئاخۆ چۆن بەگەیشتنی باوکم و کاکم و مامیان زانیوە! هەموویان بەژن و پیاوەوە کۆبووبوونەوە و جلوبەرگی رەنگاورەنگی تایبەت بەجەژنانیان لەبەرکردبوو و هاواریان ئەکرد:

-(بژی یوسفە ئەفەندی، بژی دکتۆر نافیز، بەخێربێنەوە.)

باوکم دەستی بۆ راتەوەشاندن و هەوڵی ئەدا تێیان بگەیەنێت کە ئەم خۆپیشاندانە لەکات و شوێنی گونجاوی خۆیدا نییە، بۆ ئێمەش و بۆ ئەوانیش باشتروایە کە بێدەنگ بن و بڵاوەی لێبکەن، بەڵام جۆش و خرۆشی جەماوەرەکە زیادی کرد و گەیشتە لوتکە کاتێك دوان لەدراوسێکانمان (یالیل) و (ماندووئاغا) خۆیانکرد بەناو جەماوەرەکەدا و یەکی بەرانێکیان بەدەستەوەبوو، یەکێکیان بەرەولای باوکم و ئەویتریان بەرەولای براکەم هات و کاتێك گەیشتینە نزیکی چەند مەترێك لێیانەوە ئاماژەیان بۆ ئەو دوو قەسابەکرد کە لەگەڵیان بوون، ئەوان ئامادەبوون هەردوو ئاژەڵەکە بکەنە قوربانیی (ئەوانەی لەپەتی سێدارە رزگاریان بوو). لەچاوتروکانێکدا دوو پیاوەکە دوو بەرانەکەیان دا بەزەویدا و یەکی

دووکێردی گەورەیان لەقایشە پانەکانی پشتیان دەرهێنـا و خـستیانە سـەرملی بەرانـەکان. رەنگی خوێن زەوییەکەی سوورکرد، دوای چەند لەقە فرتێیەك دووبەرانەکە رۆحیان دەرچوو. باوکم لەجیاتی ئەوەی بەم رێزلێنانە شـادمان بێـت، هەراسـان بـوو و ئـەم جـۆرە کارانـەی بەسیمای دڕندایەتی ئەزانی:

-(نابێ ئەم کارە بکەن) باوکم هاواریکرد، بەڵام جەماوەرەکە بڕوای وابوو بەم قوربانیانـە سوپاسی خوایان کردووە. شادمانی و هەڵهەلەکێشانی پیرەژنەکان دەربڕینی شـادمانیی بـوو بەم کۆبوونەوەیە کە ماوەیەکی درێژبوو رووی نەدابوو.

لەم ماوەیەدا دایکم بەتامەزرۆییەوە چـاوەڕوانی مێردەکـەی و کـوڕە خۆشەویـستەکەی نەکرد، تا ئەوکاتە گەیشتبووە سەرەتای گۆڕەپانەکـە. دایکـم و بـاوکم بەشـێوازی کـوردی دەستیان کردە ملی یەك، شانی یـەکتریـان مـاچ کـرد، بـەڵام دەسـت لەملانەکـەیان زۆری نەخایاند، چونکە دایکم پەلـەی بـوو کـەکوڕە نۆبەرەکـەی بگرێتـە ئـامێز و سـەری بنـێ بەسنگییەوە، بەگەرمی رووومەتی ماچ کردو بەکوڵ فرمێسکی ئەڕشت و وتی:

-ئۆه نافیز، نـافیز تـۆ زینـدوویت، لەنزیکمـەوەیت، ئـیتر لەمـەودوا هـەرگیز بـەجێم نەهێڵیت، چەند رۆژێکم ماوە لەم ژیانەدا بۆم پڕبکە لەشادمانی، رۆڵە لەناوماندا بمێنـەرەوە، لەمادن بمێنەرەوە.

-مەگری دایەگیان، مەگری، بـەوردی بـیری لێنەکەمـەوە و سـەیرئەکەم بـزانم ئـەتوانم لەمادن بمێنمەوە، بەهەرحاڵ دیاربەکر دوورنییە و سەرەڕای خراپـی رێگـە ئـەتوانم هـەردوو هەفتە جارێك سەردانت بکەم.

-(نا) دایکم لێیپاڕایەوە (ئەمەوێت هەموو رۆژێك لەپەنا خۆمدا بتبینم).

-باشە دایە، هێمن بەرەوە، رێم بدە فرمێـسکی ئـەو چـاوە جوانـە بـڕژانگ درێژانـەت بـسڕم، نامـەوێت ئـاوا خـەمبار بیـانبینم، چـونکە بـۆ پێکـەنین و پەخـشکردنی شـادی

دروستکراون نەك بۆ خەم و پەرۆشیی و تامەزرۆیی، با ئێستا بەپێکەنینەوە برۆین و ڕێبدەین زەمانە هەمووشتێك ڕێکبخات.

دایکم ئارام بووەوە و گەڕایەوە جیهانی بوون، چونکە ئەبوو سەرپەرشتیی چێشتخانەکە بکات و دڵنیابێت لەپێشوازیی چاك لەمیوانەکان، کەبە ژمارەی زۆرهاتبوون بۆ پیرۆزبایی لەخزمەکانمان کە زیاد لەساڵ و نیوێك لەزینداندا بوون. هەندێکیان بۆنەکەیان ئەقۆستەوە بۆ ئەوەی راوێژ بەکاکم بکەن لەبارەی نەخۆشییەکانیانەوە، و هەندێکیشیان تکایان لێدەکرد لەمادن نیشتەجێ بێت. میوانەکان لەهەموولایەکەوە ئەهاتن بەپێ یا بەسواری ئەسپ و کەر و ئێستر. بەلای منەوە هەلێکی زێڕین بوو بۆ هەڵبژاردنی ئەسپی پێشبڕکێ و بردنی بۆ سەر ڕێگە قیرتاوکراوەکە و غارپێکردنی، هاوڕێ بچووکەکانیشم لەباخەکانی دەوروبەرەوە بانگ ئەکرد بۆ بەشداریکردن لەم پێشبڕکێی ئەسپ سوارییەدا. هاتووچۆی میوانەکان دووهەفتە بەردەوامبوو، دوای ئەوەی کاکم رایگەیاند کە بەنیازە بگەڕێتەوە بۆ دیاربەکر، چونکە لەوێ کلینکێکی پزیشکی هەبوو و پۆستی پزیشکی فەرمیی شارەوانیشی هەبوو.

ژیانی سیاسیی لەوڵاتدا گۆڕا. لەژێر گوشاری هەندێك لەیاریدەدەرەکانیدا، مستەفا کەمال بڕیاری دا ڕژێمەکە بکاتە دیموکراسی و پەنای بۆ شێوازی تری جگە لەهێز برد بۆ بەتورککردنی کورد، و فەرمانی دا لە١٥/ ١١/١٩٢٧دا هەڵبژاردنی نوێ بکرێت بۆ شارەوانییەکان لەسەرتاسەری تورکیادا.

مادن بوو بەناوچە، و لەماوەیەکی زۆر کورتدا دەستیکرد بەرێکخستنەوەی وەبەرهێنانی مس، و قوتابخانە ناوخۆییەکە خرایە سەر قوتابخانە سەرەتاییەکەی کوڕان بەمەبەستی جێکردنەوەی کوڕانی گوندنشینە کوردەکان.

قوتابخانەکە بەشێك لەخوێندکارە شارییەکانی دەرکرد تا جێگەی خوێندکارانی دێهات ببێتەوە کە شوێنی مانەوە و خواردن و جلوبەرگ و خوێندنیان بەخۆڕایی بوو. ئەوانە کە هەرگیز یەك وشەی تورکییان نەبیستبوو، ئامانج لەم کارە ئەوەبوو فێری زمانی تورکییان

بکەن و ئایدۆلۆژیای (باڵادەستیی گەلی تورك) بخەنە مێشکیانەوە، بەڵام ئەم ئەزموونە لەچەند مانگێك زیاتر بەردەوام نەبوو، لەلایەکەوە لەبەر لاوازیی توانای دارایی و لەلایەکی ترەوە بەرپرسانی تورك ناچاربوون دان راستییەکەدا بنێن.

ئەم شێوازە چارەسەرێکی سەرکەوتوو نەبوو بۆ هەموو کێشەکانی تورك کە یەکێك لەئەرکەکانی سڕینەوەی گەلی کوردبوو بەشێوازێکی جادوویی. بەڵام ئەنجامەکانی بەدڵی بەرپرسان نەبوو و پێچەوانەی پێشبینییەکانیان بوو، سەرەڕای ئەوەی ئەو منداڵە بچووکانەی لەبەشی ناوخۆیی بوون بەخێرایی فێری زمانی توركی ئەبوون، بەڵام بەردەوام هەر بەزمانی کوردی قسەیان ئەکرد و مێشکداشۆرینی رۆژانە نەیتوانیبوو کاری تێبکات.

سەبارەت بەهەڵبژاردنەکانی شارەوانی و لەوکاتەوە کەسوکارمان بیستبوویان، هەموو هەوڵێکیان خستەگەڕ تا کاکم بگەیەننە سەرۆکایەتی شارەوانی مادن،کە لەژێر گوشاری خێزانەکەماندا خۆی کاندیدکرد، بەڵام هەر لەدیاربەکر نیشتەجێبوو، و بەشداریی هەڵمەتی هەڵبژاردنی نەکرد کە زۆر گەرم و گوڕبوو، چونکە دەوڵەت هەموو شێوازێکی گرتەبەر بۆ دژایەتیکردنی خۆکاندیدکردنەکەی. ئێوارەی ١٦ی تشرینی دووەم ئەنجامی کۆتایی هەڵبژاردنەکان راگەیەنرا و کاکم بەسەرۆکی شارەوانی هەڵبژێررا و پارتەکەمان زۆربەی هەرەزۆری کورسییەکانی ئەنجومەنی شارەوانی بردەوە. بارودۆخی دەرئەنجامی هەڵبژاردنەکە کاکمی خستەبەردەم راستییەکە و ناچاریکرد دیاربەکر بەجێبهێڵێ و بەپەلە بگەڕێتەوە بۆ مادن. دایکم زۆر شادمان بوو بەم رووداوە. نیوەڕۆیەکی مانگی تشرینی دووەم کاکم گەیشتەجێ، لەپڕێکدا لەخەوهەستاین، کچێکی رەشتاڵەی چوارشانە وەك درەختی سەروو لەبەردەمماندا وەستابوو و بەخۆشەویستییەوە سەیری ئەکردین.

لەو چیرۆکە میللیانەی کە پێش خەوتن زۆر گوێمان لێئەگرت، رۆڵی سەرەکیی کوڕە پاڵەوانێك یا کچە پاڵەوانێکی رەش بوو کە زۆربەی جار لەم چیرۆکانەدا نمونەی پاکی و

دڵسۆزیی و گوێڕایەڵی بوون، بەڵام هەرگیز بەراستی نەماندیبوون، بۆیە هەم سەرسامبووین هەم شاگەشکە، (عیفەت)ی خوشکم کە تەمەنی سێ ساڵبوو، بەنازەوە لێی پرسی:

-(تۆ کێیت؟ و لەکوێوە هاتوویت؟)

کچە گەنجە ڕەشەکە لەشوێنی خۆی وەستابوو، خەندەیەکی فراوانی کرد کە دووڕیزی جوانی ددانی سپی دەرخست و بەشەرمێکەوە وبەزاراوەیەکی تورکمانی لای دیارەبەکر وەڵامی دایەوە:

-ناوم برلانتە و لەدیارەبەکرەوە هاتووم

-دیارەبەکر ڕەشی وەك تۆی زۆر لێیە؟

-ئێمە ١٠ کەسی خێزانێکین، ئەڵێن گوایە بەرەچەڵەك خەڵکی سودانین.

-(ئەی لای ئێمە ئەمێنیتەوە؟) من لێم پرسی:

-من هەرگیز دکتۆر جێ ناهێڵم و هیوادارم بەدرێژایی ژیانم خزمەتی بکەم مادام ئەو ئەیەوێت لەخزمەتیدا بمێنمەوە، مـن مردبـووم و ئـەو زینـدووی کردمـەوە، و ئەگـەر لێـرە بمێنیتەوە شادمان ئەبم بەوەی ئاگام لەئێوەش بێت، من منداڵم زۆر خۆش ئەوێت.

برلانت حەزی ئەکرد درێژە بەقسەکانی بدات، بەڵام دادە گوڵچین هاتەژوورەکەمان، دەستی ژنێکی قەڵەوی گرتبوو کە تەمەنی لەدەوروبەری ٤٠ ساڵدابوو و دووچاوی گەورەی درەوشەداری پێوەبوو لەگەڵ دەموچاوێکی گونجاوی ڕێکوپێك و سیمایەکی پاکی سپی:

-ئەمە چێشتلێنەرەکەی کاکمە، ناوی (مەقبولە باجی)یە ئێستا من زۆرشـتی لـەبارەوە ئەزانم و ئەزانم پێشتان خۆشە کە بزانن یاپراخ و شۆربایەکی زۆرخۆش لێئەنێت.

مەقبولە زۆر خێرا سەلماندی کـە لەناسـتی ناوبانگەکەیدایـە، و دایکـم بەرپرسـیارێتی چێشتخانەکەی پێسپارد.کە ئەرکێکی ئاسان نەبوو لەگەڵ ئەو هەموو هاتوچۆ بێوەسـتانەی میوانـەکانمان، بـرلانتیش بـەهۆی بـەهێزیی و دانبـەخۆداگرتن و خـۆڕاگریی و سـوعبەتە خۆشەکانیەوە بووە نزیکترین هاوڕێم.

لەبەرئـەوەی کـاکم لەلایـەن میللەتـەوە بەسـەرۆکی شـارەوانی هەڵبـژێردرابوو، بۆیـە بەرپرسانیش بەبەڕێوەبەری نەخۆشخانەی مادن دایانمەزراند و دەستبەجێ کەوتە کـار. مـادن دۆخێکی نالەباری هەبوو، چونکە چالاکیی کانەکان بەتەواوی وەستابوو و دەوڵەت سـامانی ژێرزەوی وڵاتی خۆماڵی کردبوو و بەدوای ڕێگەکەیـدا ئەگـەڕا بـۆ وەبـەرهێنانی بەشـێوازی بنـەڕەتی و مـۆدێرن، و ئیدارەیـەکی پێکهێنـابوو بـۆ وەبـەرهێنانی مـس لـەمادن، بەسەرۆکایەتی ئەندازیارێکی کانـەکان،و لـەنێو ئـەو ئەنـدازیارە ئـەڵمانی و بەلژیکییانـەدا دەستنیشانیان کردبوو، کەدەوڵەت لەگـەڵیان ڕێککـەوتبوو بـۆ ئەنجامـدانی لێکۆڵینـەوەی پێویست.

لەچاوەڕوانیی دەستپێکردنی کارەکانـدا مـادن لـەدۆخێکی ئـابووریی سـەختدا بـوو، و لەبەشێکی زۆری دانیشتوانەکەی بێبەشبوو.

نافیز کەوتەخۆ بۆ دابینکردنی سەرچـاوەی دارایـی و پێکهێنـانی کـادری هونـەریی. و سوودیشی لەپشتیوانی والی وەرگرت کە ئەنکەرە ناردبووی بۆ مادن. ئەو پیـاوێکی بـاش و تێگەیشتوو بـوو و نیازپـاك بـوو و لەسـەر سـووربوونی ئـەو، وەزارەتـی دارایـی ڕازیبـوو بەپێشکەشکردنی یارمەتییەکی دارایـی گـەورە بەشـارەوانی شـارەکەمان بـۆ ئەنجامـدانی کارەبەپەلەکان، هەروەها لەگەڵ کرێکـارە خۆماڵییـەکان ڕێککـەوت و خـەڵکانی پـسپۆڕی هێنا بۆ کارەکانی سیڤلی و تەندروستی و ئاو. کـاکم پێـشنیازی کـرد شـارەکەمان سـوود لەکارەبا وەربگرێت، هەرچەندە زۆرشاری گرنگتر لەمادن هێشتا کارەبایـان نـەدیبوو، بـەڵام دەسەڵاتدارانی باڵا تێیانگەیاند کە تورکیا قوربانی ئەدات بەپارەی قورس و دەگمەنی خـۆی بۆ هێنانی کەلوپەلی ژیانیی تر.

نەخۆشخانە کۆنەکە بووبووە کەلاوەیەکی چـۆڵ، نـافیز کـاتێکی زۆری تـەرخانکرد بـۆ گـەڕان بـەدوای خانوویەکـدا کـە بگونجێـت وەك نەخۆشـخانە بـەکاربهێنرێت، سـەرئەنجام کوڕەکـەی قەدرییـە فەنـدی- ئـەو نیـشتمانپەروەرەی لەدیاربـەکر لەسـێدارەدرا- خـانووە

گەورەکەی خۆی کە پێکهاتبوو لەسێ قات بەخۆڕایی بەخشی تا بکرێتە نەخۆشخانە، کاکم یاریدەدەرێکی بۆ خۆی دۆزییەوە ئەویش برینپێچی مۆڵەتدار (کەماله لووت درێژ) بوو کە لوتی زۆر زلبوو، لەگەڵ (ئەلیف) ئەو بێوەژنە ئازایەی کە چەندین بەهرەی هەبوو و بووە پەرستار لەنەخۆشخانەکەدا، هەروەها لەگەڵ کوڕ و کچێکی گەنجیش کە خوێندنی سەرەتاییان تەواوکردبوو رێکەوت تا وەك دوو برینپێچی یاریدەدەر کاری لەگەڵ بکەن و لەکۆتاییشدا لەگەڵ (عەلی جەراح)ی عەریفی خانەنشین رێککەوت کە یاریدەدەری بێت لەچارەسەری لەجێچوون و شکانی ئێسقاندا.

عەلی کەسێکی دەگمەنبوو لەپیشەکەیدا، و زۆر شارەزابوو لەپێکهاتەی پەیکەرە ئێسکی مرۆڤدا، و سەرەڕای ئەوەی خوێندەوارییەکی زۆری نەبوو، بەڵام هەر هێندەی دەستی بخستایە سەرئەو ئێسقانەی ئازاری هەبوو یەکسەر ئەیزانی ئەو شوێنە درزی بردووە یا وردبووە یا دەرچووە و یا شکاوە و دوایئەوەی چارەسەرکردنی بەلای ئەوەوە وەك یاری منداڵان وابوو.

رۆژێکیان پێی راستم لەجێچوو، خستییەناو ئەڵقەی گوریسێکەوە و دارێکی پێوەکرد و بایدا تا پێم هاتەوە شوێنی خۆی، بەهەموو هێزی خۆم ئەمقیژاند، بەڵام دوای چەند سەعاتێك ئازار، هەستم بەحەوانەوە کرد. رۆژی دواتر ئاوساوییەکەی نەما و دوای سێ رۆژ کەوتمەوە راکردن و هەڵبەز و دابەز. هەندێك جاریش دەرمانی میللی بەکارئەهێنا، رۆژێکیان هەستم بەئازارکرد لەقوڵمدا کە ئێسقانەکەی درزی بردبوو، ئەویش ئامۆژگاری کردم مێوژی رەشی بێ ناوك لەگەڵ رۆنەکەرە تێکەڵاو بکەم و بیخەمە سەرشوێنی ئازارەکە، پارچەیەك قوماشی هێنا و ئەو گیراوەیەی لەسەر پانکردەوە و بەستی لەقوڵم، دوای دووڕۆژ بەتەواوی چاکبوومەوە.

هەرئەوەندە نا، ئەو رۆژەی سێبەندە (حەوز)ی شکاوی هاوڕێیەکانی چارەسەرکرد، ناوبانگی گەیشتە ناوچە دوورەکانی دەرەوەی سنووری مادن.

پاشنیوەڕۆیەك یاری چاوشارکێمان ئەکرد، مستەفا لەسەربانێکی دوومەتر بەرزەوە خۆی هەڵدا، لەبەرئەوەی زەوییەکە قوڕبوو قاچی هەڵخلیسکا و ئێسقانی لای راستی سێبەندەی پارچە پارچەبوو، منداڵەکە ویستیی هەستێت، بەڵام نەیتوانی خۆی هەڵگێڕایەوە و دەستیکرد بەگریان، ڕێبوارێك کە بەوێدا ئەڕۆی هەڵیگرت بیباتەوە بۆ ماڵەوە، کاتێك مستەفای بەرزکردەوە تا بیکاتە کۆڵی ئێمە لەشوێنی خۆمان ئەبلەق بووین، چونکە قاچی راستی شۆڕبووبووە خوارەوە وەك ئەوەی ئێسقانی تیانەبێت. مستەفا هەتیوێکی بێ دایك و باوك بوو، بەڵام ئازاو بەجەرگ بوو، عەریف عەلیمان بانگکرد و دوای سەیرکردنی شوێنی شکاوییەکە وتی:

-ئەمە زۆر ترسناکە، بەڵام دڵنیابن من چاکی ئەکەمەوە.

هەرواش بوو، عەلی بەڵێنەکەی هێنایەدی و دوای مانگێك مستەفا بەدارشەق هاتەوە بۆ قوتابخانە و دوای دوومانگ وازی لەدارشەقەکە هێنا و کەوتەوە ڕۆیشتن وەك ئەوەی هیچ روونەدابێ.

سەروەریی و شاکارەکانی عەلی جەراح زۆربوون و دانیشتوانی مادن شادمان بوون کە کاکم ئەم کارەی پێ سپاردووە.

سەرەڕای پیشەکەی و چالاکییە زۆرەکانی، نافیز خەونی بەوەوە ئەبینی کەبەهرە بێشومارە شاراوەکانی ناو گەلی کورد بدۆزێتەوە و یارمەتییان بدات لەپەرەپێدانی ئەو بەهرانەدا،جا ئەوکەسانە جەراح بن یا پیشەوەر یا مۆسیقار. بۆ ئەوەی ئەم خەونەی بێتەدی، هیچ هەلێکی لەدەست نەئەدا بۆ هەوڵدان بۆ خزمەتی گەل و وڵاتەکەی.

دوایئەوەی دڵنیابوو لەئامادەبوونی نەخۆشخانەکە و باش بەڕێوەچوونی کارەکانی، بڕیاریدا سەرچاوەکانی ئاو چاك بکات و دووبارە بنیاتیان بنێتەوە، و فەرمانیدا بەچاککردنەوەی ئەو چەند پردەی لەسەر رووبارەکە بوون لەبەشی خوارەوەی شارەکە، کەلەهەر ساتێکدا لەوەدابوو بڕوخێن. پردێکی نوێشی دروست کرد کە ئەندازیار و وەستا و

کرێکارەکـان بەگـەرمی و چـالاکیی کاریـان تێـداکرد، لـەو کاتـەدا حکومـەت بودجـە تەرخانکراوەکەی بڕی، دوایئەوە بەماوەیەکی کەم دۆخی بەڕێوەبـەرێتی شـارەکەی گـۆڕی و دووبارە شارەکەمانی کردەوە بەناوچـە(ناحیـە)و بـەفرمانێکی ئەنکـەرە پۆسـتی سـەرۆکی شارەوانی لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردراوی لەهەمووو ناوچە کوردییەکان هەڵوەشاندەوە، ئینجـا خوێندنگە ناوخۆییەکەی تـەرخانکرابوو بـۆ منـداڵانی جووتیـارانی گونـدەکانی دەوروبـەر، ئەویش داخرا.

سەرەتای هاوینی ١٩٢٨ کاکم مادنی بەجێهێشت تـا دووبـارە لەدیاربـەکر نیـشتەجێ ببێتەوە، ئەمەش گورزێکی تونـدبوو بـۆ مـادن و بۆخێزانەکـەمان بەگـشتی و بـۆ دایکـە نەخۆشەکەم بەتایبەتی. ئەو خۆشیی و چالاکییەی کـاکم دروسـتی کردبـوو، ئـەو خوانـەی لەماڵەوە رێکخرابوو و جموجۆڵی بێ راوەسـتانی میوانـەکان، توانیبـووی ئـازاری نەخۆشـی لەبیردایکم بەرێتەوە. لەراستیدا بوونی نـافیز لەنزیکییـەوە چـاکترین دەرمـان بـوو بۆئـەو، لەماوەی بـوونی نـافیز لەگـەڵمان نـەمانبینی دایکـم باسـی نەخۆشـییەکەی بکـات یـان ناهوناڵەی هەبێت، بەتەواوی لەهۆشخۆچوونەکەی نەما. بەڵام بەدبەختانـە، دوای رۆیـشتنی براکەم دۆخەکە بەپەلە گۆڕا، سەرەتا گریـان و فرمێـسك و پاشـان هەڵـچوون و گێـژبوون و وڕێنە و دڵ تێکهەڵهاتن و لەهۆشخۆچـوون کـە جاربـەجار ماوەکـەی زیـادی نـەکرد. بـرا دکتۆرەکەم لێرەنەبوو تاچارەسەری بکا و ئاگای لێبێت.

لەیەکێك لەنەخۆشییەکانیدا بەمۆڵەتێکی تایبەت داوای پزیـشکێکی ئـەڵمانیمان کـرد کە لەگەڵ ئەندازیار و تەکنیکییە ئەڵمانەکان لەکانەکانی مادن کاری ئەکرد، کاتێـك مـن و عیفـەتی خوشـکم بینیمـان بەرێگمیـەکی نـاو باخەکانـدا بـەرێوەبوو خۆمـان پێنـەگیرا و دەستمانکرد بەپێکەنین، چونکە جەستەی هێندە زل بوو کە ولاخەکـەی ژێـری شـاردبووەوە، قاچـی کـە نەیئـەتوانی بیخاتـەناو ئاوزەنگییەکانـەوە بەربووبوونـە خـوارەوە و خـەریکبوو لەئەرزەکـە ئەخـشان، بەشـێوەکی خـواروخێچ لەسـەر زینەکـە دانیـشتبوو و بەتونـدی

بەملاوئـەولادا ئەکـەوت، جارجـاریش بەلایەکـدا خوارئـەبووەوە وەك ئـەوەی هاوسـەنگی لەدەستدابێ و خەریکبێت بکەوێتەخوارەوە، و بەپەلە ولاخـچییەکەی لەگـەڵیبوو یارمـەتی ئەدا بۆ ئەوەی خۆی راستبکاتەوە.

بەپەلەچووین بۆ پێشوازیکردنی، تنۆکی عارەق دەموچاوە سـوورەکەی ئەبریـسکاندەوە، قژێکی مارۆنی کاڵ و دووچاوی شینی ئاسمانی پێوەبوو. رووخـۆش و قـسەخۆش دیـاربوو و بەپێکەنینەوە وەڵامی سڵاوەکەی داینەوە و کە بینی ئێمەش قژزەردین، بەئـەڵمانی قـسەی لەگەڵ کردین و لەبەرئەوەی هیچی لێتێنەگەیشتین بەتورکییەکی شکاو ئەمجارە لێیپرسین:

-ئێوە ئەڵمانین؟

-(نە.....نەخێر، ئێمە خەڵکی مادنین) عیفەتی خوشکم وەڵامی دایەوە.

-(باشە) دکتۆرە ئەڵمانییەکە وای وت،لەکاتێکدا بەسەر ولاخەکەیـەوە کـە نەیئـەتوانی کۆنترۆڵی بکات ئەلەریەوە، پاشان تەماشایەکی دەوروبەری کرد و بەشـێوەیەکی دلگیرانـەوە وتی:

-جوانە، ئەم باخانە جوانن، مرۆڤ نابێت لەم شوێنەدا نەخۆش بکەوێت.

-(بەڵێ، بەڵێ، هیواداربووم کە نەخۆش نەکەوتایـە.) عیفـەت وەڵامـی دایـەوە:(بـەڵام ئەوەتا دایکم نەخۆشە و ئازاری زۆرە و پێویستی بەیارمەتی تۆیە، تکایە خێرا بـچۆ ببینـە وچاکی بکەرەوە).

-(فەرمانەکەت لەسەرسەرم). کابرای بێگانە کەئەبلەق بوویـوو لەشـێوازی قـسەکردنی خوشکەکەم کە لەیەك کاتدا هەم فەرماندەرانەبوو هەم تکارانە،وەڵامی دایەوە.

کاتێك گەیشتینە بەردەم ماڵەکە و هەوا سازگەرەکەی حەوزە سێبەردارەکەی هەڵمـژی، هاوارێکی بـەرزی دڵبەنـدیی لێبـەرزبووەوە. دایکـم لەسـەر قەرەوێڵەیـەك لەهەیوانەکـەدا پاڵکەوتبوو کە جۆگەیەکی ئاوی پیائەڕۆیشت لەکانییەکەوە بۆسەر حەوزەکە. پزیشکەکە بـۆ ساتێك بەدوودڵیی لەقەراغی حەوزەکەدا وەستابوو، و چاوێکی بەپەلـەی گێـڕا، دوایئـەوەی

بەشەرمەوە سڵاوی لەدایکم کرد، قۆڵی گرت و بۆ ماوەیەکی درێژ پشکنینی بۆ کرد و بەزاراوەیەکی تورکی کە تێگەیشتنی زەحمەتبوو چەندین پرسیاری لەدایکم کرد، لەکۆتاییدا رەچەتەیەکی دەرمانی بۆ نووسی. ئەبوو دەرمانەکان لەدیاربەکرەوە بهێنرێت چونکە ئەوکاتە مادن دەرمانخانەی لێنەبوو.

دوای سێ رۆژ دەرمانەکانمان بەدەستگەیشت و دایکم بەپێی رێنمایی پزیشکە نەورووپییەکە دەرمانەکانی ئەخوارد، ئەم دەرمانانە کاریگەرییەکی وای لەسەر دایکم نەبوو، بەڵکو تەندروستی خراپتربوو، و تەنیا خواردنێکی زۆر کەمی ئەخوارد، و حەزیئەکرد گۆشەگیربێت و زۆریش تامەزرۆیی دەرئەبڕی بۆ بینینی کوڕە گەورەکەی کە ئەوکاتە سەرگەرمی ئەو کێشانەبوو کەلەکاتی دووبارە نیشتەجێبوونەوەی لەدیاربەکر رووبەڕوویان بوبووەوە و بواری بەجێهێشتنی دیاربەکریان نەئەدایە. بەلای بەرپرسانی تورکەوە کەسێك بوو حەزیان لەچارەی نەئەکرد، بەلای ئەو پزیشکانەشەوە کە جارجار ئەهاتن تا لەدیاربەکر جێگیربن کۆسپێك بوو کە ئەبوو بەسەریدا سەرکەون.

جگە لەکوڕە گەورەکەی، دایکم دڵی بەجاجۆ خۆشبوو کە ئەیزانی چۆن بەدڵسۆزیی و لەخۆبردوویییەوە خزمەتی بکات و ئەمەی لەمنداڵەکانی تری و خوشکەکەیدا نەئەبینییەوە. بۆ قەرەبووکردنەوەشی، پێش مردنی وەسیەتی کرد، چی خشڵی ماوە بدرێت بەجاجو، خوشکە گەورەکەم ئەمەی پێناخۆش بوو و هەر کەلەلایەن یەکێك لەئەندامانی خێزانەکەمانەوە باس ئەکرا ئەو یەکسەر تووڕەئەبوو. دایکیشم بەدەنگێکی لاوازەوە سەرکۆنەی ئەکرد:

-هیچ هۆیەك نییە تا ئیرەیی پێبەریت، ئەبێت تێبگەیت کە ئەو کچە لەوەی من بۆم بەجێهێشتووە زیاتری شایانە و هیوادارم لەکاتی شووکردنیدا باوکت شادمانی بکات و جیازییەکی گونجاوی شایانی پلەوپایەی خۆی بۆ دابین بکات، ئەویش وەك تۆ یەکێکە لەخێزانەکەمان.

دایکم بەردەوام ئەمەی دووبارە ئەکردەوە و تووڕەش بوو لەهەڵوێستی گوڵشینی خوشکم کە جارجار حەزینەکرد رقەبەرایەتی بکات.

لەراستیدا دایکم بەرامبەر بەگوڵشین زۆر توندبوو، و چاوەڕێی ئەوەی لێئەکرد کە خانەخوێیەکی باش بێت، چێشتلێنەرێکی باش بێت، بەرگدرووبێت، خووری بچنێت، نەخش و نیگار بزانێت، موزیککارێکی شارەزا و ژنێکی رۆشنبیربێت و لەئەنجامی ئەو هەموو جۆرە چالاکییەی ئەو خوشکە هەژارەمان ئەنجامی ئەدا، نازناوی هاوسەری نمونەیی ئایندەی پێبەخشرا، بەڵام لەبواری مۆسیقادا هیچ فێرنەبوو، ئەوەش کارەساتە، چونکە دایکم دەیان مۆسیقاری لەچاکترین مامۆستاکانی ناوچەکە لەکورد و تورك و ئەرمەن و یۆنانی ئەهێنایە ماڵەوە، بەڵام پێشکەوتنێکی جێی رەزامەندیی دایکمی بەدەست نەئەهێنا، چ لەئامێری کەمان یا ئامێری عود. هەرجارێك دایکم حەزی ئەکرد گوێ لەیەکێك لەپارچە مۆسیقا خۆشەکانی بگرێت، تووشی نائومێدی ئەبوو و تووڕەئەبوو و سەرکۆنەی گوڵشینی ئەکرد،ئەویش ئەیوت:

-پێویست ناکات بەردەوام سەرکۆنەم بکەیت، چونکە من بۆ مۆسیقا دروست نەبووم، و توانای فێربوونم نییە.

دایکم هێند نەژیا تا کچە گەورەکەی ببینێت کە بووەتە مۆسیقارێکی بەتوانای ئامێری کەمانچە و بەشداری زەماوەندی منداڵەکانی بکات.

بەدرێژایی هاوین تەندروستی دایکم خراپترئەبوو و دۆخی ترسناکترئەبوو، و تووشی لەهۆشخۆچوونی توندئەبوو کە چەندین سەعاتی ئەخایاند و لەو ماوەیەدا خێزانەکەمان ئەکەوتە کەشێکی ناخۆشی ترس و نیگەرانییەوە، تەنانەت لەدوورترین شوێنی باخەکەماندا نەمانئەوێرا دەنگ بەرزبکەینەوە لەترسی ئەوەی نەبادا ئازیزە نەخۆشەکەمان ئازار بچێژێت، و ئەو هەستی خۆشەویستی و رێزەی بەرامبەری هەمانە بڕوشێ.

ئەوساڵە بەبێدەنگیی بەرهەمی ترێمان چنییەوە و بەخێرایی ئازووقەی زستانمان لەخواردنە میللییەکان ئامادەکرد، لەناوەڕاستی ئەیلولدا باخەکەمان بەجێهێشت بەرەو مادن، و لەسەرتەختەبەندێك دایکمان بەئاگاییەوە گواستەوە.

سەرلەبەیانی ٢٨ی ئەیلول تەندروستی دایکم نیگەرانکەربوو، منداڵەکان لەماڵەوە مانەوە، بروسکەیەکمان نارد بۆ کاکم کە هەرچی زووترە بگەڕێتەوە بەڵام ئەو لەشوێنێکی زۆردوور لەدیاربەکر، بەلای نەخۆشێکەوەبوو کە مەحاڵبوو بتوانێت بگاتە مادن. جارێکی تر پزیشکە ئەڵمانییەکە هاتەوە بۆپشکنینی دایکم، نیگاکانی پەرۆشانەو غەمباربوو، دەرزییەکی لەجانتاکەی دەرهێنا و پاکیکردەوە و سەری شووشەکەی شکاند و دەرمانەکەی لێڕاکێشا و بەهێواشی دەرزییەکەی کرد بەقوڵی دایکمدا کە وەك شیر سپی بوو، دوای ئەوە دەرزییەکی دا لەماسولکەی قاچی. دوای چەند خولەکێك دایکم چاوی کردەوە و نوقاندییەوە و بەهەناسەیەکی قووڵەوە وتی:

-ئاه، نافیز، نافیز.....

چاوی بەنووقاوییەوە هێشتەوە بۆئەوەی شادییەکەی زیاتربێت، بەو بڕوایەی کە ئەوکەسەی قسەی لەگەڵ نەکات کوڕە خۆشەویستەکەیەتی:

-سوپاس، کەهاتیت. چەند شادمانم بەبینینت و قسەکردن لەگەڵت، ئەمەوێت لەئامێزت بگرم پێشئەوەی ئەم جیهانە بەجێبهێڵم، لێم نزیکبەرەوە بادەست بەسەرتدا بهێنم وەك جاران کە منداڵبوویت، دێتەوە بیرم چەند حەزت لەوەبوو دەستبهێنم بەقژتدا، جارێکیان لەناو جێگەدابووین هەر هێندەی دەستم هێنا بەسەرتدا یەکسەر خەوت لێکەوت، وەرە پێشەوە لێم نزیکبەرەوە).

کە کەس وەڵامی نەدایەوە، دایکم زۆر بەزەحمەت سەری بەرزکردەوە و بەچاوە بەقووڵاچووەکانییەوە سەیری دەوروبەری خۆی کرد، کاتێك پزیشکە ئەڵمانییەکەی بینیی،

زۆر پەشۆکا و زمانی تەتەڵەی کرد لـەداوای لێبـووردن و سوپاسـکردن و سـەری کەوتـەوە سەرپشتییەکە. پزیشکە ئەڵمانییەکەش شڵەژا و کەوتە دڵدانەوەی دایکم:

-خانم، کوڕەکەت هاوڕێمە و لەدۆخێکدایە کـە ناتوانێـت بێـت و لـەلات بێـت، داوای لەمن کرد لەجیاتی ئەو بێم و ئاگام لێت بێت، هەموو ئەو زانستە نـوێی پزیـشکییەی ڕێـم پێئەدات بۆم ئـەنجام داویـت، ئـەوەی ئێـستا داوات لێدەکـەم ئەوەیـە کـە خـۆت نـەدەیت بەدەستەوە، با ورەت بەرزبێت هەمووشتێك باش ئەبێت، ئەشبینیت.

سەردان و ڕێنماییەکانی پزیـشکە ئەڵمانییەکـە کاریگەریـیەکی باشـی هـەبوو لەسـەر تەندروستی دایکم، چەند ڕۆژێك بوو هیچی نەخواردبوو، ئـەو ڕۆژە بەتامەزرۆیـیەوە بـرنج و ماست و مرەبای سێوی خوارد، دۆخی باش بوو، تەنانـەت کەوتـە گاڵتـە لەگـەڵ ئەوانـەی دەوروبەری.

سەعات ١ی پاشنیوەڕۆ وەك ئەوەی بخـەوێت، داوای کـرد بەتـەنیا جێـی بهـێڵین، مـن بـەهێمنی لـەنزیکی مامـەوەو سـەیری فەرهـەنگێکی منـداڵانم ئـەکرد کـە دۆسـتێکی خێزانەکەمان ناردبووی. سەعات دوو دایکم لەپڕ هەسـتا و بەهەڵـچوونێکی نائاسـاییەوە و بەگریانەوە کەوتە وڕێنە:

-مەرگ...مەرگ، ئەوەتا لەسەر دۆلابەکەیە بەرامبەرم.

پاشان دەستی درێژکرد بەئاراسـتەی دۆلابەکـە و دەسـتیکرد بەقـسەکردن وەك ئـەوەی لەگەڵ شتێکی زیندوو قسەبکات:

-نا...ئێستا مەیە، مۆڵەتم بەرێ منداڵەکانم ببینم بەتایبەت نافیز.

بەسووربوونەوە لێی پاڕایەوە... کە ئەمەم بینی بەڕاکردن و هاوارەوە چوومە دەرەوە:

-(گوڵشین، عیفەت، جاجو، ئامۆژن، هەمووتان بەپەلە وەرن حاڵی دایکم زۆر خراپـە) و بێئەوەی چاوەڕێی کەس بکەم گەڕامەوە بۆ لای جێگەکەی دایکم، هەندێك قسەی نـاڕوونی ئەکرد.

-(دایه...دایه) بەهەموو هێزم هاوارمکرد. بەڵام گوێی لەبانگکردنەکەم نەبوو، سەیرم کرد دەمی بەتەواوەتی کردۆتەوە وەك چۆلەکەیەکی زامدار، سێ جار بەشێوەیەکی بیستراو هەناسەی دا و ناوی کورەگەورەکەی دوبارەئەکردەوە:

-(نافیز...نافیز...نافیز)، پاشان لەجوولەکەوت.

خۆمدا بەسەر ملیدا و بەگریانەوە کەوتمە هاوار:

-(نا....نا دایە، مەڕۆ بەجێمان مەهێڵە، دایە لەلامان بمێنەرەوە).

نازانم چەندە بەو شێوەیە لەباوەشی دایکمدا مامەوە کە مردبوو، بەڵام دێتەوە بیرم کە دوودەستی بەهێز هەڵیانگرتم و دەنگێکیش پێی وتم:

-گەر بەم شێوەیە بمێنیتەوە نەخۆش ئەکەویت، سەیرکە منداڵەکان چاوەڕێتن تا یاریت لەگەڵ بکەن، بڕۆ بۆ لایان و بیر لەهیچ مەکەرەوە.

لەجیاتی ئەوەی گوێڕایەڵی جاجو بم رامکرد و باوکمم لەدیوەخانەکە بینی:

-(بابە...بابە) هاوارم لێکرد(دایکمم لەدەستچوو و هەتیو کەوتم).

بەم قسانە باوکم دایە پڕمەی گریان و وتی:

-ئای خوایە ئەگەر دایکت مردبێت، ئەوە لەراستیدا منم کە هەتیوکەوتم و بێنومێدبووم.

ئەوە یەکێك بوو لەو جارە دەگمەنانەی باوکم قسەم ئاراستە بکات، پاشان بێ ئەوەی بایەخم پێبدات بەپەلە روویکردە ماڵەوە و بەدەم راکێشانی ریشی و سنگکوتانەوە ئەیوت:

-ئای خوایە، من سەرم لێشێوا ماڵم وێران بوو. مونمینە کۆڵەکەی ماڵەکەم بوو. لێت ئەپاڕێمەوە خوایە بەجێم مەهێڵە...یارمەتیم بدە و دەستبدەرە باڵم.

لەبەرامبەر ئەم کاردانەوەیەی باوکمدا بەتەواویی ئەبلەق بووم، خۆم بەگوناهبار ئەزانی کەئەو هەواڵە ناخۆشەم پێوتووە، ئەگەر باوکم ئەو پیاوە توندو سەرسەختە، بەم شێوەیە بەبیستنی هەواڵی مەرگی ژنەکەی ئاوا خەمبار و تێکشاوبێت، دیارە بەشێوەیەکی شێتانە

خۆشی ویستووه، لاشعوری بەشی خۆمم لەکارەساتەکە بیرچووەوە و دەستم گرت و بەپەشۆکانەوە وتم:

-(بەتەنیا نابیت بابە، ئێمەت لەگەڵ ئەبین، گوڵشین بەچاکی ئاگای لەماڵەکە ئەبێت، لەم ساڵانەی دواییدا کە دایکم نەخۆشبوو ئەو ئاگای لەهەمووشتێك بوو، ئینجا ئەوە ئامۆژنم و جاجوش لێرەن).بەردەوام بووم لەقسەکانم، کاتێك باوکم گەرمایی قسەکانی پێگەیشت و بۆ ساتێك وەستا، بەدووچاوەوە کە پەردەیەك لەفرمێسك بەریان گرتبوو سەیرێکی کردم، بەرەو لام دانەوییەوە و ناوچاوانی ماچکردم و وتی:

-کورِم ئەو قسانەی لەدەمی تۆ هاتنە دەرەوە داناین، من هەستم لەگەڵ خۆی بردمی و تۆ هێنامەوە ناو واقیعەکە، بەڵێ ئەو ژنێکی دەگمەن بوو، ئێمەش لەبەرامبەر قەدەردا هیچمان پێ ناکرێت، ئەبێت ژیان بەردەوام بێت، باوا بکەین بەخاکسپاردنەکەی شایستەبێت و یادەوەرییەکانی لەدڵماندا بەزیندوویی بمێنێتەوە.

بەو شێوەیە لەبەردەرگاکەدا بەجێی هێشتم و بەهەنگاوی خێرا سەرکەوت بۆ ژوورەکەی خوالێخۆشبوو و دوای کەمێك هاتەخوارەوە، جەمالی بانگکرد و داوای لێکرد بچێت بەدوای پزیشکێکی شەرعیدا.

دوایئەوە بەماوەیەکی کەم دووژنی مردووشۆر هاتن، پاشان تابووتەکەی دایکمیان بردە دیوەخان و، لەهۆڵە گەورەکەدا لەسەر مێزێك دایاننا، دە قورئانخوێن بەدرێژایی شەو و تا نزیکی نیوەڕۆی رۆژی دواتر قورئانیان بەسەردا خوێند.

لەوکاتەدا خەڵکێکی زۆر لەدەرەوە و ناو دیوەخانەکەدا کۆبوونەوە. لەوکاتەوەی جاجو منی لەژوورەکەی خوالێخۆشبو هێنایە دەرەوە ئیتر رێیان نەدام تەرمی دایکم ببینم، لەگەڵ ئەوەشدا پێشنەوەی تابووتەکە لەسەر مێزەکە هەڵگرن و بەرەو گۆڕستانی بەرن توانیم لێی نزیکببمەوە و دوا ماڵئاوایی لێبکەم، خزمەتکارەکان دووریانخستمەوە و بردیانم بۆ ماڵەوە، لەیەکێ لەپەنجەرەکانی ماڵەکەمانەوە تابوتکەییم بینی دەستاو دەستی ئەکرد لەسەرشانی

ئەوانەی هەوڵیانئەدا رێـز لەکۆچـکردوو وخێزانەکـەی بگـرن و خـواش پاداشـتیان بداتـەوە بەملکەچبوون بۆ فەرمانەکانی ئاین و دابونـەریت. کاروانەکـە کـە لەشـەپۆلی دەریایـەکی هەڵچوونەچوو، لەگۆشەی شەقامەکەدا لەبەرچاو ونبوو، ئەم قەرەباڵغییـە تـەرمی ژنێکیـان هەڵگرتبوو کە گەیشتبووە ٥٤ سـاڵەی تەمـەنی و خۆشەویـست و رێزداریـوو لای تـەواوی خەڵکی شار. لەگەڵ دیارنەمانی تابووتەکە گریانی بێدەنگی ژنـان و کـچان و منـداڵان کـە لەماڵەوە کۆبووبوونەوە گۆڕا بۆ شین و شەپۆڕێکی دڵتەزێن.

هەرچەندە گۆڕستانە نوێیەکە تەنیا چەند سەدمەترێك دووربوو، بەڵام ئەوانەی دایکمیـان برد بۆ دوا ئارامگەی تا پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ نەگەڕانەوە، و دوای ئـەوە هـاتنی خـەڵك بۆ سەرەخۆشی دەستیپێکرد. لەماوەی هەفتەیەکدا و بـەپێی داب و نـەریتی کـوردەواریی، خزمەکانمان و دراوسێکانمان خواردنیان بۆ ئەهێنایین، خـواردنی گرانبـەهایان لەسـەر سـینی گەورەی مس کە سەرپۆشێکی درابوو بەسەردا لەقاپ و دەوری مسدا دائەنا و لەگەڵ نـان و چەقۆ و چنگاڵ و کەوچـك و خواردنـەوەی بـێ ئـەلکهول بەتایبـەت ماسـتاو، بـەیانیان و نیوەڕوان و ئێواران ئەهێنرا بۆ ماڵەکەمان.

دوای کۆچی دایکم، باوکم زیاتر بەخۆیدا داخراو زۆر هەستیاربوو بەرامبـەر نەهامـەتیی خەڵکانی تر و خەمی سەرەکی، بوو بەدۆزینەوەی ئـەو خێزانانـەی هـەژارن تـا یارمـەتییان بدات، شەوانە بەتوورەکە نارد و پەتاتە و فاسۆلیای لەبەردەمی دەرگاکەیاندا دائـەنا و دڵـی پڕنەکردن لەخۆشی وهیوا. زۆرجار ئێمەی بێبەشئەکرد لەو شـتانەی پێـی راهـاتبووین وەك، مێوژ و هەنجیری وشك بۆ ئەوەی بیداتە نەدارانی ناوچەکە. رۆژێکیـان کـە تامـەزرۆی ئـەو جۆرە خواردنانەبووم قیروسیام کرد و سەرنجی باوکم بۆ ئەم شتە راکێشا:

-لەقوتابخانە هاوڕێکانم هەروەك ساڵانی تر مێوژی وشك ئەخۆن، نازانم بۆ ئـەم زسـتانە ئێمە لەماڵەوە نیمانە؟

باوکم بەنیگایەکی توورەی ترسناکەوە وەڵامی دامەوە:

-کووپــەکانی ســاردخانەکە پــڕن لــەجۆرەها خــواردنی بــەتام و بەســوود. واز لــەم خۆپەرستییەت بهێنە، بیر لەو منداڵانە بکــەرەوە کــە هــیچ شــیرینییەکیان دەســتناکەوێت بیخەنە دەمیانەوە، ترێ و هەنجیری ئەمساڵی زەوییەکانمان لەگوندی کاڵجە بەشــی هــەزاران بوو. بڕۆ و جارێکی تر نەیبیت و گلەیی لەم شتە قۆڕانە بکەیت.

ئــەم وشــانە و ئــەو شــێوازە ئــارام و ترســناکەی بــاوکم قــسەی پێکــرد لەگەڵمــدا، سەربەرەوخوار قلێی کردمەوە، بەرادەیەك کە پەنام بردە بەرباوەشی خوشکە گەورەکــەم کــە ئیتر بووبووە خانمی ماڵەکە، ئەویش پێی وتم:

-(لەبەرئەوەی تۆ دوا منداڵی، بۆیە وەك ئەمانــەتێك دایكمــان بەئێمــەی ســپاردوویت، هەمووشتێك ئەکەم بۆئەوەی پێویــستت بەســۆزنەبێت و لەژیانــدا بەختــەوەربیت).بــەردەوام ئەم قسەیەی ئــەدا بەگوێمــدا. لەراســتیدا گوڵــشین بەڵێنەکــەی جێبــەجێ کــرد، لــەماوەی ساڵێکدا خۆشترین رۆژەکانی ژیــانی منــداڵیم بەســەربرد، سەرپەرشــتیی ئــەو بــۆ مــن زۆر گونجاوبوو، تەنانەت لەتەمەنی ۱۰ ساڵیدا بڕوانامەی خوێندنی سەرەتاییم وەرگرت و ئــەبوو بۆ خوێندنی ناوەندی و بچمە دیاربەکر، چونکە مادن ناوەندیی لێنەبوو.

رۆژێکیــان بەگریانــەوە لــەباوکم و خوشــك و براکــانم و جــاجۆ و جــەمال و کەرەکــەم و ئەسپەکەم و هاوڕێکانم و مادن بەشاخ و رووبارەکانییەوە جیابوومەوە تابچم بــۆ دیاربــەکر و لەوێ لەگەڵ براکەم بژیم.

لەماوەی مانەوەمدا لەو شارە کەماوەیەکی کورتی ۹ مانگی خایاند، گەلێك یــادەوەری تاریکم هەڵگرتووە لەگــەڵ هەنــدێك تروســکایی روونــاکیی کورتخایــەن. دیمــەنی دیاربــەکر خەمباربوو و منیش لەناو شورا بەرزە مێژووییەکەیدا گیرم خواردبوو. رێگــەکانی تەســك و پێچاوپێچ بوون و خانووەکانی لەبەردی بازلتی رەش دروستکرابوون و حەوشەی ماڵــەکانیش هەر بەو بەردە رەشە بەردرێژ کرابوون. ئەو قوتابخانەیەی من بۆی ئەچــووم کــەوتبووە نێــوان هەندێك خانووی دەرەوەی شار، لەنێوان قوتابخانەی میریی و تەنیا نەخۆشخانەی شــارەکەدا.

ئەو سێ خانووە لەنزیکی ئەو خەرەندەوە بوون کە لەقەراغەکەیەوە رووباری دیجلەم لەخوارەوە ئەبینی.

لەدووری چەند سەدمەترێکەوە قوتابخانەکە لەتەلارێکی خەیاڵی ئەچوو، چونکە بەپێچەوانەی خانووەکانی ترەوە رەنگی سپی بوو و سەقفەکەی گەچی سووربوو، بەڵام کەشێکی ماتەم باڵی بەسەر قوتابخانەکەدا کێشابوو، چونکە ئاڵۆزیی نێوان منداڵانی فەرمانبەرە تورکەکان و خوێندکارەکانی تری خەڵکی دیاربەکر و دەوروبەری، زۆر توندبوو، و بەڕێوەبەرێتی قوتابخانەکەش خوێندکارەکانی خستبووە ژێر سیاسەتی بەتورککردنەوە، بەتەواوی وتنی وشەی کورد و قسەکردن بەزمانی کوردی یاساغ کردبوو. رۆژێکیان خوێندکارێکی پۆلی سێ لەکاتی بەکوردیی قسەکردندا گیراو بەڕێوەبەر بانگی کرد بۆ ژوورەکەی خۆی و پێی وت:

-ئەرێ کەس پێی نەوتویت کەلەتورکیا نابێت مرۆڤ جگە لەزمانی تورکی بەزمانێکی تر قسەبکات و بەکارهێنانی هەموو زمانەکانی تر قەدەغەیە و سزای قورسی بەدواوەیە؟

خوێندکارەکە کە ناوی (بەحری) بوو وەڵامی دایەوە:

-ئەوە ئەزانم، بەڵام کوردی زمانی دایکمە و هیچ هێزێك لەجیهاندا ناتوانێت بمهێنێتە سەر ئەوبڕوایەی بەکاری نەهێنم، ئەمە لەمن بەهێزترە، بۆیە قانونەکانی قەدەغەکردن ناتوانێت لەم بوارەدا هیچ شتێك بکات.

دوای کۆبوونەوەیەکی بەپەلە، دەستەی دیسپلینی قوتابخانەکە بڕیاریدا یەکسەر بەحری دەربکرێت. لەناو مامۆستاکاندا تیایاندابوو کە بەرەچەڵەك کورد بوو کەچی بۆچوونێکی وایان لەقوتابخانەکەدا دروستکردبوو کە لەتورك تورکترن.

بەلای منەوە باشترین مامۆستا، مامۆستا پیرەکەی وانەی مێژوو بوو، کە بەشارەزایی و بەزاراوەیەکی تورکمانی دیاربەکرەوە باسی بەسەرهاتی ئاشوورییەکان و فارسەکان و گەلە کۆنەکانی تری بۆ ئەگێڕاینەوە. بەڵام تەحسین بەگ مامۆستای بیرکاریی، کە پیاوێکی

بەخۆی قەڵەوی خۆبەزلزان بوو، وهەمیشە هەردوو دەستی لەگیرفانیدابوو وجگەرەکەشی بەدەمییەوە، ڕەفتارەکانی زیاتر لەجەللاد ئەچوو وەك لەپەروەردەکار، و سەرەڕای ئەوەش شێتی ئەوەبوو پرسیاری قورسی بەگرێ وگۆڵمان لێبکات لەسەروو ئاستی خوێندنمانەوە و گەر وەڵامی پرسیارەکانیمان نەزانیبایە، لەپشوو و تەنانەت خواردنیش بێبەشی ئەکردین. زۆریش شانازی بەوەوە ئەکرد،یەکێکە لەلایەنگرانی (پەروەردەی نوێ) کە مستەفاکەمال هێنابوویە تورکیاوە.

لەمساڵدا (١٩٣٠) وەرزێکی نوێ لەژیانی مندا ئەکرێتەوە، قۆناغێکی یەکلاکەرەوە بۆ خێزانەکەمان و بۆ کورد بەگشتیی و بۆ خۆشم.

بەدەستپێشکەرییەکی(مەمدوح سەلیم)و بەرێکەوتن لەگەڵ کۆمەڵێك کوردی مۆڵەتدار لەبواری مافپەروەریی(حقوق) و زانستی سیاسیی بەرەچەڵەك خەڵکی (وان) و هەندێك ڕووناکبیری تورکیاش، ڕێکخراوێکی سیاسیی (خۆیی بوون)یان لەسوریا دروستکرد، کەئامانجەکەی سەربەخۆیی کوردستانی تورکیابوو، هەمان ساڵ هەندێك لەئەندامەکانیان، بەرێکەوتن لەگەڵ ئەرمەن هەوڵیاندا بێنە تورکیاوە بەمەبەستی ڕێکخستنی کاری سەربازیی دژی تورکیا و توانییان (ئیحسان نوری) ئەفسەری پێشووی دەستەی ئەرکانی تورکیا بنێرنە چیاکانی ئارارات. شای ئێران کە ململانێی سنووریی هەبوو لەگەڵ مستەفا کەمال، ڕێیدا بەئیحسان نوری لەئێران بپەڕێتەوە و لەبەشی خۆرئاوای چیاکانی ئارارات جێگیرببێت.

ئیحسان نوری توانی ژمارەیەکی زۆر لەسەرۆکە کوردەکان لەقوربانیانی چەوساندنەوەی کەمالیزم لەدەوری خۆی کۆبکاتەوەو لەوێوە زۆری ئەبرد بەهەڵمەتەکانی هێزەکانی تورکیای پەرێشان کرد.

فرەنساش لای خۆیەوە بەڵێنی دابوو چاو بپۆشێت لەچالاکییەکانی خۆیی بوون. بەڵام کوردەکانی سوریا کە ئەبوو یارمەتی ئیحسان نوری بدەن بۆ ڕزگارکردنی کوردستان نەگەیشتە ئامانج، چونکە فرەنسییەکان کە لەگەڵ تورکەکاندا ڕێککەوتنێکی

لەیەکگەیشتنیان ئیمزاکردبوو، پشتیان تێکردین. رەزا شاش کەسوێندی خواردبوو لەم ململانێیەدا بێلایەن بمێنێتەوە، دوای ئەوەی کێشەسنوورییەکانی لەگەڵ تورکەکان بەبەرژەوەندیی خۆی یەکلایی کردەوە سوێندەکەی شکاند و رێگەیدا بەهێزەکانی تورکیا بچنە خاکی ئێرانەوە و کوردەکان گەمارۆ بدەن.

دوای ئەو نسکۆیەی تووشی خۆیبوون بوو، مستەفاکەمال هەستیکرد لەهەمووکاتێك زیاتر دەستکراوەیە بۆ بەکارهێنانی هێز دژی کورد. سەدان گوندی ناوچەکەی بەدانیشتوانەکەیەوە لەمنداڵ و ژن و نەخۆش سوتاند و سەدان هەزار کوردی راگوێزا بۆ خۆرئاوای تورکیاو بەناو دانیشتوانە تورکەکەدا بڵاوی کردنەوە بەوەی هەر پێنج خێزانێکی لەشوێنێك دانا.

لەوساتەوە هەموو رۆشنبیرانی کورد ئەوانەی تۆمەتباربوون بەهاوسۆزیی بۆ بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، کەوتنە بەر تووڕەیی بەرپرسانی ئەنکەرە کەقانونێکیان دەرکرد و بەپێی ئەو قانونە هەموو فەرمانبەرە پلەباڵاکانی کورد گوێزرانەوە بۆ ناوچەکانی تری تورکیا و ژمارەیەکی زۆر لەرۆشنبیرانی کورد کەکاری ئازادیان نەکرد کەوتنەژێر گورزی ئەم بڕیارەوە و براکەشم بوو بەقۆچی قوربانیی و ئامانجی دەسەڵاتدارانی تورك.

لەوماوەیەدا، وەك هەموو ناوچە کۆلۆنییەکان وپاشکۆکان، کوردستان خرایە ژێر بەڕێوەبەرێتییەکی تایبەتەوە، کە جۆرێك لەکۆمیسیۆن، یاپشکنینی گشتیی بەڕێوەی ئەبرد بەسەرۆکایەتی پشکنەری گشتیی کەپەیوەندیی راستەوخۆی بەمستەفا کەمالەوەهەبوو، (ئیبراهیم تالی)لەم پۆستەدا دانرا کەپزیشك و هاورێیەکی نزیکی مستەفا کەمال بوو، بەرەچەڵەك لەخێزانێکی دوورزیی ناوچەی حەڵەب بوو کەبەجۆش و خرۆشەوە ئایدۆلۆژیای تۆرانیی قبوڵ کردبوو، و لەدوای دەستنیشانکردنی، سەرکوتێکی درندانەی بێبەزەییانە کوردستانی گرتەوە، و سەرکوتکردن دژی هەموو ئەو کوردانە بەکارئەهێنرا کە گومانی ئەوەیان لێئەکرا لەوانەیە هەستێکی کوردانەیان تیابێت. هێندە بەس بوو هەر رۆشنبیرێك

تۆمەتباربکرێت بەوەی بەزمانی کوردی قسەی کردووە یا بەو زمانە گۆرانی وتووە یا گـوێی لەگۆرانی کوردی گرتووە یا تەنانەت ئەگەر ئەندامی (خێزانێکی تورك) نـەبێت، بـۆ ئـەوەی بەدژایـەتیی گـەلی تـورك تۆمــەتبار بکرێـت و وەك کـوردێکی نەتەوەپەرسـتی ترسـناك تۆمەتباربکرێت کە پێویستە لەنزیکترین هەلدا لەناوببرێت.

دووان لەو فەرمانبەرانەی خەڵکی مادن کە ئیبراهیم تـالی گواسـتنیەوە بـۆ خۆرئـاوای تورکیا هاوڕێی نزیکی کاکم بوون، (شەوکەت زولفۆ) مامۆسـتای پێـشووی وانـەی زمـانی ئینگلیزیم لەناوەندیی دیاربەکر و(عارف عـەباس) ئەنـدازیاری کـشتوکاڵیی و بەڕێوەبـەری پرۆژە کشتوکاڵییەکان لەباشووری خۆرهەڵاتی تورکیـا. شـەوکەت زولفـۆ، گوێزرایـەوە بـۆ ئەدەنە و عارف عەباسیش بۆ ئەنکەرە، لەبەرئەوەی فەرمانبەربوون و ناچـاربوون ملکەچـی ئەو فەرمانانەبن لەوەزارەتە پەیوەندیدارەکانیانەوە بۆیان دەرئەچێت. هاوکات ئیبراهیم تـالی بەسـووربوونەوە سەریکردەسـەر کـاکم و پێـشنیازی بـۆ کـرد وەك هاوڕێکـانی دیاربـەکر بەجێبێڵت و لەخۆرئاوای تورکیا نیشتەجێ بێت و لەیەکێك لەدیدارەکانیدا پێی وت:

-لەهەر شارێك کەخۆت هەڵیئەبژێرت لەپۆستێکی چاکدا دائەنێم.

کاکم بەئەدەبەوە ئەمەی ڕەتکردەوە و بیانووی ئـەوەی هێنایـەوە کـە ئەیـەوێت کـاری ئازادبکات، وکلینکەکەی لەدیاربەکر جێگیربووە، و زۆرماندووبووە تا ئەخۆشی پەیداکردووە و هیچ هۆیەك نییە بۆ ئەوەی ناوەندی هەڵبژاردنەکەی بەجێبێڵێت.

کۆمیسەر بەچرپە پێی وتبوو:

-ئەوە ئامۆژگاریی منە کە پێشکەشی تۆی ئەکەم.

ئەوکاتە کاکم لەخانوویەکی گەورەدابوو لەدیاربەکر کە حەوشەیەکی گـەورەی هـەبوو، و دوو دەرگەی هەبوو، هەریەکـەیان لەسـەر شـەقامێکی هاوتـەریبی یـەکتربوو. دوای چـەند ڕۆژێك لەو گفتوگۆیە کۆمیسەر لەبەردەم هەر دەرگەیەکی ماڵەکەمانـدا دووپۆلیـسی دانـا، کەچـاودێرییان ئـەکرد و لەناسـنامەی هـەموو سـەردانکەرەکانیان ئەکۆڵییـەوە، و ئەگـەر

ئەوکەسە نەخۆش بوایە ئەوا پۆلیس هەوڵی ئەدا قایلی بکات بۆ چارەسەر نەیەتەوە بۆلای کاکم:

-بۆ ئەم پزیشکە هەڵئەبژێرن، و پزیشکێکیتر نا؟

نەخۆشەکان وەڵام ئەدەنەوە:

-چونکە ئەمە پزیشکێکی باشە.

وەڵامی یەکلاکەرەوەیان ئەدانەوە:

-گەر واش بێت، مەچن بۆلای بۆ چارەسەر ئەگینا تووشی سەرئێشەئەبن.

پۆلیس هەڕەشەی لەهەموو نەخۆشەکان ئەکرد، بەڵام هێشتا ئازایەتی خۆیان لەدەستنەدابوو کە بێن بۆ کلینکەکەی کاکم و راوێژی پزیشکیی پێبکەن. تەنانەت کە کاکم ئەچوو بۆ ماڵی نەخۆشەکان هەمیشە پۆلیس بەدوایەوەبوو، و بەوردی ناوی ئەوانەیان تۆمارئەکرد کە کاکمیان بانگکردووە. ئەم رەفتارانە نەخۆشەکانی هەراسان ئەکرد زیاتر لەوەی بیانترسێنێت. کاتێکیش ئەنجامی ئەم رەفتارانە بەدڵی کاربەدەستان نەبوو، پەنایان بردەبەر شێوازی توندتر و رەقتر، و کەوتنە دەستگیرکردنی ئەو نەخۆشانەی پێشینەیان هەبوو، و ئەیانبردن بۆ بنکەکانی پۆلیس و لێکۆڵینەوەی دووروودرێژیان لەگەڵ ئەکردن و مامەڵەی خراپییان بەرامبەر ئەنجام ئەدان و ئازادییان نەئەکردن تا بەڵێنێکی نوسراویان پێپڕئەکردنەوە کە پزیشکەکەیان بگۆڕن.

کاکم نامەی بۆ لێپرسراوان لەئەنکەرە نووسی تا بێدادیی ئەم مامەڵەیەیان بۆ روونبکاتەوە و نارەزایی دەربڕێت لەم پێشێلکردنەی دەستووری کۆماریی و مافەبنەڕەتییەکانی مرۆڤ، بەڵام هیچ وەڵامێکی وەرنەگرتەوە، و پۆلیس بەردەوامبوون لەسەرکوتکردنی نەخۆشەکانی.

رۆژ بەرۆژ دۆخەکە خراپترئەبوو، تا کاکمی ناچارکرد بریاربدات یا وەڵامی پۆزەتیفی پێشنیازەکەی ئیبراهیم تالی بداتەوە یا رابکات و پەنابەرێتەبەر ئاوارەیی.

سوریا نزیکترین ولات بوو کە بشێت پەنای بۆ ببرێت و پێشوازیت لێبکرێت. ئەوکاتە فرەنسییەکان بەتەواویی کۆنترۆڵی(جزیرە)یان کردبوو کە زۆربەی دانیشتوانەکەی کوردانی نیشتەجێبوون، و هانی جێگیربوون و وەبەرهێنانی سامانی کشتوکاڵییان ئەدا کە تائەوکاتە دەست لێنەدراوبوو. هەزاران کورد و ئەرمەن و ئاشوور و سریان و جوولەکە هاتبوون و هێزی کار و پارەو زانستی خۆیان هێنابوو بۆ دانیشتوانی رەسەنی ناوچەکە و چەندین ساڵیان پێویست بوو تاجزیرە بکەنە کالیفۆرنیای سوریا. کارەکەیان سەرنجراکێش بوو، و کاکم بیری لەوە ئەکردەوە، فێڵێك بدۆزێتەوە تاتورکیا و کۆمیسەر بەجێبهێڵت و لەوڵاتێك هەناسە بدات کە(فرەنسا ئازادی و دیموکراسیی بۆ هێنابوو؟!).

لەکۆتایی گفتوگۆیەکی درێژ لەگەڵ هەردوو هاورێکەی (عارف عەباس)و(شەوکەت زولفۆ) کەئەوانیش بیرۆکەی لەسوریا نیشتەجێبوونیان پێ باشبوو، کاکم بریاریدا لەسنوور بپەرێتەوە و داوای پەنابەریی لەفرەنسییەکان بکات و بریاریشیدا پرۆژەکەی جێبەجێ بکات، کاتێك کۆمیسەر بانگی کرد و فەرمانی جێهێشتنەکەی پێ راگەیاند و پێی وت:

-ئیتر ناتوانیت لەوەزیاتر لێرە بمێنیتەوە، ئەگەر ناتەوێت هەراسان بکرێیت، بەخۆشیی خۆت ناوچە کوردییەکە بەجێبهێڵە.

کاکم وەڵامی دایەوە:

-باشە، پۆستێکم لەخۆرئاوای تورکیا بدەرێ و ئەچم بۆ ئەوێ.

رۆژی دواتر لەئەزمیر دامەزرێنرا، کاکم و دوو هاورێکەی بەهێمنی پێشنیازەکەی کۆمیسەریان قبولکرد، چونکە هیواداربوون لەشارە نوێکەیانەوە لەسنوور بپەرنەوە و هەوایەکی ئازادتر هەڵمژن. ئەوکات من تەمەنم دەساڵ بوو. ئاگاشم لەنەخشەکەیان نەبوو و تەنیا ئەوەندەم ئەزانی کە حەزئەکەن لەقوتابخانەیەکی ناوەندیی لەئەستەمبوڵ دامنێن. لەخۆشم ئەپرسی، بۆ رەسۆی برام ئەگری و بەو شێوازە مامەڵە لەگەڵ کاکم ئەکات؟

پێموابوو کە پێشهاتێکی نائاسایی ڕووئەدات، بەڵام لـەو ئاسـتەدا نـەبووم کـە مەزەنـدەی بایەخی تەواوی ڕووداوەکان بکەم.

دوای چەند ڕۆژێك لەناو شەمەندەفەرێکدا بووین بەرەو ئەستەمبوڵ لەسـەر ئـەو هێڵـی ئاسنەی کەسنووری نێوان تورکیا و سوریای پێك ئەهێنا.

کاکم و هاوڕێکانی بێدەنگ بوون، منیش سەرم نابوو بەپەنجەرەکـەوە و سـەیری دیمـەنی سروشتی دەرەوەم ئەکرد، لەڕاستیدا هەستم ئەکرد کـە ئەچـمە ناوجیهـانێکی تـرەوە. ئـەو کەسانەی ئەمبینین تەرپووش و جامانە و چەفتە و عـەگالیان پۆشـیبوو(ئـەو شـتە شـازەی ئەتاتورك حەرامی کردبوو).

بەچاو ئەکەوتمە دوای ئەوپیاوە نامۆیانە، و لەم سروشتە نوێیە وردئەبوومەوە و سەرەنجام کاتێك شـەوداهات شـەمەندەفەرەکە لەوێـستگەیەك وەسـتا و سـەرۆکی وێـستگەکە کـە پیاوێکی ئەرمەن بوو بردینی بۆ بۆفییەك و گفتوگۆیـەکی سـەیر لـەنێوان ئـەو و براکـەم و هاوڕێکانمدا ڕوویدا. مەزەندەی ئەوەم کرد کە ئەوان ئەیانەوێت سەرکێـشییەك ئـەنجام بـدەن بەبێ ئەوەی بتوانم واتای تەواوی ئەو هەموو ورتە ورتە تێبگەم. ژنەکەی عارف عەباس کـە بەشدارنەبوو لەگفتوگۆکەدا لێی پرسیم:

-نوورەدین، ئەچیت بۆ کوێ؟

من کەلێموناد‌ەیەکم لەبەردەمدابوو، وەڵامم دایەوە:

-من؟ من ئەچم بۆ ئەستەمبوڵ.

بەتووڕەییەکەوە پێکەنیی و وتی:

-ئاە ! باشە وا گەیشتیتە ئەستەمبوڵ!.

ئـەم قـسانەی کـرد و دەسـتیکرد بـەگریان، منـیش دەسـتمکرد بـەگریان، چـونکە لەگفتوگۆکان ئەوە تێگەیشتم کە ئێمە لەدەوروبەری ئەسـتەمبوڵ نین بەڵکو لـەنزیك حەلـەبین بۆیە بەهەڵچوونەوە پێم وتن:

-چۆن ئەبێت؟! ئەبێت بچین بۆ ئەستەمبوڵ، ئەی ناچین بۆ ئەوێ!؟ درۆزنانە من ئەمەوێت بگەڕێمەوە بۆ ماڵەوە.

کاکم هەوڵیدا ئارامم بکاتەوە و دڵنەواییم بکات:

-بەڵام من ئەتخەمە چاکترین قوتابخانەی فرەنسیی، بەچەندین زمان قسە ئەکەیت، رۆشنبیر ئەبیت و ئەبیت بەپیاو.

بەهیچ شێوەیەك باوەڕم نەهێنا، بیری مادێم ئەکرد، بیری بۆزۆ، بیری باخەکانم ئەکرد. نیگەرانی درەختەکان و مێوەکانمان، نیگەرانی باوکم و خوشك و براکانم و رەسۆی برام بووم و......

لەنزیکمەوە گریانی ژنەکەی عارف عەباس زیادی کرد.

پاش چەند خولەکێك بەئاماژەیەکی رێنیشاندەرەکە پاسێکی بچووك بردینی بەرەو حەڵەب کەلەنیوەشەودا گەیشتینە ئەوێ. نایەتەوە بیرم چۆن بەسەر بێخەوییەکەمدا زاڵبووم. رۆژی دواتر عارف عەباس گرامافۆنێکی هێنا لەگەڵ کۆمەڵێك قەوان، گوێمان گرت لەگۆرانییەکی نیوەتورکی و نیوەکوردی کە لەتورکیا قەدەغەبوو. گۆرانییەکە ئەیوت:

(ئەی کوردە ئازاکان، ئەمڕۆ رۆژی ئێوەیە

دوژمنان بپلیشێننەوە

لەولاتەکەتان دەریان بکەن)

لەگەڵ دەنگی گۆرانییەکە خەمەکانم لەبیرچووە و کەوتمە دندنککردنی ئاوازەکە.

# سوريا

- حەڵەب و دیمەشق و جەزیرە

- دۆخی کوردانی سوریا لەژێر ئینتدابی فرەنسیدا

- گەشانەوەی هەستی نەتەوەیی

- ژیانی کورد لەجەزیرە

-شەڕی ڕۆژانەی پزیشکێکی کورد لەبەرامبەر جادووگەرانو نەزانین و نەخۆشیدا

- سەرەتای چالاکیی نەتەوەیی کورد

- خۆهەڵدان لەکاتی ڕۆیشتنی شەمەندەفەردا لەبنکەیەکی تورکی لەناوخاکی سوریادا

- ئەزموونی کشتوکاڵ

هەرچەندە حەڵەب وەك مــادن جــوان نــەبوو، چــونكە درەخــت و روبــار و ســەوزایی كــەمبوو و منــیش بــیری كەرەكــەم (بــۆزۆ)م ئــەكرد بــەڵام تیایــدا هەســتمان بــەئازادیی تەواوئەكرد. مرۆڤ ئەیتوانی گوێ لەو گۆرانی و ئاوازانە بگرێت كە لــەتوركیا قەدەغــەبوون. وردە وردە مانەوەم لەوێ پێخۆشبوو و بەحەڵەب راهاتم تا وایلێهات تیایــدا خــۆم ســەرگەرم بكەم.

سەیرم لەشێوازی بەرگپۆشینی خــەڵك ئــەهات لەســەرجادەكان، هەنــدێكیان دزداشــەی درێژیان لەبەرئەكرد، هەندێكی تریــان شــەرواڵی پــان و فراوانیــان لەپێــئــەكرد و جامانــەیان ئەبەست و پێڵاوی سووری نوك چەماوەیان لەپێئەكرد.

هــەروەها كــاتێكی خۆشــم بەســەرئەبرد لەچــاودێریكردنی ئــەو جــەماوەرەی بەبــەرگی جیاوازەوە لەگۆڕەپانی (باب الفرج) كۆئەبوونەوەو فرۆشیارەكان هاواریان بــۆ كەلوپەلــەكانیان ئەكرد و كۆڵهەڵگرەكان كەباری قورسیان بەسەرپشتەوەبوو و بەناو خەڵكەكەدا رێــی خۆیــان ئەكردەوە و بەدەنگی بــەرز هاواریــان ئــەكرد و عەرەبانــچیەكانیش بەقامــچی ئەیانكێــشا بەپشتی وڵاخەكانیاندا، ئەمە بۆمن جیهانێكی نوێ بوو.

كاتێكیش شەقامی قیرتاوم لەحەڵەب بینی و بەیەكێك لەو شەقامانەدا پەڕیــمەوە، خــۆم پێنەگیرا و هاوارم كرد:

-ئا..ئەمە ئەوشارەیە كە بەكەڵكی سواربوونی پایسكل دێت.

هەرخێرا واملێهــات زۆربــەی رۆژ بەســوڕانەوە لەشــەقامەكانی حەلــەب بەســەربەرم و ئێوارەش بچمەوە بۆلای كاكم و هاوڕێكانی. بێئاگانەبووم لەنیگا خەماوییــەكانیان بێئــەوەی

هۆکاری راستەقینەی ئەوەبزانم، چونکە پێموابوو ئێمە لەوڵاتێکی ئازاددا ئەژین و لێرە کەس راومانناتی و ئازارمان نادات، سەرەنجام لەم وڵاتەدا بەئاسایش ئەژین. بەڵام مەسەلەکە جیاوازبوو چونکە هەرکە کاکم و هاوڕێکانی گەیشتنە حەڵەب، یەکسەر داوای پەنابەرێتیی سیاسییان ئاراستەی دەسەڵاتی فەرەنسای ئەوکاتی حاکمی سووریاکرد و کەمترین گومانیان نەبوو کە فەرەنسییەکان پێشوازی گەرمیان ئەکەن و هەموو جۆرە یارمەتییەکیان ئەدەن بۆ جێگیربوون لەسووریا و لەوانەشە راوێژکاری فەرەنسای نیشتەجێی بەیروت یارمەتیان بدات لەبەردەوامبوون لەخەبات لەپێناوئازادکردنی گەلی کورددا. لەراستیدا ئاگامان لەسیاسەتی فەرەنسا نەبوو کەبەپێی دۆخی پەیوەندییە هاوبەشەکانی لەگەڵ تورکیا بەرامبەر گەلی کورد ئەگۆڕا. دوای هەفتەیەك لەپێشکەشکردنی داواکە وەڵامی ترسێنەر و چاوەڕواننەکراوی راوێژکار تووشی سەرسوڕمانی کردین، چونکە داوای پەنابەرێتیەکەی رەتکریووەوە و دووپاتی کردبۆوە کە بۆ پتەوکردنی پەیوەندییە باشەکانی هەردوو وڵات و لەسەرداوای ئەنکەرە کە داوای تەسلیمکردنەوە و گەڕانەوەی کردبووین، ئەمانداتەوە دەست تورکیا.

کاکم لەم هەڵوێستە سەری سوڕمابوو و ئەیپرسی:

-(چۆن دەوڵەتێکی مەزن ئەتوانێت بگاتە ئەم ئاستەنزمە و بنەما مرۆییە دانپیانراوەکان لەجیهاندا پێشل بکات؟!) ئەشی وت:

-(ئەو پروپاگەندانەی فەرەنسا بڵاوینەکردەوە کەئەو، بەرجەستەکەری ئازادیی و یەکسانیی و برایەتییە، ئێمەی هەڵخەڵەتاند).

هاوڕێکانیشمان ئەیانپرسیی:

-(فەرەنسییەکان چیمان لێئەکەن؟ و ئایا ئەوێرن دەرمان بکەن؟).

کاکیشم وەڵامی ئەدایەوە:

-(بەلام قانونی نێودەوڵەتیی هەیە کەتەسلیمکردنەوەی پەنابەرانی سیاسیی قەدەغەکردووە).

تادوای چەندین مانگ ئەم مەترسییە گەورەیە لەکۆڵمان نەبووەوە، ئەویش دوای هەوڵی چەندین کەسی کورد و ئەرمەنی سوریا لای راوێژکار و سەرەنجام گەیشتە ئەو بڕوایەی کەڕاکردنمان لەتورکیا هۆکاری سیاسیی لەپشتبووە و فەرەنسییەکان ڕێمان ئەدەن لەسوریا بمێنینەوە. بەم بڕیارە هەناسەی ئاسوودەییمان هەڵکێشاو دڵنیابووین، بەڵام ئەبوو سەرەڕای ئەوەش ڕێگەیەك بدۆزینەوە بۆ بەدەستهێنانی قووتی خۆمان، چونکە وەزارەتی تەندروستیی پیشەی پزیشکیی لەکاکم قەدەغەکرد لەسوریا، هەرچەندە خوێندنی پزیشکی لەسەردەمی عوسمانیدا لەهەریەك لەئەستەمبوڵ و دیمەشق تەواوکردبوو و بڕوانامەکەی ڕێی پێئەدا پیشەی پزیشکی بکات لەچوارچێوەی خاکی ئیمپراتۆری عوسمانیدا کە بێگومان سوریاشی ئەگرتەوە. کاکم ناچارکرا تاقیکردنەوەیەکی نوێ ئەنجامبدات. دێتەوە یادم کەبۆ چەندین ڕۆژ دەرگەی ژوورەکەی لەئوتێل لەخۆی داخست بۆ دووبارە پیاچوونەوەی ئەو کتێبانەی لەتورکیاوە لەگەڵ خۆی هێنابوونی.

دوای هەفتەیەك تاقیکردنەوەکەی بەسەرکەوتوویی بڕی، مۆڵەتی کردنەوەی کلینکی لەهەرشوێنێکی سوریا وەرگرت. دوای ڕاوێژ لەگەڵ هاوڕێیانی کورد و ئەرمەن بڕیاریدا کلینکێکی پزیشکی لەحەڵەب بکاتەوە و پانسیونێکی وەرگرت لەشەقامی خەندەك کە وەك شادەماری شارەکەوابوو و پارچەیەکی کانزایی هەڵواسی کە ناوی خۆی و پسپۆڕییەکەی لەنەخۆشی پەتا و منداڵانی لەسەر نوسرابوو لەگەڵ تێبینییەك کە ڕۆژانی یەکشەممە و هەینی پشکنین بۆ هەژاران بەخۆڕاییە. خێزانی زولفی و عەباسیش پانسیۆنێکیان لەگەڕەکی بازاڕ بەکرێ گرت و منیش چوومە خوێندنگەی (خاکی پیرۆز)ی ناوخۆیی کە بەناوبانگ بوو وەك چاکترین قوتابخانەی حەڵەب و فەرەنسییەکان بەڕێویان ئەبرد. کڵێسەی (خاکی پیرۆز)ی دێرین لەناوەڕاستی بازاڕە بازرگانییەکاندابوو، پێکهاتبوو

لەقوتابخانەیەك و كلێسایەك پێكەوە. بۆئەوەی بگەیتە ئەوێش ئەبوو بەچەندین شەقام و كوچەی تەسكی ناوبازارە سەرداپۆشراو و سەربەتاڵەكاندا تێپەڕبیت. دەرگایەكی گەورەی هەبوو، هی سەدەكانی ناوەڕاست لەگەڵ چەندین حەوشەی فراوان و قووڵ كە هەر لەزیندانێكی كۆن ئەچوو، ژوورەكانی خوێندنیش لەژێرزەمینێكی تاریكدا بوون كە لەڕۆژانی هەوروهەلادا بەبێ گڵۆپی كارەبایی بینین تیایاندا مەحاڵبوو.

بەیانیان ئەبوو كوپێك چای رەش و سارد بخۆینەوە و بۆنانی نیوەڕۆ و ئێوارەش قاپێكیان ئەدایێ كە مەعكەرۆنی تیادابوو لەگەڵ چەند پلەگۆشتێكدا و دۆشاوی تەماتەی كرابوو بەسەردا. هەر تەنیا سەیركردنی قاپەكان بەسبوو بۆ ئەوەی زەوقی خواردنت نەمێنێت، كەچی هاوڕێكانم زۆر بەزەوقەوە ئەیانخوارد. لێم ئەپرسین:

-(چۆن ئەتوانن ئەم شتانە بخۆن كە ئەبێتە هۆی نەخۆشی؟)

بەپەلە وەڵامیان ئەدامەوە:

-(با چەندمانگ یان چەندساڵ لێرە بمێنیتەوە ئەو كاتە تۆش ئەیخۆیت).

لەدڵی خۆمدا ئەموت:

-(بڕواناكەم بگەمە ئەوەی ئەم شتانە بخۆم.)

خواردن تەنیا شت نەبوو لەخاكی پیرۆز كە من لێی بێزاربووم.

لەڕیزێكی چاوەڕوانیدا دایاننام لەنێوان خوێندكارانی پۆلی یەكەمدا، كە تەمەنیان لەنێوان ٨ — ٩ ساڵ بوون بەمەبەستی فێربوونی زمانی فرەنسی، ئەبوو رۆژەكەم لەكۆكردنەوە و لێدەركردندا وەك منداڵان بەسەربەرم و زمانی فرەنسیەكەم بەهێزبكەم بەسەرپەرشتی ژنە مامۆستایەكی حەڵەبی كە وەك نیوەی خەڵكی حەڵەب بەدەنگێكی گڕ قسەی ئەكرد.

هەستم ئەكرد لەم قوتابخانەیەدا كاتی خۆم بەفیڕۆ ئەدەم و لەوەش خراپتر، بووبوومە ئامانجی گەڕپێكردنی یەكێك لەچاودێرەكان كە ناوی (براهینری) بوو.

باڵابەرزێکی دەموچاو ترسناك و ریشی سپییەکی بڕ و دارحەیزەرانێکی بەناوبانگی پێبوو کە کردبوویە شتێکی تۆقێنەر، و بەسادەترین هۆکار لەخوێندکارەکانی ئەدا بۆ چاوترساندنیان، بیرم دێت لێدانێکی قورسی لەکوڕێکی هاوتەمەنی مندا و پاشان ناچاری کرد لەحەوشە کۆنکرێتییەکەدا لەکەشێکی تەزێنەری مانگی تشرینی دووەمدا بۆ ماوەی یەك سەعاتی تەواو لەسەرئەژنۆ بەملکەچی بمێنێتەوە.

ئەوە لەدووەم هەفتەی گەیشتنمدا دەستی پێکرد، کاتێك لەنیوەڕۆدا سەرئەکەوتین بۆ هۆڵی نانخواردنەکە، براهینری لەسەرەوەی قادرمەکان وەستابوو و چاودێریی سەرکەوتنی ئێمەی ئەکرد، کە لێی نزیکبوومەوە وەیزانی گوێی لەدەنگێکبووە و بەدارەکەی کێشای بەپشتمدا، هەستمکرد وەك ئەوەی پێستەکەم دڕابێت و زریکەیەکم کرد کە منداڵەکانی لەڕۆیشتن راگرت.

"پێشکەوون" براهینری بەدەم جوڵاندنی دارەکەی دەستیەوە وای وت.

کەس نەیوێرا بپرسێت چی روویداوە و خوێندکارەکان ئۆتۆماتیکی چوونە شوێنەکانی خۆیان. ئەمە منی هەژاند، چونکە ڕانەهاتبووم لەقوتابخانە لێدان بخۆم.

لەماوەی هەموو ژیانی خوێندنی پێشوومدا تەنیا دوو زللەم خواردووە لەلایەن مامۆستای وێنەوە لەپۆلی سێهەمی سەرەتاییدا کەنازناوی (پەنجە کوڵ)یان لێنابوو لەبەرئەوەی پەنجەی شایەتمانی دەستی راستی قرتابوو. رۆژێکیان کاتێك وێنەی ئەو گوڵەم کۆپی ئەکرد کە مامۆستا لەسەر تەختەکە بۆی کێشابووین یەك زللەی قایمی پیاکێشام، منیش بەگریانەوە وتم:

-(هیچیم نەکردووە تا لێم بدەیت)

کە گەڕامەوە بۆ ماڵەوە بەپێویستم نەزانی لەمبارەیەوە خێزانەکەم ئاگاداربکەمەوە، کەچی دوای چەند رۆژێك پەنجەکوڵ لەحەوشەی قوتابخانەکەدا ئەم کارەی دووبارەکردەوە، بۆیە ریزەکەم بەجێهێشت و لەحەوشەکە هاتمەدەرەوەو بەراڕەوێکی درێژدا رووم کردە ماڵەوە و لەوێ دایکمم بینی لەچێشتخانەکەبوو، بەدەم گریانەوە پێم وت:

-(ئەبێت لەپەنجەکۆڵ بپارێزن ئەگینا رۆژێك ئەمکوژێت، نازانم چی لێمنەوێت و ئـەوەتا بۆ دووەم جار بەبێ هۆ لێم ئەدات، جاری یەکەم حەزمنەکرد بۆتان باس بکەم، بەڵام ئـەمڕۆ کارەکەی دووبارەکردەوە، ئەمە زۆرە و پێنەچێت رقی لێهەڵگرتبم).

دایکم دوایئەوەی بەهێمنی گوێی لێگرتم، چـووە سـەرەوە بـۆ ژوورەکـەی بـاوکم، دوای کەمێك باوکم هاتەخوارەوە و وتی:

-(کەواتە ئاوا، تۆڵە لەکوڕەکەم ئەکاتەوە، چونکە چـەند رۆژێـك لەمـەوپێش هەنـدێك تابلۆی نیشاندام و لێمنەکڕی، ئێستا ئەچم پیـشانی ئـەدەم، مامۆسـتا چـۆن خوێنـدکار وا پەروەردە ئەکات؟!).

دەستی گرتم و داوای لێکردم لەگەڵی بـڕۆم. کـە گەیـشتینە قوتابخانەکـە چـووە ژووری بەڕێوەبەر و داوایکرد هەرئێستا پەنجەکۆڵ ببینێت، بەڕێوەبەر بەتکاوە پێی وت:

-(هێمن بەرەوە ئەفەندی....هێمنبەرەوە، پێم بڵێ چی روویداوە؟)

باوکم وەڵامی دایەوە:

- (من چەندین کوڕی ترم پەروەردە کردووە بێئەوەی کەس لێیان بـدات، ئـەمڕۆ خـەڵك وەك نمونە چاویان لێئەکەن، بەچ هـەقێك وبۆچـی پەنجـەکۆڵ شـەڕ بەکوڕەکـەم ئەفرۆشـێت؟ ئەمەوێت بێت و بۆم روونبکاتەوە و داوای لێبووردنیش لەکوڕە بچووکەکەم بکات.)

-(نازانم، مەسەلەچییە، ئارامبەرەوە و پێم بڵێ کوڕەکەت چی لێبەسەرهاتووە.)

باوکم داوای لێکردم کێشەکەم لەگـەڵ مامۆسـتای وێنـە بـۆ بەڕێوەبـەر بـاس بکـەم. بەڕێوەبەر گوێی لێگرتم و لەباوکمی پرسی کە ئەو هیچ ناسیاوییەکی لەگـەڵ مامۆسـتاکەدا هەیە؟ باوکم وەڵامی دایەوە:

-(ماوەیەکی کەمە بـۆرە ناسـیاوییەکمان هەیـە، بـەڵام لـەو ڕۆژەوەی کرینـی یـەکێك لەتابلۆکانیم رەتکردۆتەوە، چاوم پێینەکەوتووە).

-(ئەها، کەواتە نهێنییەکە ئەمەیە، راستە پەنجەکۆڵ هونەرمەندێکی بەهرەمەندە، بەڵام زۆر بەخۆیدا ئەنازێ و ئیشەکانی خۆی زۆر پێگرنگە و گەر کەسێك کرێنی یەکێك لەتابلۆکانی رەتبکاتەوە بەسوکایەتیی و کەم نرخکردنی خۆی ئەزانێ، و بەبێ ئاگایی و بەهەر شێوازێك بێت ئەکەوێتە تۆڵەسەندنەوە. لەبەرئەوەی کە ناتوانێت بەرامبەر بەتۆ هیچ بکات بۆیە شەڕی بەکوڕەکەت فرۆشتووە، مـن ئەزانم زۆر خۆبەزلزان وبەدگومانە بۆیە باشتروایە بانگی نەکەین، بەڵام دڵنیات ئەکەمەوە کە لەمەودوا هەڵسوکەوتی لەگەڵ کوڕەکەت باش ئەبێت).

باوکم پێشنیازەکەی بەڕێوەبەری قبولکرد، بەمەرجێك کە پەنجەکۆل زۆر بەنەرمیی لەگەڵ من هەڵسوکەوت بکات. دوای ساڵێك لەو رووداوە لەو قوتابخانەیە گوێزرایەوە.

ئەو شەوە دوای لێدانەکەی براهێنری خەوم لێنەکەوت. یادەوەری رووداوەکەم لەگەڵ پەنجەکۆڵ هاتەوەبیر، چەندم حەزئەکرد لەنزیکی باوکم بومایە تا پەنام بۆ ببردایە و دەرسێکی باشی ئەم پەروەردەکارە جەلادەی دابدایە، دەرسێك لەئەدەبدا. بەڵام بەداخەوە لەمادن نەبووم، بەڵکو لەو زیندانەدابووم کە پێی ئەوترێ قوتابخانە و باوکم سەدان کیلۆمەتر لەم جێگە سارد و غەمبارەمەوە دوورە. تا درەنگانێکی شەو گریام و تاهێزم لەبەربڕاو خەو زاڵبوو بەسەرمدا، دوای ئەوەی باوەڕم بەخۆم هێنا کەلەوانەیە براهێنری بەمەبەست ئەوەم لەگەڵ نەکات.

بۆ رۆژی دوایی سەرسامبووم بەوەی بەشی ناوخۆییەکە هیچ گوێی بەڕووداوەکە نەداو کەس نەهات لێمبپرسێ کە شەوێ بۆ گریاوم. سەریشم لەیەکێك لەهاوپۆلە کوردەکانم سوڕما -کوڕی (برایم پاشای میلەلی) بوو کەبەناوبانگ بوەی بەسەر خێڵەکانی (شەممەر)دا سەرکەوتبوو، دایکی کۆچەریی بوو، و زۆرکاری تێکردبوو، و تەنانەت دەموچاویشی وەك پیاوانی خێڵەکەی خالکوتیی کردبوو- ئەو کوڕە هەمیشە شێوازێکی ئەدۆزیەوە بۆ ئەوەی کاتێك شانازیی بەکوردبوونی خۆمەوە ئەکەم، شەرم پێفرۆشت. هاوپۆلێکی ترم "تەلعەت"

که بەتەمەن لەمن گەورەتربوو، و لەخێزانێکی کوردی ناسراوی قامیشلیی بوو، لەکاتی خوێندن لەئەستەمبوڵ کەوتبووە ژێر کاریگەریی ئایدۆلۆژیای کەمالییەوە و لەوکاتەوە پێی باش نەبوو دان بەکوردبوونی خۆیدا بنێت و حەزی لەوەبوو بەزمانی تورکی قسەبکات، لەبەرئەوەی زۆربلێ بوو، سوودم لێوەرگرت بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەو وشە فرەنسیانەی نەمزانی، و هەر ئەویش سەبارەت بەرووداوەکەی شەوی رابردوو، دڵی خۆی بۆ کردمەوە، و بەشان هەڵتەکاندنەوە وتی:

-(نابێت لەوەبترسیت، چونکە ئەوە لەهەمووکەس روودەدات بەتایبەت لەلایەن براهێنرییەوە).

-(بەڵام من لێدانی بێ هۆ قبوڵ ناکەم) بەچاوی فرمێسکاوییەوە، وەڵامم دایەوە.

-(رادێیت) بەبێ بایەخییەوە وای پێوتم و گەڕایەوە بۆ گاڵتەکردن لەگەڵ هاوڕێکانی.

دوای چەند رۆژێك و لەسەر هەمان قادرمە یەکێك لەمناڵەکانی بەردەمم قسەیکرد، براهێنری بەدارەکەی سیخورمەیەکی لەپشتمدا، چاوم بەرزکردەوە و ویستم نارەزایی دەربڕم:

-(نا..من نەبووم....نا.. من نەبووم)

قیژانی بەسەرمدا و دارەکەی راوەشاند:

-(بێدەنگبە و پێشکەوە)

بێدەنگبووم و بەهەنسکەوە رۆیشتم بەرەو شوێنەکەی خۆم. ئەو شەوەش نەمتوانی بخەوم و لەخۆم ئەپرسی:

-(تووشی چ شوێنێك بووم؟) و لەخوای بەخشندە پاڕامەوە بەزووترین کات لەم دۆزەخە رزگارم بکات.

چاوەڕێ بووم رۆژی دووەم کاکم سەردانم بکات، کاتێك لەهاتنی بێئومێدبووم، داوام لەتەلعەت کرد فێرم بکات چۆن بەزمانی فرەنسیی بڵێم (دوێنێ ئێوارە لەکاتی چوونمان بۆ خەوگەکانمان براهێنری لێیدام).

ئەو دێڕەم بەچاکی لەبەرکرد و پاشان چووم بۆ ژووری بەڕێوەبەر، لەدەرگەم دا.

بەڕێوەبەر بەخەندەوە گوێی لەوەگرت کە لەبەرمکردبوو:

-(چی ئەڵێت؟) لەمامۆستایەکی پرسی کەلەتەنیشتییەوە بوو، ئەویش تێیگەیاند، پاشان لەرێی چاویلکە زێرینەکەیەوە تەماشایەکی کردم:

-باشە بابزانم چۆن ئەبێت.

لەپلیکانەکان هاتمە خوارەوە و شادمانبووم کە ئەوئەرکەی بۆ خۆمم دیاریکردبوو جێبەجێم کرد. لەو رۆژەوە لەلێدانەکانی براهینەری رزگارم بوو، هەرچەندە هەرچاوە قیناوییەکانی بەدوامەوە بوون. بەڵام خوێندنگەکەم وەك جاران بەلامەوە سەرچاوەی هەراسانیی بوو. بەدرێژایی هەفتەیەك لەناو دیوارە بەرزەکانیدا زیندانیی ئەبین، جگە لەوەش ئەبوو پاشنیوەڕۆی یەکشەممان ریزببین بۆ هاوڕێیەتیکردنی باوەڕدارەکان، لەم پیاسانەدا بەسێ ریز ئەرۆیشتین و کڵاوێکی خڕی زێڕکەشمان لەسەرئەکرد، لەگەڵ کەوایەکی شینی دەریایی.

بەلای منالێکی وەك منەوە کە عەرەبی و فرەنسایی نازانێت و هیچ هاوڕێی نییە و ڕاهاتووە لەسواربوونی ئەسپ و پایسکل، ئەم پیاسانەی "خاکی پیرۆز" هیچ شادمانی نەئەکردم.

خۆشبەختانە کۆتایی هەفتەی سێیەم کاکم و شەوکەت زولفی هاوڕێی سەردانیان کردم، کە بینیمن دامە پڕمەی گریان، کاکم بەسەرسامییەوە لێی پرسیم:

-چی بووە؟ چی روویداوە؟!

بەدەم گریانەوە وەڵامم دایەوە:

-نامەوێت ئیتر لێرە بمێنمەوە، یا هەرچۆنێك بێت نامەوێت وەك خوێندکاری بەشی ناوخۆیی لێرەبم.

زولفی وەڵامی دامەوە:

-بەڵام تۆ لەچاکترین خوێندنگەی حەڵبیت. کەهاتوویتەتە ئەم قوتابخانەیە بۆ ئەوەیە کە بەخێرایی فێری زمانی فرەنسایی بیت و بچیتە ئەو پۆلەی لەگەڵ ئاستی خۆتدا گونجاوە).

-(لەم جۆرە قوتابخانەیەدا کە برسیم ئەبێت و بەردەوام لێم ئەدرێت، ناتوانم هیچ فێـربم و تاقەتم نییە لەگەڵ قوتابی پۆلی یەکی سەرەتایی بخوێنم. تکاتـان لێئەکـەم لێـرە دەرمکـەن نەگینا رائەکەم.)بەردەوامیش فرمێسکم ئەڕشت.

-(باشە، لانیکەم تاکۆتایی وەرزی خوێندن لێرە بمێنەرەوە) کاکم پێشنیازی کرد.

کاکم بەزمانێکی شیرین و فەرمانکەرانە بەردەوامبوو لەسەر قسەکانی:

-برۆ و چەند هەفتەیەکی تریش دانبەخۆتدا بگرە، وردە وردە فێـری زمانەکـە ئـەبیت و لەگەڵ دۆخە نوێکەدا رادێیت. باشتروایە سەیری ئەو دیارییانە بکەیت کە بـۆم هێناویـت، و هەفتەی داهاتوو شتی تریشت بۆ ئەهێنین، چاوت بسڕە و برۆ بەلای کتێبەکانتەوە.

دوای چەند رۆژێك خەوگە ساردەکە بـوو بەیارمەتیـدەرم، چـونکە هەڵامـەتێکی تونـدم گرت، شەو لەرزوتام لێهات. ئەوەی کە ترسناکیی دۆخی دەروونمی زیادئەکرد ئـەوەبوو، کـە ئەبوو بەردەوام رێگەیەکی دووربیرم بۆ گەیشتنە تەوالێت.

رۆژی دوایی قایل نـەبووم جێگەکـەم بـەجێبهێڵم و داوای پزیـشکم کـرد، برینپێـچەکە سەرنجی تا بەرزەکەمی دا و شروبێکی بۆ هێنام کە خـۆی ئامـادەیکردبوو و داوای لێکـردم رۆژی سـێ کـوپی لێبخۆمـەوە. لەئـەنجامی خراپبـوونی تەندروسـتیم وترسـی ئـەوەی لەوەخراپتربم، لەگەڵ ئەو بارودۆخەی باڵی کێشابوو بەسـەر قوتابخانـەی "خـاکی پـیرۆز"دا، زانیم کەدەرگە گەورەکە تەنیا رێگەی چوونەدەرەوەیە. هەموو جـارێکیش کـە ئەچـووم بـۆ بەڕێوەبەرێتی یا بۆ ڕاڕەوی پێـشوازیی ئـەمبینی دەرگـەوانێکی کەتـە وەك بـت لەبـەردەم دەرگەکەدا وەستاوە.

ئەو رۆژە کەچووم بۆ چاودێریکردنی شوێنەکە زۆر شادمان بووم، چونکە بینـیم لایـەکی دەرگەکـە کراوەتـەوە، بۆیـە بـەهێمنی لەپلیکانـەکان هاتمـەخوارەوە بـەرەو ئـازادی و خۆمگەیاندە سەرشەقامەکە. کەس دوامنەکەوت کەسیش لەرێبوارەکان بایەخی پێنەدام.

ورده ورده له"خاكی پیرۆز" دووركەوتمەوه و بەتەنیا لـه قـەرەباڵغیی بـازاڕدا ون بـووم. دوای ماوەیەكی كەم بەپلیكانەكانی قادرمەی كلینكەكەی كاكمـدا سـەركەوتم و خـۆمكرد بـەژووری چـاوەڕوانیدا، سـەیرمكرد ئـەو كـچە یاریـدەدەرە ئەرمەنییـەی لێیـە كەپێـشتر لەدیاربەكر لای كاكم كاری ئەكرد. لەبەرئەوەی ژوورەكە تاریك بوو گڵۆپەكـەی داگیرسـاند و سەیری رووخسارمی كرد و وتی:

-ڕەنگ لەرووتا نەماوە و ماندوو دیاریت، چـیان لێكردوویـت لـەو قوتابخانەیـە؟! دەی بچكۆل خێرا پێم بڵێ.

-شتێكی ترسناك نییە، تەنیا سەرمایەكی كەمم بووە، بەڵام چەند رۆژێكە.

دڵنیای كردمەوە:

- نیگەران مەبە هەرئێستا كاكت چاكت ئەكاتەوە.

لەوكاتەدا كاكم دەرگاكەی كردەوە، سەرسامی پێوەدیاربوو و بەبێزارییەكەوە وتی:

-چۆن ئەبێت لەناوەڕاستی هەفتەدا لەقوتابخانە بزرببیت؟!

-چەند رۆژێكە نەخۆشم و چارەسەرم ناكەن بۆیە لەقوتابخانە هەڵهاتم.

-ئاوا ؟! ئەوێریت بەروو قاییمەوە بڵێیت لەقوتابخانە راتكردووە!

بەسەرما قیژاندی:

-ئادەی بۆم باسكە بزانم چۆن؟

دوایئەوەی گوێی لێگرتم، داوای لێكردم یەكسەر بگەڕێمەوە بۆ قوتابخانە.

-لەجیاتی ئەوەی ناچارم ئەكەیت بگەڕێمەوە بۆ قوتابخانە پێویستە چارەسەرم بكەیت.

پەرستارەكە وتی:

-راست ئەكات، دیارە ئەو منداڵە ئازاری هەیە.

لەكاتێكدا سستەرەكە بەرەو قوتابخانەی "خاكی پـیرۆز" بەرێكـەوت كـاكم منـی بـردە كلینكەكەی خۆی، بەوردی پشكنیمی و پاشان لەسەر رەچـەتەكە شـتێكی نوسـی و خـۆی

چوو بۆ دەرمانخانە بیهێنێت. کە گەڕایەوە کەوچکێکی چێشتی لەشرووبەکە کرد بەدەمەوە و پێی وتم کە بچم لەجێگەدا رابکێشم و خواردنیشم تەنیا چای رەش و برنجی بێ رۆن بێت.

دوای سەعاتێك سەستەرەکە لەقوتابخانە گەڕایەوە و باسی تووڕەیی و پەشۆکانی بەڕێوەبەری بۆ کردین، کە بڕیاریداوە لێکۆڵینەوەیەك بکرێت بۆ دیاریکردنی هۆی راستەقینەی راکردنی من و لەوانەشە سزای توندی براهێنری و دەرگەوانەکە بدرێت.

کەچاکبوومەوە، بەتوندی ئەو فرمانەی کاکم رەتکردەوە کە بگەڕێمەوە بۆ قوتابخانە وەك خوێندکارێکی ناوخۆیی لەقوتابخانەی "خاکی پیرۆز"، سەرەنجام کاکم لەگەڵ هەردوو هاوڕێکەی هاتن لەگەڵم بۆ قوتابخانە و دۆخی منی بۆ بەڕێوەبەر شیکردەوە، ئەویش بەداواکەی کاکم رازیبوو بەمەرجێك ئەو قیستە پارەیە نەداتەوە کەدابوومان لەبەرامبەر مانەوەم لەبەشی ناوخۆیی.

دۆخە نوێکە بۆ من لەپێشوو باشتربوو، بەڵام بۆ کاکم نا، چونکە نەك هەرئەبوو بایەخ بدات بەخواردن و خەوتنم، بەڵکو ئەبوو بایەخ بەیاری و سەرگەرمییەکانیشم بدات، خۆشبەختانە ئەمە زۆری نەخایاند.

لەماوەی مانگێکدا کاکم لەژێرگوشاری هەندێك لەکوردانی دانیشتووی دیمەشقدا بڕیاریدا حەلەب بەجێبهێڵێت و بچێت لەدیمەشق نیشتەجێ بێت. دیارە هۆیەکی تریش هەبوو بۆ ئەم بڕیارە، ئەویش باری ئابووریی "عارف عەباس و شەوکەت زولفی" بوو، چونکە بێئومێدبووبوون لەدۆزینەوەی کار، خۆشبەختانە ژیان لەسوریا گران نەبوو، چونکە لیرەی سوریی ئەوکاتە بانکی فرەنسی دەرینەکرد کرابوو بە ١٠٠ قرش یا ٢٠ فرەنك و کیلۆیەك گۆشتی برژاو لە١٢ قرش زیاترنەبوو و نان بە٣ قرش و شەکر بە٤ قرش بوو. رۆژانەی کرێکارێك بەشێوەیەکی ناوەنجی ١٥ تا ٣٠ قرش بوو، بەڵام نرخی پشکنینی پزیشك گەیشتبووە ٥٠ قرش، و دەیان هەزار کارمەند موچەی مانگانەیان ١٠ تا ١٥ لیرەبوو، و فەرمانبەرە گەورەکان مانگانە ٧٠ بۆ ٨٠ لیرەیان وەرئەگرت، چاکترین مووچە

ئەو ئەفسەرانە وەریانئەگرت کە لەهێزەکانی خۆرهەڵاتدا خزمەتیان ئەکرد - ئەم هێزانە لەکۆلۆنییەکاندا پێکهێنرابوون بەفەرماندەیی راوێژکاری فرەنسا لەسوریا و لوبنان کە سادەترین مولازمی تازە دەرچوو لەقوتابخانەی سەربازی حمص مانگی ١٠٠ لیرەی وەرئەگرت دوای تەنیا دووساڵ خوێندن و بێئەوەی بڕوانامەی دواناوەندی پێبێت-ئەم موچەیە بۆ ئەو سەردەمە سامانێك بوو بۆخۆی.

بەدەستهێنانی پارە سەخت بوو، چونکە لەناوەڕاستی قەیرانی ساڵانی٣٠ دابوو. ئەوماوەیە جوتیاران زۆربەی هەرەزۆری دانیشتوانیان پێکئەهێناو بۆرژوازیی لەبنەڕەتدا پەیوەست بەزەویی و هێشتا سروشتێکی دەرەبەگیی هەبوو، و پیشەسازی قورسیش دەگمەن بوو، لەبەرامبەر ئەوەدا پیشەکان بەهەموو جۆرەکانییەوە رابردوویەکی روونـاك و نەریتی دێرینی هەزاران ساڵ بوو.

پیشەگەران رووبەڕووی ململانێیەکی توند ئەبوونەوە لەلایەن کاڵا و کەلوپەلی بەرهەمی فەرەنسا و ژاپۆن و وڵاتانی ترەوە، هەرچەندە توانیان بەرامبەر ئەمە خۆڕاگرن، بەڵام بەهەزارحاڵ، زۆریشیان کەوتنەداوی بێکارییەوە.

خەڵکی سوریا بەتوندیی دژی ئەو سیاسەتە ئابووری و کۆمەڵایەتییە ئاڕاستەکراوەی فەرەنسا وەستانەوە کە ئامانجەکەی ئەوەبوو سوریا بکاتە بازاڕێکی کراوە بۆ کاڵاکانی فەرەنسا. جەماوەری شارەگەورەکانی سوریا کە هاوسۆز و لایەنگری کۆمەڵەی میللی کۆمەڵەی نیشتمانی بوون، چەندین جار خۆپیشاندانیان کرد دژی سیاسەتی ئینتداب، مانگرتنێکی گشتییان ئەنجامداو هەموو چالاکییە بەرهەمدارەکانیان وەستاند و ئامرازەکانی گواستنەوەیان ئافەرۆز (بایکۆت) کرد.

سەرلەبەیانی یەکێك لەڕۆژانی کۆتایی مانگی دیسەمبەری ساڵی ١٩٣٠ سواری شەمەندەفەر بووین بەرەو (شامی شەریف) وەك عوسمانییەکان ئەیانوت، گەشتەکە وەك خەونێك دێتە بەرچاوم، کۆڵەکە مەزنەکانی(بەعلەبەگ)م دێتەوە یاد کەبۆ ماوەیەك لەوێ

ــــي. هەروەها سیمای (نظام الدین کبار)، مـامی (ممدوح سـلیم)م دیتـەوە یـاد کـە
ــــگەی دیەشق پێشوازی کردین.

ـ ئەوەی هەرئێستا گوێم لەدەنگی پێـی ئـەو ئەسـپانەبێت کـە بەهـەنگاوی ریتمـی
ـ ـ ـ ـە(حـەنتور)ێکـدا بردینـی بـۆ (حـی الأکـراد). کـات پـاش نیوەشـەوبوو. دوای
ـ ـ ـی تورکیا و حەڵەب لاپەڕەیەکی نوێ لەژیانمدا دەستیپێکرد.

ـ دوایی سەیرمکرد لەخانوویەکی گەورە وکۆنـدام کـە بـەباخ دەورە دراوەو لـەنزیك
ـ ـ ـێکی بچووکەوەیە. ئەم ماڵە هی یـەکێك لـەپیاوماقوڵانی کوردبـوو (عـەلی ئاغـای
ـ ـ یەکێك لەسەرانی کوردی دیەشق، پیاوێکی باڵابەرزی قـژ زەردی چـاو بەقوڵاچـووی
ـ ـستوور، لەگـەڕەکی (حي الأکـراد) لەسەرشـاخی (قاسـیون)ی بـاکووری خۆرهـەڵاتی
ـ ـکە نیشتەجێبوو.

ـەو سـەردەمە ژمـارەی دانیـشتوانی گەڕەکەکـە ٤٠٠٠٠ کـەس بـوو، لەوسـەری
ـ ـهەڵاتەوە تا پردی مس خەڵکەکە لەماڵی خۆیاندا بەکوردی قـسەیان ئـەکرد و لـەپردی
ـــەوە تا گۆڕەپانی "شەمدین ئاغا" خەڵك هەردوو زمانی کوردی و عـەرەبییان ئـەزانی،
ـ ـ پێیان باش بوو بەزمانی دووەم قسەبکەن و پاشان لەگۆڕەپانی "شەمدین ئاغا"وە تـا
ـشیخ محی الدین) دانیشتوانەکەی هەرچەندە شانازییان بەکوردایەتی خۆیانەوە ئەکرد، بـەڵام
ـ ـمەکەیان لەبیرچووبووەوە و تەنیا بەعەرەبی قسەیان ئەکرد.

ماڵەکەی "عەلی ئاغای زولفۆ" کـەوتبووە دوای پـردی مـسەوە، واتـە ئەوناوچـەیەی
هێشتا دانیـشتوانەکەی بـەکوردی قـسەیان کـرد. کـە گەیـشتینە هۆڵەکـە کەلەشـێوەی
گومەزدابوو، ژمارەیەکی زۆر لەپیاوماقووڵانی گەڕەکەکەم بینی لەگەڵ ژمارەیەك پەنابـەر و
ئەو کوردانەی خرابوونـە ژێـر نیـشتەجێی زۆرەملێـوە، لەناویانـدا قوربانیـانی سیاسـەتی
لایەنگرانەی فەرەنسا بۆتورکەکان. چاومان کەوت بە"محەمـەد و ئـەکرەم و قـەدری جـەمیل
پاشا"ی خەڵکی دیاربەکر کەچەندساڵێك پێش ئێمـە پـەنایان هێنـابووە سـوریا. هـەروەها

"حاجۆ ئاغا"ی سەرۆکی "ئافیرکان"ی کوردستانی تورکیا کە کوڕەکانی "حەسەن و جەمیل و وجابان"ی لەگەڵ بوو. هەروەها "میر جەلادەت" کە بالآیەکی بەرز و ریشێکی کورتی هەبوو و یەکێکە لەنەوەکانی دوا میرنشینی کورد لەناوچەی بۆتانی کوردستانی تورکیا. ئێمە لەبەشی تایبەت بەمیوانەکان ماینەوە و بەشەکەی تر تەرخان کرا بۆ خێزانی زولفۆ.

ئەو بەشە خێزانی عەلی ئاغای زولفۆی لێنەژیا، بەڵام چۆڵیکرد بۆ حاجۆ ئاغا و خێزانەکەی و خزمەتکارەکانی کە خواردنیان بۆ هەموو پەنابەرەکانی ماڵەکە ئامادە ئەکرد، و زیاتر لە ٢٠ کەس لەسەر سفرەکە کۆئەبوونەوە، بەگشتیی، زۆربەی ئێواران عەلی ئاغا و پیاوماقووڵانی گەڕەك ئەهاتن بۆ لامان بۆدیوەخانەکە و قاوەی عەرەبیی یا چایان ئەخواردەوە وشیرینیی دیمەشق یان میوەیان ئەخوارد و باسی زمان و سیاسەت و فەلسەفە و هەڵوێستی فرەنسایان دەکرد بەرامبەر کورد و تورك و عەرەب.

لەماوەی ئەو دانیشتنە درێژانەدا لەکوردبوونی خۆم تێگەیشتم و سەرلەنوێ فێری زمانی کوردی ئەبوومەوە، لەناخی خۆمەوە هەڵئەچووم دژی ئەو چەوساندنەوەیەی گەلەکەمی پێوە گرفتارە.

لەماوەی چەندین مانگی دوورودرێژدا چاومکەوت بەچەندین کەسایەتیی تر، خواردن و خواردنەوە و خەوتنم لەتەنیشت نەوەی میر و پاشا و بۆرژوازیی گەورە و دەرەبەگی کوردەوەبوو، کەبەشێکیان خوێندنی بەرزیان تەواوکردبوو و ئاگایان لەدۆخی جیهان بوو هەندێکیشیان نەهامەتی و ساتی کارەساتباریان بینیبوو لەزیندان ولەبەردەم دادگەکانی تورکیادا. لەناو ئەوانەدا حەمزەبەگ هەبوو لەناوچەی (میکس) کەیەکێك بوو لەکوردەکانی تورکیا و ١٠ساڵی لەزیندانەکانی تورکیادا بەسەربردبوو لەبەرئەوەی شاکارێکی "ئەحمەدی خانی" شاعیری نەتەوەی کوردی سەدەی ١٨ی بڵاوکردبووەوە. هەروەها "ئەکرەم و قەدری جەمیل پاشا"شم دێتەوە یاد کە کاتێك ئیمپراتۆری عوسمانی بۆ خزمەتی سەربازیی

بانگیان ئەکات ئەوان سەرگەرمی خوێندن ئەبن لەزانکۆکانی سویسرا، بەڵام لـەناو هـەموو کەسایەتییەکانی میوانخانەکەدا، حاجۆ ئاغا لەهەموویان کاریگەرتربوو. جەسـتەیەکی زل و دەموچاوێکی سافی هەبوو، لەگـەڵ دووچـاوی شـیندا، نـەوەی خێزانـی ئاغاکـانی خێڵـی "ئەخیلییەکان" بوو کەنیشتەجێی ناوچەی "مادییات"ی خۆرهەڵاتی ماردین بوون، هـەزار و یـەك بـەزمی بینیبـوو. حـاجۆ ئاغـا لەسـکی دایکیـدابوو کاتێـك بـاوکی لەلایـەن "سـەرۆخان"ی ئامۆزایـەوە کـوژرا. ئەودەمـە "چـەلەبی" بـاوکی بکوژەکـە سـەرۆکی خێڵەکەبوو. دوای ١٥ساڵ لەوتاوانە حاجۆ کە بووبووە گـەنجێکی بـەخۆ، لەتۆڵـەی باوکیـدا سەرۆخانی کوشت و رایکرد بۆ چیاکان، پیاوانی چەلەبی شـەو و رۆژ بەدوایـەوەبوون، بـەڵام حاجۆ توانی ماوەی زیاتر لە٥ساڵ خۆی لەتەقە و بۆسەکانیان رزگاربکات.

لەزستانێکی سەختی ئاساییدا حاجۆ نەیتوانی لەوە زیاتر بەرگـەی ژیـانی ئەشـکەوت و چـیاکان بگرێـت، بۆیـە شـەوێکیان هـەموو ئازایـەتی خـۆی کـۆکردەوە و خـۆی کـردەوە بەگوندەکەیاندا، وچووە هۆڵی میوانەکانی چەلەبی مامی و لەبەر پێیـدا راکـشا و گـەردنی خۆی پێشکەش کرد. دەستی چەلەبی خۆبەخۆ بەرەو خەنجەرەکەی کـشا، بـەڵام لەدواسـاتدا بەکاریگەریی لاوێتیی ئەو و خزمایەتی نێوانیان،خەنجەرەکەی خـستەوە کالانەکـەی و داوای لەحاجۆ کرد هەستێت و لەتەنیشتییەوە دانیشێت و پێی وت:

-تۆ بۆ ژیان دروست بوویت، نەك بۆ مـردن، وا بـۆ هـەتا هەتایـە لـەخوێنی کورەکـەم خۆشبووم و کچەکەشمت پێشکەش دەکەم کە بیکەیت بەهاوسەری خۆت. کە منـیش مـردم تۆ لەجێی من ئەبیتە سەرۆکی خێڵ. ئێستا برۆ بۆلای دایکت کە بـەردەوام دەمبـەگریان و دەستەونژابوو بۆت، سبەینێ وەرەوە تائاهەنگی دەستگیرانیتان بگێرین.

دوای ئـەوە حـاجۆ ئاغـابوو بەسـەرۆکێکی بـەهێز و خۆشەویـست لەخێڵەکەیـدا و لێپرسراوانی عوسمانی هەراسان بوون لەجەماوەرێتی ئەو. دوایئـەوەی توانییـان دەسـتگیری بکـەن لەناوچـەکە دووریـان خـستەوە. حـاجۆ کـە ئەخوێنـدەواربوو مـاوەی دووسـاڵی

زیندانییەکەی کە لەئەدەنە بەسەری برد، قۆستەوە بۆ فێربوونی خوێندنەوە و نووسین بەزمانی تورکی. لەسەرەتای ساڵی سێهەمی زیندانندا ڕێگەیەکی دۆزیەوە بۆ ڕزگاربوون و بەپێ بەناوچیاکاندا خۆی گەیاندەوە گوندەکەی.

منیش بەدەمی دابچڕاو و سەرسامییەوە گوێم لێئەگرت کاتێك بەئارامی چیرۆکی ژیانی، چیرۆکی لاوێتیی خۆی ئەگێڕایەوە. تائێستاش ڕێز وسەرسامیم بۆ کوردێکی تر هەروەك خۆیەتی، ئەویش عەلی ئاغای زولفۆی سەرپەرشتیاری (حی الاکراد)ی دیمەشق بوو، کەخێزانە گەورەکەی خۆی ترنجاندبووە ماڵێکی بچووکی گەڕەکی (ساروجە)وە تابتوانێت پەنابەرانی کورد بگرێتە خۆی.

عەلی ئاغای زولفۆ بالآی ۱۸۳ سم و چوارشانەبوو وەك وەرزشکارێکی بەهێز، دەموچاوی ئەتوت بەگوێزان قاشکراوە و قژیشی زۆر زەردبوو کە هەر لەسویدی ئەچوو. و خوا گەلێك چاکەی دارایی و ڕەوشتی پێبەخشیبوو. باپیرانی لەسەردەمی عوسمانییەوە لەکوردستانەوە هاتبوون و بەکارکردن، وەك بەلێندەری گشتیی باجگریی لەناوچە سەخت و یاخییەکاندا، دەوڵەمەندبووبوو. لەگەڵ تێپەڕبوونی کات بنەماڵەی زولفۆ بووبوونە خاوەنی گوندێکی گرانبەها کەزەوییەکی فراوانی هەبوو بۆ کشتوکاڵ و ئاژەڵداریی و بەهۆی کەشە گونجاوەکەیەوە بەهاوین و زستان و هەزاران سەر مانگای تیا بەخێونەکرا.

عەلی ئاغای زولفۆ زۆر پابەند و وەفاداری سوریای نیشتمانی بوو. ساڵی ۱۹۲۵ کاتێك سوریا دژی دەستدرێژییەکانی هێزی "ئینتیداب" ڕاپەڕی، عەلی ئاغا سەرۆکایەتی خۆبەخشانی کوردی گەڕەکەکەی کرد و زیانێکی زۆری بەهێزەکانی فەرەنسا گەیاند و لەکاتێکدا سەرکردە سەرەکییەکانی ڕاپەڕینەکە بەدیل گیرابوون، ئەو بەردەوامبوو لەشپرزەکردنی هێزە داگیرکەرەکان لەهەستیارترین شوێنەکانیدا و ڕانەوەستا تا فەرەنسیەکان بەڵێنی تەواویان پێدا.

ئەم دەرەبەگە کوردە پەیوەندیی پتەوی هەبوو لەگەڵ کەسایەتییە سیاسییە گەورەکان، چ ئەوانەی لەدەسەڵاتدابوون و چ ئەوانەی ئۆپۆزسیۆن بوون، تەنانەت فرەنسیەکانیش ڕێزیان لەرەوشتی بەرزی ئەو پیاوە نیمچەخوێندەوارە ئەگرت، کە ژیانێکی باشی هەبوو لە(حی الاکراد) و میوانداریکی باش و بەرێز و ئەدەبەوە مامەڵەی خەڵکی ئەکرد.

نەئەکرا مانەوەمان لەماڵی عەلی ئاغای زولفۆ لەوەزیاتر درێژە بکێشێت، دەمێك بوو بەدوای خانوویەکدا ئەگەڕاین. لەو دەمانەدا چوومە قوتابخانەی (برایانی مریەمی) کە لەدووقات و پێنج ژوور پێکهاتبوو و حەوشەیەکی کراوەی بچووك دەورەی دابوو و لای ڕاستی حەوزێکی بچووکەوە ترومپایەکی ئاوهەڵێنجانی دەستی دانرابوو، ئەبوو هەموو ڕۆژێك ئاوهەڵێنجین و حەوزەکە پڕبکەین بۆشتن و تەوالێت و پاککردنەوە، چونکە لەودەمەدا ئەو ماڵانەی ئاوی بەلوعەیان هەبوو دەگمەن بوون، بێگومان هەندێکجار لەهەندێك لەشەقامەکاندا ترومپای ئۆتۆماتیکی دەبینران، بەڵام هێشتا میراوەکان، کەزۆربەیان جوتیاربوون بەردەوامبوون لەسەرگەیاندنی ئاوی خواردنەوە بۆ ماڵەکان لەسەتڵ و گۆزەدا کە بەسەریان هەڵیانئەگرت.

پیاسەکان بەشەقامەکانی دیمەشقدا کۆتایی هات و نیتر نەمئەتوانی لەبازاڕی حەمیدیە یا لەبازاڕی شیرینی و میوەکان خۆم دوابخەم. سەرەنجام کاکم توانی خانوویەك بەکرێ بگرێت لەگەڕەکی (عەرنوس) لەناوەڕاستی ڕێگەی (حی الاکراد) بۆ سەنتەری شار و نزیکی قوتابخانەی مریەمی. لەو خانووەدا من و کاکم و عارف عەباس و شەوکەت زولفی نیشتەجێبووین، بەڵام نیشتەجێبوونی هاوبەشمان لەم خانووەدا درێژەی نەکێشا. عارف عەباس کارێکی دۆزیەوە. لە(حەسەکە)ی ناوەندی پارێزگای جەزیرەوە، بانگکرا بۆ قەڵاچۆکردنی کوللە و لەناوبردنی مێرووە زیانبەخشەکان،چونکە ئەزمونێکی زۆری هەبوو لەقەڵاچۆکردنی ئەم بەڵایەدا لەناوچە کوردیەکانی تورکیا، و ئەو ناوچەیەی بۆی ئەچوو دانیشتوانەکەی کوردبوون و تەنیا سنووری دەستکرد، لەناوچە کوردیەکانی تری جیائەکردەوە. دوای

دووهەفتە شەوکەت زولفی بەرەو ئەویێ بەرێکەوت بۆ وەرگرتنی پۆستی سکرتێری کۆمەڵەی خێرخوازیی کورد. کاکم ماڵەکەی رێکخستەوە و لەگەڵ چێشتلێنەرێکی بەرەگەز کورد بەناوی "دایکی عەلی" رێککەوت، کە بێوەژن بوو و کورێکی تاقانەی هەبوو، و وردە وردە کەشێکی خێزانیی لەماڵەکەدا دروستکرد، ئەم ژنە دەگمەنە،دوو ئامانجی هەبوو: خزمەتکردنی کاکم و خستنە بەرخوێندنی کورەکەی "مەمدوح"، تا ببێتە کەسێکی دیار. لەراستیدا دایکی عەلی بەڵێنەکەی خۆی بەجێهێنا و لەماوەی ئەو ۲۰ ساڵەی لای ئێمە مایەوە وەك دایکێکی راستەقینە سەرپەرشتی ئەکردم.

کاکم سەرەرای کلینکەکەی لە(عەرموس) کلینکێکی تری کردەوە لەناوەراستی (حی الاکراد) و رۆژانە پاش نیوەروان ئەچوو بۆ ئەویێ. منیش شادمان بووم بەبیرۆکەی چوونە قوتابخانەیەکی سڤیلی نویێ کە(دواناوەندی فەرەنسی)بوو لەدیمەشق.

لەراستیدا قوتابخانەکە خانوویەکی زەبەلاح بوو، بنیاتنانی تیێدا بەردەوامبوو لەسەرشەقامی فراوانی بەغداد و چەندسەد مەترێك لەماڵەکەمانەوە دووربوو، چونکە ئیتر بێزاربووبووین لەشێوازەکانی پەروەردەکردن لەدامەزراوە ئاینییەکاندا. لەناوەراستی ئۆگەستدا بیناکە تەواوبوو و دوای دووهەفتە بووم بەقوتابی دواناوەندی فەرەنسی، بەم شێوەیە ساڵەکان بەخۆشی و ئاشتییەوە تێپەری.

کاکم بەهیچ شێوەیەك لەچارەنووسی خۆی رازی نەبوو هەرچەندە ژیانێکی شیاوی هەبوو و کاریشی کەم نەبوو، بەڵام ئاخۆ ئەو نیشتمان و کەسوکار و هاورێکانی لەپێناوی ئەم بەرژەوەندییانەدا بەجێهێشتبوو؟.خەمی یەکەمی نافیز بەدیهێنانی ئارەزووەکانی بوو لەیارمەتیدانی گەلەکەیدا بێگومان بەکوردانی دیمەشقەوە، بەڵام پێش هەمووشتێك خەمی ئەو، کوردانی زۆر و زەوەندەی جەزیرەبوو کە لەهەژاریی و نەزانیی و نەخۆشیی و چەوساندنەوەدا نقووم بووبوون. هەستی ئەکرد جێگەی ئەو لەوێیە.

هەوڵیدا بچێت بۆ جزیرە، ئەو دەمانە، نە فرەنسییەکان و نەحکومەتیش ئامادەنەبوون ڕێی پێبدەن وەك پزیشکێکی تایبەت لەسنووری تورکیا نیشتەجێ بێت، چونکە ئەیانزانی ئەنکەرە نارەزایی دەرنەبڕێت.

لەرۆژێکی خۆشدا یەکێك لەکوردەکانی شام کە کارمەندی وەزارەتی تەندروستیی بوو هات و پێی ڕاگەیاند:

(هەواڵێکی خۆشم پێیە. پۆستی پزیشکی شەرعی لە"عەین دیوان" لەسەر سنووری سوریا- تورکیا بەتاڵە و تا ئێستا هیچ پزیشکێك رازی نەبووە بچێت بۆ ئەوێ. چونکە جوتیارەکان خەریکبوو پزیشکەکەی پێشوو بکوژن لەبەرئەوەی هەوڵیدابوو دەستدرێژی بکاتە سەرژنێك. لەبەرئەوە بێ دواکەوتن داوایەك پێشکەش بکە من دڵنیام قبوڵ ئەکرێت.)

کاکم چاوەڕێی ئەوەنەبوو کەس تکای لێبکات، چونکە پێشتر شارەزای ناوچەکەبوو پێشئەوەی فرەنسییەکان بیخەنە ژێردەستی خۆیانەوە، ئاخر ئەو خزمەتی سەربازیی خۆی بەپلەی کابتن پزیشك لەجزیرەی بۆتان تەواوکردبوو کە شارێکی کوردیی زۆر نزیکبوو لەعەین دیوانەوە.

بەم شێوەیە و لەبەرنەبوونی کێبڕکێ خەونەکەی هاتەدی.

سێ مانگ مۆڵەتیاندا بەنافیز بۆ سەردانی ناوچەکە و ئاشنابوون بەباروددۆخی تەندروستیی و دەستنیشانکردنی پێداویستییەکانی دەرمان. کاکم ئەو ئەرکەی لەپشووی هاویندا ئەنجامدا و دوای ئەوە منی سپارد بەئەکرەمی جەمیل پاشا. ئەو پیاوە پیاوی کاربوو. خوا چالاکییەکی پێ بەخشیبوو، کەچیای پێنەلەرزان، هەندێك زەوی کشتوکاڵی لە(سەع سەع) لەخاوەن مولکێکی کورد بەکرێ گرتبوو، من بەم بیرۆکەیە شادمان بووم.

ئەکرەم جەمیل پاشا، لەشێکی پڕی وەرزشیی هەبوو، بەڵام دەموچاوی دەموچاوێکی منداڵانەی وەك بووکەشووشە بوو. پێش شەڕی یەکەمی جیهان لەهۆڵی پۆلیل کنیك لەلۆزان ئەیخوێند و بەهۆی جەنگەوە خوێندنەکەی وەستاند، بەڵام بەردەوامبوو

لەسەرخوێندن لەرێی نامە ناردنەوە، زۆری حەز لەخوێندنەوەی کتێبی هونەریی تەکنیکی بوو لەهەموو بوارەکاندا و یەکێك لەئارەزووەکانی بەئامێریکردنی کشتوکاڵ بوو لەبەرئەوەی فرەنسییەکان نیشتەجێبوونیان لەجەزیرە لێقەدەغەکردبوو کە لەوێ خاوەن زەوییەکی فراوانبوو، خۆی تەرخانکردبوو بۆ کشتوکاڵ لەناوچەکانی دەوروبەری دیمەشق یەکەم کەس بوو کە تراکتۆری کشتوکاڵیی هێنایە سوریاوە.

جوتیارەکان لەناوچە دوورەکانەوە بەهەڵەداوان ئەهاتن بۆ تەماشاکردنی تراکتۆرەکە دەستیان پیائەهێنا و سەرسامبوون پێیی. کاتێك گاسنی تراکتۆرەکە بەقووڵیی زەوییەکە هەڵئەکەند و هەڵیئەگێرایەوە، جوتیارەکان هاواری سەرسامیان لێ بەرزئەبووەوە مولکدارەکانی "سەع سەع" خانوویەکی جوانی بەبەردی رەش دروستکراویان لەسەر گردێکی بچووك دابوو بەئەکرەم بەگ. رووبارێکی بچووك لەبنارەکانی شاخی (حەرموون)ەوە هەڵئەقوولا و بەناو گێلگەکانی گوندەکەدا تێئەپەڕبوو، لەهەندێك شوێن گۆماوی بچووکی دروستکردبوو کەماسی و مراوی و مارماسی جوان مەلەیان تیائەکرد بەهەشتێکی بچووکی راستەقینەبوو، منیش زۆرشادمان بووم بەگەڕانی ناوکێلگەکان سواربوونی کەر و ئەسپ و راوەماسی بەقولاپ و هەڵزنان بەچیاکاندا.

زۆرشادمان بووم بەدووبارە ژیان وەك رۆژانی شادمانیی مادن و رۆژانی بۆزۆ.

لەراستیدا ماوەی مانەوەم لە"سەع سەع" رۆژانێکی ئەفسانەیی بوو، تا ئەورۆژەی لەسەردارێك کەوتمەخوارەوە قاچێکم شکا و لەنەخۆشخانەیەکەوە ئەیانبردم بۆ نەخۆشخانەیەکی تر. هێشتا لەپشووی هاویندابووم کاکم لەجەزیرە گەڕایەوە، کاتێك باوەشی پیاکردم بینیم چۆن چاوەکانی پڕبووبوون لەفرمێسك و لەبەرخۆیەوە ئەیوت:

-(بەداخەوەم کە لێرە بەتەنیا بەجێمهێشتی، چونکە رێگەکەی ئەوێ سەخت و درێژە).

کاکم ئەو پۆستەی قبولکردبوو کە لێپرسراوان بۆیان پێشنیازکردبوو. هەر لەوێش چاوی کەوتبوو بەهەندێك لەهاوڕێ دێرینەکانی کەخانوویەکیان بۆ گرتبوو بەکرێ. ئەو

برینپێچەشی ناسیبوو کەلەسەر خەرجی دەوڵەت هاوکاریی ئەکات. زۆر تامەزرۆبوو بۆ ڕۆیشتن و وەرگرتنی پۆستە نوێیەکەی و منیش ئەبوو بچمە قوتابخانەی زانستیی کریستیان لەدیمەشق.

دەوروبەری ١٥ی حوزەیران، کاکم داوای لێکردم ماوەی پشووەکەم لای خۆی لە(عەمین دیوار) بەسەربەرم. ئەو سەردەمە کورتترین و ئاسانترین ڕێگە بۆ گەیشتنە جەزیرە، سواربوونی ئۆتۆمبیلی گشتیی بوو تا (حەڵەب) و لەوێشەوە سواری شەمەندەفەربووین بۆ (نسێبین)،یەکێك لەوێستگەکانی هێڵی بەرلین- ئەستەمبوڵ- حەڵەب- بەغداد و لەقامیشلیشەوە بۆ عەمین دیوار کە ماوەی ١٢٠ کیلۆمەتر بوو، ئەبوو جارێکی تر سواری ئۆتۆمبیلێکی بچووك بین. لەبەرئەوەی شەمەنەفەرەکە بەخاکی ژێردەسەڵاتی تورکیادا تێپەڕئەبوو، هەوڵدان بۆ سواربوونی شەمەندەفەر بۆ ویستگەی حەڵەب پڕمەترسیی بوو. هیچ چارەیەکم نەبوو، جگە لەگرتنەبەری ڕێگەی ئۆتۆمبیل کە (دێرزۆر)ی ئەبەست بەدیمەشقەوە، لەرێی تەدموور و شاری شوێنەوارە جوانەکانی شاژن زەنوبیاوە. ئەم ڕێگەیە ڕۆژ و تاقێکی ئەخایاند.

کاتێك ئێوارە دیمەشقت بەجێبهێشتایە لەوانەبوو بۆ ڕۆژی دوایی لای نیوەڕۆ بگەیتە دێرزۆری سەرسنووری جەزیرە. ڕێگەکە تەنها نزیکەی٣٠کیلۆمەتری تەختکرابوو و ئەویتری پڕبوو لەوچاڵ و چۆڵانەی تایەی ئۆتۆمبیل و لۆریەکان لەو بیابانەدا هەڵیانکەندبوو. هەندێکجار رووینەدا کەڕێگەکە بۆ ماوەی چەندین کیلۆمەتر بەتەواوی بەلم داپۆشرێت، بەوەش مرۆڤ ناچاربوو بەدوای ڕێگەیەکی تردا بگەڕێت بۆئەوەی لەسەر ڕێگەراستەکە بمێنێتەوە. هەندێکجاریش ئۆتۆمبیلەکان لەبیاباندا ڕێیان وننەکرد و سەرنشینەکانی تووشی مەترسی گەورەئەبوون، ئەوکاتەش ئەبوو فڕۆکە جەنگییەکانی فرەنسا بەدوای ونبووەکاندا بگەڕێن، جاریش هەبوو هەوڵەکانی رزگارکردن شکستیان ئەهێنا، ڕێبوارەکان لەتینوا یا لەگەرما یا لەسەرمادا، بەپێی وەرزەکان، ئەمردن یان ئەبوونە نێچیری گەردەلوولە لمینەکان.

بۆ خۆم چەندین جار ئەو ڕێگەیەم گرتبووەبەر بێئەوەی تووشی هیچ ڕووداوێك بم، جارێکیان نەبێت کەشۆفێرەکە ڕێگەکەی ونکرد و بەوبیابانەدا ئەسوڕایەوە، بەلاّم یەکێك لەنەفەرەکان کە لەکۆچەرییەکان بوو رزگاری کردین. خۆی بەئۆتۆمبیلەکەدا هەلّواسی ولەرێی سەیرکردنی ئەستێرەکانی ئاسمانەوە ئەو شەوە هاوینە توانی بمانخاتەوە سەر ڕێگە ڕاستەکە.

ڕێگەی نێوان دێرزۆر و حەسەکەی ناوەندی پارێزگای ئەلجەزیرە ١٦٠ کم و لەوێشەوە بۆ قامیشلی ٩٠کم بوو.

کاتێك گەیشتمە حەسەکە شەکەت و تۆزاویی بووم ولەماڵی "عارف عەباس" ئەحەوامەوە کەدوای ئەوەی توانیبووی ناوچەکە لەکوللە پاکبکاتەوە، وەك بازرگانێك لەوێ نیشتەجێبووبوو.

زۆربەی زۆری دانیشتوانی شارەکە (سریانی ئارسۆزکس و ئەرمەنی کاسۆلیك)بوون،سەرەڕای کارمەندە عەرەبەکانی خەلکی دیمەشق و هەندێك جوتیاری خەلکی دێرزۆر، بەلاّم خێلّە عەرەبەکانی دەوروبەری شارەکان هێشتا کۆچەرییبوون و لەهاتوچۆدابوون لەبەشی خوارەوەی هەردوو لقەکەی ڕووباری فورات، "خاپوور و چەق". هەر هێندەی مرۆڤ لەشارەکە ئەچووە دەرەوە و ڕوویئەکردە باکوور، خۆی لەناوچەیەکی تەواو کوردیدا ئەبینییەوە. گوندەکانی سەرگردەکان پێکهاتبوون لەشوێنەواری رووخاوی ئەو مالاّنەی لەماوەی چەندین سەدەدا دروستکرابوون وبەسەریەکدا کەوتبوون و وەك پشتێکی قەمووریان لێهاتبوو. پێش ئەوە بە ٢٠ساڵ، جەزیرە، جگەلە لەوەڕگەی ئەسپی عەرەبی هیچ شتێکی تری تیانەبوو، چونکە بەشی زۆری زەوییەکەی بەیاربوو، کە هەر بەکەلکی لەوەڕئەهات و لەبەهاریشدا ئەبووە فەرشێکی سەوزی رازاوە بەگوڵی ڕەنگاوڕەنگ وگیای لاسکدرێژ کە ئاسکی کێوی تیائەژیاو خەلك بەئەسپ و ئۆتۆمبیل ئەکەوتنە دوایان و ڕاویان ئەکردن.

با بگەڕێینەوە بۆ گەشتەکەمان، بڕینی ماوەی ٩٠کم-ی نێوان حەسەکە و قامیشلی، ٢سەعات و نیوی ئەخایاند، چونکە لەزستاندا ڕێگەکە ئەبووە قوڕوچڵپاو و دوای ١٠٠کم لەقامیشلییەوە بۆ خۆرهەڵات بەرەو عەین دیوار، پێکهاتەی زەویەکە شێوەیەکی تایبەتی وەرئەگرت لەدەشتێکی رووتەوە بەرەو زەویەکی سەرەوخوار کە ئاو هەڵیکەندبوو و بەبەردی گەورە گەورە داپۆشرابوو. لەهەندێك شیویشدا بەردی (بازلت)ی لێبوو. ئەم ناوچە گڕکانییە، لەسەردەمانێکی پێش مێژوودا بەشێوەیەکی ئەفسانەیی دەوڵەمەند بوو، بەڵام عەین دیوار ئەکەوتە سەرەتای دەشتێکەوە کە ناسرابوو بە(دەشتا هەسنان- دەشتی ئاسن) بەهۆی رەنگی خاکەکەیی و لەبەرئەوەی لەسەردەمانی زوودا ئاسنی لێدەرئەهێنرا.

پێشهاتنی فرەنسییەکان عەین دیوار تەنیا گوندێکی کوردی بچووك بوو کەدانیشتوانەکەی لە٣٠ کەس تێپەڕی نەئەکرد و کەوتبووە لێواری دۆڵی دیجلەوە.

فرەنسییەکان لەخۆرهەڵاتی دۆڵەکە، بناغەی ناوچە (ناحیە)ی دیجلەیان دانا. ساڵی ١٩٢٦ خانووی دامەزراوە دەوڵەتییەکانیان بنیاتنا و سنووریان بەفراوانی کردەوە لەبەردەم کورد و سریان ئەرمەنی تورکیادا و هانیاندان بۆ نیشتەجێبوون لەناوچەکەدا و وەرگرتنی رەگەزنامەی سوریا. لەراستیدا چەند هەزارکەسێك بەم گۆڕانکارییە قایل نەبوون، لەناویاندا مولکدارە کوردەکان کە زەوییەکانیان لەتورکیا دابڕێنراو خرایەسەر سوریا، بۆیە بەپەلە گوندێکی بچووکیان بنیاتنا و پزیشك و بنکەی پۆست و قوتابخانە و بازاڕ و چایخانە و شانۆشیان تیا بنیاتنا. هاوکات لەو ناوچەیەدا شارۆچکەیەکی بچووکی گرنگتر گەشەی کرد. لەخۆرهەڵاتی ڕێگەی قامیشلی— عەین دیوار،شارۆچکەکە دروستبوو و بەهەمان ناوی ئەو گوندەی پێشتر لەو شوێنەدابوو (دێریك) واتە (کلێسای بچووك) و سەربەبەڕێوەبەرێتیی عەین دیوار بوو و لەبەر نزیکی لەبنکە سەربازییەکانەوە ژمارەی لەدانیشتوانی عەین دیوار زیاتربوو.

لەیەکەم سەردانمدا بۆ عەین دیوار بەتاریکەشەو گەیشتم، دەرگاکە کرابووە و گوێم لەوەڕینی توندی سەگێك بوو، بیرم کەوتەوە کە کاکم لەنامەیەکدا بۆی نووسیبووم، یەکێك

لەناسیاوەکانی سەگێکی ڕەسەنی پێشکەش کـردووە لەوانـەی کـورد ڕاینـەگرت و ئـەوێـ
بەدیاری ئەیدا بەمن، هەروەها باسی ئەسپێکیشی بۆ کردبووم، زۆرم حەزنەکرد ئەو ئاژەڵا
ببینم، بۆیە چاوەڕێم نەکرد کەس بێت بەپێـشوازیمەوە وخـۆمکرد بەحەوشـەکەدا، سـەگەکـ
بەهەموو هێزی خۆی دەستیکرد بەوەڕین و هەستایە سەرپاشووەکانی و تەکانیدا بۆ پێـشەو
وەك ئەوەی بیەوێت زنجیرەکەی ملی بپسێنێت و چنگ لەگـەردنی مـن گیربکـات، هەسـت
نەکرد لەبەردەم سەگەکانی مادندام، کەواتە ئەمە ئەو سەگەیە کە کاکم بـەڵێنی پێـدابووە
ئینجا زیاتر پەرۆشی بینینی ئەسپەکەبووم. کاکم دوای ئـەوەی ماچـیکردم لەبـەر ڕوونـاکو
لایتێکی دەستیی، دەستی گـرتم و بردمـی بـۆ حەوشـەیەکی تـر، تـا گەیـشتینە بـەردە
خانوویـەکی بـچووکی پـەرپووت، و ڕوویکـردە ئـەو ژوورەی ئەکەوتـە دەسـتی چەپەو
لایتەکەی دەستی ڕووناکیی خستە سەر ئاژەڵێك کە سەرگەرمی خواردن بـوو، ئاژەڵەکـەش
سەرێکی بەرزکردەوە و حیلەیەکی کرد. کاکم لێی پرسیم (بینیت)؟

بەدڵێکی خۆشەوە وەڵامم دایەوە:

-(بەڵێ، ئەسپێکی جوانە)

-(چاوەڕێ بکە ئێستا بەجوانی پیشانت ئـەدەم) و چـاکتر لایتەکـەی لێـدا. ئەسـپێکی بەرزی جوان و نەجیبم بینی. (بەڵێ بەدڵمە، بەڵام ئەبێت بەڕووناکی ببینم) و وتیشم: (هـی خۆمانە وانییە؟)

-(بەداخەوە نا، بەڵام بەدرێژایی هاوین لامان ئەمێنێتەوە، بەمەرجێ بەچـاکی بایـەخی پێبدەیت و لەکاتی سـواربوونیدا بـەئاگابیت، یـەکێك لـەهاوڕێکانم ئـەم ئەسـپە ڕەسـەنەی لادانام) بەدەم ئەم قسانەوە دەستی گرتم و بردمی بۆلای هاوڕێکانی کە لەماڵی کـاکم نـانی ئێوارەیان ئـەخوارد. منـیش زۆر شـادمان بـووم کـە بەدرێـژایی شـەو لـەنزیك ئەسـپەکە ئەمێنمەوە.

ـەرمێزی نانخواردنەکە گفتوگـۆ بـەردەوامبوو بەتایبـەت لـەبارەی قایمقـامی عـەین ـ ـە کە کارمەندێکی دیمەشقیی ساکاربوو و فرەنسییەکان کردبوویـان بەفـەرمانڕەوای ـ ـەکی تەواو. کەسێکی زۆر ناوازە بوو، بڕیاریدابوو کەمترین پـارە لەموچـە زۆرەکـەی ـ ـکات و خانوویەکی کڕیبوو و دابووی بەکرێ بەمانگانەی ٢ لیرە و ٤٠ قرش و خـۆی ـ ـ خانوویەکی تری بەکرێ گرتبوو بەکرێی مانگانەی ٢ لیرە. میوانەکان ئەیانگێڕایـەوە ـ کارمەندەکانی ئەوێ بەڵێنیانداوە هەرجارەی یەکێکیان میوانداری ئـەوانیتر بکـات بـۆ ـ ـردن لەماڵەکەی خۆیدا و قایمقام بەشداریی نانخواردنی ماڵی هەموویانی کرد، بەڵام کـە ـ ـ خۆی هات، خۆی لێدزیەوە، بۆیە لـەو ڕۆژەوە پـشتگوێیان خـست و هـیچ کەسـێك ـگهێـشتی نەئـەکرد بـۆ نـانخواردن و قـاوەڵتی، بـەڵام ئـەم کـارە نـەبووە ڕێگـر لـەوەی ـ ـەوامبێت لەچوون بـۆ ماڵـەکان، ئـەویش پـێش نیوسـەعات یـان چـارەکێك لـەوادەی ـخواردنەکە و لەوێ ئەمایەوە و تا خاوەن ماڵ ناچارئەبوو فەرمووی لێبکات بـۆ نـانخواردن.
ـ ـێکیان کارمەندان و پیاوماقوڵانی شارەکە گەشتێك و ڕاوەماسییەکیان ڕێکخست لەسەر ـ ـاری دیجلـە و هـەموان بانگهێـشتکران جگـە لـەقایمقام. ئـەویش بەرگـەی ئـەم ـفەرامۆشکردنەی نەگرت، بۆیە ئەسپێك و ڕێنمایـەکی پەیـداکرد و کـوڕ و کـچەکەی لەگـەڵ خۆی بـرد و خـۆی گەیانـدە شـوێنی سـەیرانەکە، بـەبیانووی ئـەوەی کـچەکەی دووپـشك پێوەیـداوە و ئـەویش هـاتووە بـۆلای کـاکم بۆئـەوەی چارەسـەری بکـات. نـافیز هـیچ شوێنەوارێکی پێوەدانی بەکچەکەوە نەبینی، بـەڵام دەرزیـەکی بـۆ نووسـی. کاتێـك کـاکم خەریکی پشکنینی کچە بچکۆلەکەبوو، باوك و کوڕ لەبەردەم ماسییەکی گـەورەی بـرژاودا دانیـشتن. هـەموان سـەرگەرمی نـانخواردن بـوون، کاتێـك کـاپتنێکی فەرەنـسی کـە بانگهێشتکرابوو گەیشتە شوێنەکە. قایمقام بەدەم پاروو گلاندنەوە بەمنداڵەکانی وت:
(دانیشن و بەردەوامبن لەسەرخواردن، ئەم هەلە لەدەست خۆتان مەدەن).

ئەم چیرۆکە و چەندین چیرۆکی تـر کەبـەوردی ئەیانگێڕایـەوە وایلێکـردم تـا کـاتێکی درەنگی شەو بێداربم. کەمیوانەکان ڕۆیشتن چوونە سـەریان بۆئـەوەی لـەناو پەردەکوللـەدا بخەوین، بەهۆی گەرماوە تەنیا ماوەیەکی کەم چاوم چووەخەو.

لەباشووری جەزیرە مرۆڤ چەند لـەبیابان نزیـك ئەبێتـەوە زیـاتر هـەوا لەشـەودا فێنـك ئەبێت، کەچی لەناوچە سنوورییەکان و نزیـك چـیاکانی کوردسـتانی تورکیـا گـەرمای ڕۆژ درێژئەبێتەوە بۆ شەو و تا بەرەبەیان فێنك ناکات.

نـەمتوانی لەجێگەکـەی خـۆم بێمـەدەرەوە تـا لەدەوروبـەری سـەعات ٨ی بەیانیـدا خۆرهەڵات. دوایئەوەی تۆزێك زەوی گەرمبوو سـواری ئەسـپەکەم بـووم و چـووم بـۆ سـەر ڕووباری دیجلە کە کەمتر لە٢ کـم لێمانـەوە دووربـوو، بـۆ مەلـەکردن، کاتێـك گەیـشتمە ڕووبارەکە نەموێرا لەناوە لێڵەکەدا مەلەبکەم کە بەهۆی خێرایی تێپەڕبوونییەوە لەهەنـدێك شوێندا گێژاوی دروست کردبوو. هەستم کرد وردە وردە گەرماکە پێـستم وشـك ئەکاتـەوە. لەگەڕانەوەدا ئەسپەکە هەناسەبڕکێی پێکەوتبوو وەك ئەوەی بەشداریی پێـشبڕکێیەکی دوور ودرێـژی کردبێـت. ئیترلـەوەودوا، دوا سـەعاتەکانی ڕۆژم هەڵئەبـژارد بۆچـوونە کـەناری ڕووبارەکە بۆ ئەوەی لەکەنارەکانیدا ئەسپ سواری بکەم یـان لـەو شـوێنانەدا کـە ئاوەکـەی هێمنە مەلەبکەم.

لەودەمانەی کۆتایی ڕۆژدا سێبەری گردی عەین دیوار ئەکشایە سەربەشێکی ڕووبارەکـە و کەنارەکانی و تینی گەرماکە کەم ئەبوو، و شوێنەکە زۆرکەسی تریشی بۆ گەشت و مەلـە ڕائەکێشا. هەندێکجاریش کاکم لەگەڵ هەندێك لـەهاوڕێ ڕاوچـییەکانی ئـەهات و هـەموو جارێك بەتەریی لەم ڕاوانە ئەگەڕاینەوە.

لەماڵەوە هێشتا ئاوی بەلوعەمان پێنەگەیـشتبوو،ئەبوو دەسـتبگرین بـەو ئـاوەوە کـە لەکانی ناوچەیەکی ترەوە بەپشتی کەر بۆمان ئەهات. هێنانی ئاو کـارێکی سـەخت بـوو و ژمارەی میراوەکانیش کەمبوو، بۆیە ئاو بەهادار و گران بوو.

وەك هەموو ناوچەكانی جەزیرە، ناوچەی عـەین دیـواریش بـەهۆی شـەڕی بـەردەوامی نێوان خێڵە جیاوازەكانەوە بووبووە ناوچەیەكی رووتەن. چونكە عوسمانییـەكانیش بەهـەموو توانایانەوە هانی ململانێ خێڵەكییەكانیان ئەدا، جا ململانێی كوردی بوایە یـان عـەرەبی، جوتیارەكانیش نەیانەوێرا مێو بچێنن و هێشتا پـەمووش نـەهاتبووە ناوچـەكە. سـەرۆكی شارەوانی عەین دیوار (عەبدولكـەریم مـەلا صـادق) یـەكێك بـوو لـەپیاوماقوڵانی كـورد كەنزیكەی ٢٠ گوندی هەبوو لەدەورووبەری شارۆچكەكە و پێشتر لەجـەزیرەی ئـیبن عومـەر كاكمی ناسیبوو.

پیاوێكی زیرەك و خوێنـدەوار و زۆر بەخـشندەبوو، بـەڵام حـەزی لـەكاركردن نـەبوو و زۆربـەی كـاتی خـۆی بـەیاری كاغـەز و خوێندنـەوەی رۆمـان و خـواردن و خواردنـەوە بەسەرئەبرد. لەگەڵ ئەوەشدا كاكم توانی قایلی بكـات كـە تـاوی كانییەكـە لەگۆماوێكـدا كۆبكاتەوە و بەكاری بهێنێ بۆ كـشتوكاڵی بێـستان. عەبـدول كـەریم ئەفەنـدی بـەباوەڕی تەواوە بەسەركەوتن و سوودمەندیی پرۆژەكە، دەستیكرد بەئەركەكە و بەناوی شـارەوانییەوە لەدیمەشـق و توركیـا و تەنانـەت عێراقیـشەوە شـەتڵی بـچووكی میـوەی هێنـا و لەمبەروئەوبەری دۆڵەكەدا روانـدی بەشـێوەیەك كـەبتوانرێت بـەئاوی گۆماوەكـە ئـاودێری بكرێت.

دوای دووساڵ خەڵكی عەین دیوار هەموو جـۆرە میوەكـانی خۆرهـەڵاتی ناوەڕاسـتیان خوارد، هـەر لەقۆخـەوە تـا هـەنجیر و لەبـەردەم ئـەم سـەركەوتنە گەورەیـەدا جوتیـارانی ناوچەكانی دەورووبەر چاویان لەوكرد و كەوتنە دروستكردنی باخ.

پاش چەندساڵێك دەستیانكرد بەفرۆشتنی ترێ و میوەی تر لەبازاڕەكانی عەین دیـوار و دێریك و قامیشلی و ساڵی ١٩٤٥یش كاكم كشتوكاڵی پەمووی هێنایە جەزیرە كـە ئێـستا یەكێك لەسامانەكانی ناوچەكەیە. ئەو تەنیا سەركەوتنی ئەونەبوو، وەك پزیشكێك تـوانی بەسەر گومانی دانیشتوانەكەدا سەربكەوێت- لانیكەم ٩٠٪ جوتیاران- ئـەویش بەزانـستی

مـۆدێرنی پزیـشکیی. هەنـدێك لەپزیـشکە میللییـەکان و پیـاوانی ئـایینی موسـڵمان و کریستیان و ئێزیدیی، هەوڵیان ئەدا گیانی دوژمنکـاریی بەرامبـەر پزیـشکەکان بـوروژێن، بەڵام بەهۆی پسپۆڕیی و شارەزایی و کۆڵنەدان و دانبەخۆداگرتنەوە، نافیز تـوانی وردە وردە خەڵکەکە قایل بکات کە زانستەکەی ئـەو کاریگـەرترە لەوکەسـانەی ئەیانـەوێت لـەنرخ و بایەخی کەمبکەنەوە. کە گەیـشتنە عـەین دیـوار بـەخت یـاوەریبوو بەناسـینی راوێـژکار "ئەلفۆنسیۆ" کـە مـولازم یەکـەمێکی کۆرسـیکایی بـوو و پیـاوێکی چـاکبوو،و ئـەرکی مرۆڤانەی فەرەنـسای گرتبـووە ئەسـتۆ، هـەردووکیان لەیـەك نزیکبوونـەوە و راوێژکارەکـە پشتیوانی تەواوی لەکاکم ئەکرد.

دوای چەند مانگێك لەنیشتەجێبوونی، کاکم جگە لەلەرزوتا، ژمارەیەکی زۆر نەخۆشـی (سفلس)ی دۆزییەوە بەتایبەت لەگوندەکانی ئەو ناوچانەی نزیکن لەخێڵە کۆچـەرییەکانەوە. بەهۆی پشتیوانی (مولازم ئەلفۆنـسی)وە لـەرێی ناوچـەکانەوە فرمـانێکی بڵاوکـردەوە بـۆ دانیشتوان کە بێن بۆئەوەی بەخۆڕایی بیانپشکنێ، کاکم ئامادەبوو گوند بەگوند بگەڕێ بـۆ پشکنینی دانیشتوانی ناوچە دوورەدەستەکان بەتایبەت لەناو کۆچـەرییەکاندا. ئـەم پرۆسـە فراوانـە چـەند مـانگێکی خایانـد و نـافیز تـوانی رێژەیـەکی بـەرزی کەسـانی تووشـبوو بـە"مـەلاریا و تـەراخوما و سـفلس" لـەناو خەڵکەکـەدا بدۆزێتـەوە. دوای دۆزینـەوەی نەخۆشییەکە ئەبوو بکەوێتەخۆ بۆ دابینکردنی دەرمـانی پێویـست. بنکـە تەندروسـتییەکە مانگانە بڕی پێویست لەقەترەی نەخۆشییەکانی "چاو و کینین"ی بـۆ چارەسـەری مـەلاریا وەرئەگرت، بەڵام دەرزی "نیوسلفران"، دەرمانی کاریگەریی ئەو سـەردەمە بـۆ چارەسـەری سفلس زۆر بەکەمی ئەدرا بەدامەزراوەکانی دەوڵەت.

کاکم بەپەلە لیستێکی دەرمانەکانی ئامـادەکرد لەگـەڵ راپـۆرتێکی دوورودرێـژ و داوای لەئەلفۆنسیۆ کرد لای وەزارەتی تەندروسـتی هـەوڵی بـۆ بـدات، لەئیەنجامی ئـەم هەوڵانـە لەماوەی مانگێکدا بنکە تەندروستییەکەی عەین دیوار پڕبوو لەکارتۆنە دەرمان بەتایبـەت

(نیوسلفران)، و هەموو شێوازێکی گرتەبەر لەئامۆژگاریی وئاگادارکردنەوە و هەڕەشەکردن و سزای پارە بۆئەوەی نەخۆشەکان ناچاریکات خۆیان چارەسەربکەن. دوای ساڵێك شەڕەکەی سەرکەوتنی بەدەستهێنا ونەخۆشی سفلس بەتەواویی لەگوندە کوردییەکاندا بنەبڕبوو، بەڵام لەناو گوندە کۆچەرییەکاندا شەڕەکە تا رادەیەك شکستی خوارد، چونکە بەردەوام لەهاتووچۆدابوون و پەیوەندیی لەگەڵیان سەختبوو.

لەوساتەوە ناوچەی عەین دیوار یادگارییەکی لەبیرنەچووەوەی بۆ کاکم و مولازمی یەکەم ئەلفۆنسیۆ تۆمارکرد کە هەموو توانایەکی خستبووەگەڕ بۆ نەهێشتنی نەخۆشییە پەتاکان لەناوچەکەدا. بەبەراورد لەگەڵ زۆربەی ئەو فرەنسییە سڤیل و سەربازییانەی لەسوریا کاریان کردبوو، مولازمی یەکەم ئەلفۆنسیۆ کەسایەتییەکی تایبەتی هەبوو، چونکە هەوڵێنەدا سوود بەجووتیارانی ناوچەکە بگەیەنێ لەهەموو ئەوشتانەی فرەنسا پێشکەشی مرۆڤایەتی کردبوو. رۆژێکیان نوسەرێکی گەنجی کورد بەناوی "مستەفا بۆتی"، داوای لێنەکات رێی بدات خوێندنگەیەك بکاتەوە و زمانی کوردی تیا بڵێتەوە، بیرۆکەکە بەلای ئەلفۆنسیۆوە ئاسایی ئەبێت، بەشێوەیەك داوای رای (راوێژکاریی باڵا) ناکات و تیشکی سەوزی ئەداتێ بۆئەوەی دەستپێبکات و بەڵێنی ئەداتێ کە: (شوێنێکی گونجاو بدۆزەرەوە و یەکسەر دەستبەکاربەو چاوەڕێی مۆڵەتی فەرمیی مەکە، ئەویشت بەم زووانە پێئەگات).

مستەفابۆتی بەهیمەتێکی گەورەوە سەرگەرمی کاری فێرکردن ئەبێت، بەبڕوای تەواوەوە و بەبەڵێنەکانی ئەلفۆنسیۆ، بەڵام مانگێکی پێناچێ ئەلفۆنسیۆ وەڵامی نەرێی لێپرسراوانی پێئەگات و پێی ئەڵێن:

(ئەو هەڵوێستانەی فرەنسا بەرامبەر وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست گرتوویەتیەبەر رێی نادەن سەرکێشییەکی لەوشێوەیە بکات.)

مولازمی یەکەم ئەلفۆنسیّ بەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە داوای لێبوردن لەبۆتی ئەکات و ئەڵێت: (بەڕاستی باوەڕناکەم! چۆن حکومەتەکەم ئەتوانیّ مافی سروشتیی کوردەکان رەتبکاتەوە لەوەی بەزمانی خۆیان بخوێنن و بنووسن؟!).

دوای ئەو رووداوە بۆتی کەهەست بەسوکایەتیی ئەکات، ناوچەکە بەجێئەهێڵێت لەگوندێکی بچکۆلەی باکووری کوردستانی ئێران بەمەلایی نیشتەجیّ ئەبێت.

لای خۆیەوە کاکم بەهەمان شێوازی لەناوبردنی نەخۆشییەکان هانی خێزانەکان ئەدات منداڵەکانیان بنێرن بۆ خوێندنگە. کاتیّ کاکم لەعەین دیوار نیشتەجێبوو بووە مایەی سەرسووڕمانی ژمارەیەك لەو کوردانەی رانەهاتبوون بەزمانی کوردی قسەبکەن، ئێستاش سەرسامبوونی ئەحمەد ئاغای یەکێك لەسەرۆکەکانی خێڵی (ئاشیتان)ی کوردی نیشتەجێی ناوچەی قامیشلیم لەبەرچاوە، کەچەفتە و عەگال و جزداشەی پۆشیبوو، وەك یەکێك لەشێخەکانی عەرەب و شمشێرێکی درێژی زیوینی پێبوو، بەزمانێکی عەرەبیی ئارام بەڵام تێکشکاو، رووی قسەی کردە کاکم.

ئەویش بەشێوەیەکی توند وەڵامی دایەوە:

-بەزمانی کوردی قسەبکە!

ئەحمەد ئاغا، بەشادمانییەوە هاواریکرد:

-چۆن؟! پزیشکێکی کورد هەیە لەم جیهانەدا ؟!

-بێگومان، چونکە من یەکێکم لەوان.

ئەحمەد ئاغاش، پێش ئەوەی بەزمانە کوردییەکەی باسی نەخۆشییەکەی بۆ کاکم بکات وتی:

-کەواتە ئەمە دیارییەکە و خوا بەسەریدا باراندووین.

نافیز لەگەڵ ئەوەی بایەخی بەچارەنوسی گەلی کورد ئەدا و هەوڵیئەدا نەخۆشییەکانی چاکبکاتەوە و لەئازارەکانی کەمبکاتەوە، ویارمەتی بدات بۆئەوەی ناسنامەی خۆی

بزانێت، هاوکات هەموو هەوڵێکی خستبووەگەڕ بۆ خزمەتکردنی خەڵکی هەموو نەتەوەکان، رۆژێکیان گوێم لێبوو پیاوێکی پیری ئەرمەنی بەکاکمی ئەوت: (تۆ پزیشکێکی چاکی، دکتۆر تۆ زۆرباشیت....خوا بۆئێمەی ناردویت.)

نزای لەوجۆرە زۆرجار لەدەمی خەڵك ئەهاتە دەرەوە، ئینجا کوردبوونایە یان عەرەب، موسڵمان یان کریستیان یان جولەکە.

کاکم تا ساڵی ١٩٣٥ لەعەین دیوار مایەوە تاگواسترایەوە بۆ قامیشلی و وەك پزیشکێکی میری تا ساڵی ١٩٣٧ لەوێ کاریئەکرد. بەڵام لەبەرئەوەی نەیئەویست جەزیرە بەجێبهێڵێ، وەك پزیشکێکی ئازاد کاریکرد و کلینکێکی کردەوە وەك چۆن پێشتر لەدیاربەکر و حەڵەب و دیمەشق ئەمەی کردبوو.

لەماوەی چەندین ساڵدا بەهۆی ئەو جەماوەرێتییەوە کە هەیبوو فرەنسییەکان نەیانوێرا هیچی لێبکەن، سەرەڕای نارەزایەتییەکانی دەسەڵاتدارانی تورك، تەنانەت نەخۆشەکانی خۆشیان ئەنارد بۆلای ئەو بۆ چارەسەرکردن.

نافیز رۆژانە ١٠٠ نەخۆشی ئەپشکنی، و چارەسەر و دەرمانی بەخۆڕایی ئەدا بەهەژارەکان، و لەسەر رەچەتەکانیانی ئەنووسی لەسەرحسابی خۆم، بەڵام بۆ نەخۆشەکانی تر تەنیا ٥ لیرەی لێوەرئەگرتن و کاتێك هەندێك لەهاوڕێکانی گلەییان لێئەکرد کەنرخی پشکنینەکەی زۆربکات،بەدەنگێکی ئارام و بەباوەڕەوە وەڵامی ئەدانەوە:

-کاتێك ٥ لیرەیان لێوەدەگرم زۆرشادمان ئەبن، کاریگەریی شادییەکە ئەچێتە پاڵ کاریگەریی ئەو دەرمانەی بۆیان ئەنووسم، وەك پزیشکێك دڵشادئەبم بەوەی ئەبینم ئەو نەخۆشانەی من چارەسەریان ئەکەم بەزووترین کات چاکئەبنەوە.

-بەڵام ئەو پزیشکانەی لەناو سوریاوە یان لەلوبنانەوە دێن. ١٥ لیرە بۆ راوێژو ٢٠ لیرەش بۆ دەرزییەکی سادەی کینین وەرئەگرن.

-ئەوساڵانەی باران لەجەزیرە زۆرئەبێت، مێشوولە کەشێکی گونجاوی دەست ئەکەوێت بۆگەشەکردن و بڵاوکردنەوەی مەلاریا، لەو ساڵانەدا بەرهەمیش زۆرئەبێت و جوتیارەکان ڕێئەدەن بەئاسانی پزیشکە هەلپەرست و بێ ویژدانەکان بیانڕەتێنن.

-دکتۆر پێویستە بیر لەئایندەبکەیتەوە، چونکە ئەم چالاکیی کارکردنەت بۆ هەتاهەتایە بەردەوام نابێت.

کاکم بەورتەورتێکەوە ئەیوت:

-هەرکەسە و بەپێی ویژدانی خۆی هەڵسوکەوت ئەکات.

کاکم، زۆر بەتوندیی ڕووبەڕووی ئەو پزیشکە تەڵەکەبازانەش ئەبووەوە کەگیرفانی خەڵکی هەژاریان بەتاڵ ئەکرد و زیانیشیان بەتەندروستییان ئەگەیاند، تەنانەت هەندێکجار ئەبوونە هۆی مردنیان، لەوانەش دکتۆر "بۆگۆس" کەبەتوندی بەرامبەر بەکاکم بەرگریی ئەکرد، ئەم دکتۆرە نەرمەنی بوو و ناسراوبوو بە"بۆگۆسی حەمامچی"، چونکە گەرماوێکی هەبوو لەتەنیشت کلینکەکەیەوە و پارەیەکی زۆری لێدەستئەکەوت.

ئەو پزیشکەی پێش کاکم هاتبوو، هەوڵیدابوو سنوورێك بۆ کارە ناشەرعییەکانی دکتۆر "بۆگۆس" دابنێت، لەبەرامبەر ئەمەدا دکتۆر بۆگۆس بڕیاریدابوو کەلەوەودوا خەڵك بەخۆڕایی ببینێت و واز لەبەرزکردنەوەی نرخی ئەو دەرمانانە بهێنێ کەخەڵك لەدەرمانخانەی یەکێك لەناسیاوەکانی ئەیکڕن، پاشان پزیشکەکە هەڕەشەی لێدەکات کە پەنانەباتەبەر جێبەجێکردنی قانون لەدژی، بەڵام بۆگۆس پەنائەباتەبەر شێوازێکی تر. شەوێك یەکێك لەپیاوەکانی ئەنێرێت دەرگای ماڵی پزیشکەکە بەگوو سواغ ئەدات، ئەم کارە ئەبێتە مایەی ترس و قێزی دکتۆرەکە و بەپەلە ئەگەڕێتەوە بۆ دیمەشق و خۆی ئەگوێزێتەوە بۆ شوێنێکی تر.

کاتێك کاکم ئەگاتە قامیشلی، دکتۆر بۆگۆس ئەبێتەهۆی مردنی ئاغایەکی بەناوبانگی کورد. بەشداریی لێکۆڵینەوە ئەکات و بۆی دەرئەکەوێت کەدکتۆر حەمامچی نەشتەرگەرییەکی ترسناکی بۆ ئەنجامداوە تەنانەت بەبێئەوەی کەلوپەلەکانی پاکژبکات

بکات و شارەزای هەلّدڕینی لەشی مرۆڤ بێت، لـەوەدڵنیابوو ئاغـا بـەهۆی هەوکردنێکـەوە مردووە،دوای ئەوە دروستبووە کە بۆگـۆس دومـەڵێکی سەرسـنگی کردۆتـەوە. زۆر زووش کاکم لەوەگەیشت کە ئاغا یەکەم قوربانیی نـەزانیی دکتـۆر بۆگـۆس نـەبووە، بۆیـە کـاکم فەرمانی پێئەدات دەست لـەوکارە تاوانکارییـە هەڵبگرێت،ئـەویش لـەجیاتی گوێڕایـەڵی، بەدەمانچەیەکەوە دێتەسەرکاکم و هەڕەشەی لێئەکات، ئەویش پێی ئەڵێت:

-گـوێبگرە، "بـارۆن بۆگـۆس"، لەسـەردەمێکی بـێ سـەروبەرەییدا و بـەهۆی ئـەو پزیـشکانەوە کـە سـوکایەتییان بەبەرپرسـیارێتییەکانی خۆیـان کـردووە، توانیوتـە بەدەسـتکراوەیی کاربکـەیت و سـامانێکی زۆر کۆبکەیتـەوە. لەمـەودوا رێـت پێنـادەم بەئارەزووی خۆت بجولێیتەوە، گەر تۆ ئەرمەنیت، ئەوامنیش کوردم، بیر لـەکارەکانی خـۆت بکەرەوە ودەست لەم یارییـە هـەلگرە، گەرماوەکـەت داهـاتێکی زۆرت بـۆدابین ئـەکات و کارێکی چاك ئەکەیت کە بایەخی پێبدەیت و تازەی بکەیتەوە.)

بۆگـۆس لای کـاکم هاتـەوە دەرەوە و گەیـشتبووە ئـەو بڕوایـەی کـە سـەردەمی بێسەروبەرەیی لەکاری پزیشکیدا بۆ هەتاهەتایە لەجـەزیرە بەسەرچـووە. هەوڵیـدا لـەرێی رێکەوتن لەگەڵ پزیشکێکی گەنجی شاری حەڵەبەوە ڕەوایی بدات بـەکاری پزیـشکییەکەی، ئەویش بەوەی کلینکەکەی ئەداتێ و ناوی پزیشکەکە لەسەر تابلۆی بەردەرگاکە ئەنوسـێت، دوای چەند هەفتەیەك پزیشکەکە ئەگەڕێتەوە بۆ حەڵەب و تابلۆی سەردەرگای کلینکەکـەی بۆدکتۆر "بۆگۆس" بەجێئەهێڵێ، بۆگۆسیش بەردەوام ئەبێت لەکاری پزیشکی، بۆیـە کـاکم داوای دەسـتێوەردانی دەسـەڵاتی دادوەریـی ئـەکات، کـە بـەزوویی فێڵەکـەیان بۆیـان ئاشکرائەبێت و ئەو پزیشکە تەڵەکەبازە ئەگرن و تەنیا بەمەرجێك بەرێئەدەن کە ئیتر کـاری پزیشکیی نەکات و تەنیا خەریکی گەرماوەکەی و ئەو مولکانەی بێت کـە لەناوشـارەکە و دەوروبەریدا کڕیونی.

لەکارخـستنی دکتـۆر بۆگـۆس، هـەموو خـەلکی قامیـشلی شـادمان کـرد بەئەرمەنەکانیشەوە کەپێشتر هاوڕێی کاکم بوون. جگە لەژمارەیەك لەهاوڕێ و خزمـەکانی

دکتۆری کەڵەکچی، نەخۆشە ئەرمەنییەکان کە جگە لەزمانی ئەرمەنی زمانێکی تریان نەئەزانی سەرسام ئەبوون کاتێک کاکم بەزمانی خۆیان پرسیاری لێئەکردن و بەسەرسوڕمانەوە ئەیانپرسی (ئایا دکتۆر ئەرمەنییە؟).

سەرەڕای هەموو هەوڵەکانی کاکم و هاوڕێکانی کەژیانێکی خۆشم بۆ دابین بکەن، هیچ یادەوەرییەکی خۆشم لەبارەی عەین دیوارەوە نەبوو. ئاخر من کە لەوڵاتێکی شاخستانی فراواندا گەورەبووبووم، بەرگەی گەرمای تاقەت پڕوکێنی هاوینانی ئەم دەشتە رووتەنەم نەئەگرت، چونکە چیابەرزەکان و لوتکە ئەفسانەییەکانی وەك چیای جودی لەژێردەسەڵاتی تورکەکاندا مابووەوە. کۆمەڵێك بارودۆخ و رێکەوت ئەو پارچەیەی کوردستانی لەوبەشە دابڕی کە فەرەنسا خستبوویە ژێردەسەڵاتی خۆیەوە. لەڕاستیدا ئەم شاخ و دەشتە لەوەڕگانەی کەبەربەستێکی سیاسیی لێیدابڕین،دژی ویستی گەلی کوردبوو و ئازاری دڵیان ئەدام و رۆژانە چەندین سەعات لێم ئەڕوانین و ئاخ و داخم بوو بۆ ئەم چارەنووسە.

رۆژێکیان لەیەکێك لەراوێژکارە فەرەنسییەکانم پرسی:

-(بۆچی هێزەکانتان پێشڕەویان نەکرد بۆ پشت ئەو چیایانە تابیانخەنەسەر ئیمپراتۆرییەکەی خۆتان و چیاکانی ئەلبی ولاتانی خۆتانی بیرنەخستنەوە؟ ئەوکاتەش ناچاربوون دەوڵەتێکی کوردی دروستبکەن کە لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا ئەبووە پشتیوانتان.)

وەڵامی دامەوە:

-(بێگومان لەبەرئەوەی کلیمانسۆ سەردانی کوردستانی نەکردووە.)

ساتێکی وروژێنەربوو، کاتێك چووم بۆ گوێگرتن لەمیوزیکی کوردی، هەڵپەرکێی ناوچە جیاجیاکانی کوردستانم بینی. ئەمە لەسەرەتای مانگی ئەیلولدابوو کاتێك جوتیارەکان سەرگەرمی کۆکردنەوە و ئامادەکردنی ئازووقەی زستانبوون، ئەوکاتە فۆلکلۆر دەرئەکەوێتەوە، چونکە هەموکارەکان وەك کوتانی گەنم بۆ ساوەر هاوکاتە لەگەڵ گۆرانیی

و سەمای تایبەت کە تابەرەبەیان ئەخایەنێت و هەندێکجاریش گۆرانیبێژ و مۆسیقارە پیشەییەکان بانگئەکرێن بۆشەو ئاهەنگی درێژ، لەگەڵ ئاوازی (بلوێر و تەنبوور) شمشاڵژەنەکان ئەیانتوانی لاسایی دەنگی پێ و حیلەی ئەسپ و بکەنەوە، خەڵکیش لەگەڵ ئاوازی دەهۆڵ و زورنادا هەڵئەپەڕین. بەشدارانی گۆڤەندەکە دەستی یەکیان ئەگرت یان دەستیان ئەخستە ناوقەدی یەکتر و جلوبەرگی رەنگاورەنگیان لەبەردابوو،کە ئاماژەبوو بۆکاری هەرەوەزیی دێهات و هەڵپەڕینە سروشتی و جەنگییەکانیان و دەربڕینی شادمانیی بوو بەکۆتایی هاتنی کاری سەختی کێڵگەکان لەگەرمای سوتێنەری هاویندا. وردە وردە لەگەڵ گەورەبووندا ئەوەم بۆ روون ئەبوەوە کەگەلێك یان راستر بڵێم نەتەوەیەك هەیە خاوەنی مێژوو و جوگرافیای خۆیەتی وناسنامەی سەربەخۆی خۆی هەیە لەزمان و، کەلتوور و دابونەریتی خۆی لەلایەکەوە، و ئەو سیاسەتە رەگەزپەرستییە نامرۆڤانەیەی دژی پەیرەوئەکرێت لەلایەکیترەوە، هەموونەمانە بەتوندیی هانیدام بۆ بایەخدان بەتایبەتمەندییەکانی. چۆن پارچەپارچەکردنی ولاتێك و بلاوەپێکردنی گەلەکەی و لکاندنی بەچەند ولاتێکەوە کەبەپێی بەرژەوەندیی سیاسیی و ئابووریی ولاتانی زلهێز دروستکرابوون، کارم تێنەکات؟ چۆن نەمتوانی دەستەوەستان بم لەبەردەم جێبەجێکردنی چەندین پیلان بەمەبەستی تەفروتوناکردنی ئەم گەلە؟ چۆن نەمتوانی هەست بەشەرمەزاریی نەکەم کاتێك ئەمبینی جووتیارانی کورد بێبەشکراون لەمافی دەبڕین و بەرگریکردن لەخۆیان بەزمانی تایبەتی خۆیان لەبەرامبەر پۆلیس و کارمەندانی دەوڵەتدا؟ چونکە جەماوەری کورد کە زۆربەیان جووتیار بوون و نەزانین کوێری کردبوون، رێکخستنی کۆمەلایەتی خێڵەکی کۆتوبەندی کردبوون، سەرۆکەنایینیی و دنیاییەکانیان پشتگوێیان خستبوون، بۆیە جەماوەر دەستەوەستانبوون لەرووبەڕووبونەوەی هەژاریی فراوانی دارایی و مەعنەوی و پێکەوەبەستنی چارەنووسی خۆیان لەگەڵ ئەوکارەساتەی گەلەکەیانی تیائەژی و قوڵهەڵماڵین

بۆ خۆرزگـارکردن. تـۆ بڵێـی ڕووناکبیرانی تـریش شانبەشـانی کـاکم خـەبات بکـەن بـۆ بێدارکردنەوەی میللەتەکەیان لەم خەوە؟

یەکەم کەس کە وێرای ئاڵای نیشتمانپەروەریتی بەرزیکاتەوەوبانگی میللەت بکـات بـۆ خۆرزگــارکردن لــەداب و نــەریتی بەسەرچــوو و شــێوازە ســۆفیگەرییەکان، مــەلا "جگەرخوێن"بوو کەجبەکەی فڕێدا.

ئەو شـاعیرێکی بـەهرەداربوو کـە شـیعرەکانی لـەدیوەخانی ئاغاکـان و چـایخانەکان و گۆڕەپانە گشتییەکاندا ئەخوێندەوە و بانگی کوردی ئەکرد بۆ یەکگرتن لەپێناو رزگـارکردنی نیشتمانەکەیاندا.

فرەنسیەکان کەهەستیاربوون بەرامبـەر هێرشـی ڕاسـتەوخۆ بـۆ سـەرخۆیان، تەنانـەت ڕێگەیان بە"جەلادەت بەدرخان"دا ڕۆژنامەی "هاوار" دەربکات کە ٣ سـاڵ و ٣ مـانگ و ٣ ڕۆژ لەدیمەشق بەردەوامبوو تا ئەوکاتەی دەسـەڵاتی ئینتـدابی فرەنـسا سیاسـەتی خـۆی بەرامبەر بەکورد توندکرد. هۆکارەکەشی ئەوەبوو کە لەسـاڵی ١٩٣٧دا نیـشتمانپەروەرانی کورد یارمەتی سوریەکانیاندا لەتێکۆشـانیاندا بـۆ رزگـارکردنی وڵاتەکـەیان و ڕێوشـوێنی توندوتیژ دژی کورد بەگشتیی و ڕووناکبیرەکانی بە تایبەتی، گیرایەبەر.

زیاد لە١٠کەسیان لێدەستگیرکرا و دوورخرانەوە بۆ تەدمور و دیمەشق. لەناوگیراوەکانـدا "عارف عەباس"ی تیـابوو. ئەوکاتـە لـەدێریك نیـشتەجێبوو. کـەدووریش خرایـەوە مـن لەماڵی ئەوانبووم، بۆیە ماوەی مانەوەکەی درێژکرایەوە تـا بایـەخ بـەکاروباری خێزانەکـەی بدات، لەوکاتەدا بەکرێگیراوانی خزمـەتگوزاریی تایبـەتی فرەنـسا "موخابـەرات" ڕۆژانـە ئەهاتنەسـەرمان و ئەیانترسـاندین و هەڕەشـەی کوشـتنیان لێئـەکردین، گـەر لـەدێریك بمێنینەوە.

رۆژێکی کۆتایی ساڵی ١٩٣٧ کاکم هات بەدوای مندا. لەسەر ڕێی گەڕانەوەبووین بۆ قامیشلی لەئۆتۆمبیلێکی تایبەتی بچووکدا، کاتێك کۆمەڵێك چەکدار ڕایانگرتین، کاکم کە بەهۆی ئەوەی پێشتر چارەسەریکردبوون ناسینیەوە و لێپرسین:

-(چیتان ئەوێت؟!)

سەرۆکەکەیان کە ناسراوبوو بە(بۆرۆ) چونکە ڕەنگی دەموچاوی سووربوو، سریانییەکی خەڵکی (هەزەخ) بوو وەڵامیدایەوە:

-(جێگەمان بکەنەوە لەئۆتۆمبیلەکەتان تا قامیشلی.)

-(بەداخەوە جێی چۆڵمان نییە.)

دووان لەچەکدارەکان لەگەڵ کردنەوەی دەرگای ئۆتۆمبیلەکەدا وەڵامیان دایەوە:

-(هەرچۆنێك بێت جێی خۆمان ئەکەینەوە.)

لەناو ئۆتۆمبیلەکەدا (عەفدی تیلۆ)مان لەگەڵ بوو کە یەکێکبوو لەنیشتمانپەروەرانی کورد و بەئازایەتی بەناوبانگبوو، و لەهەموو سەفەرەکانیدا تفەنگە (ماوزەر)ەکەی پێبوو، منیش کە لەسەر کورسییەکی دواوە دانیشتبووم، تفەنگێکی ڕاوم بەدەستەوەبوو. کاتێك تاقمەکە ئەو تفەنگانەیان بینی، بەلایانەوە چاوەڕواننەکراوبوو و سڵیان کردەوە، بەڵام هەر هەوڵیاندا بێنەناو ئۆتۆمبیلەکەوە. نیازی ئەو بەکرێگیراوانە ئاشکرابوو. تیلۆ تەفەنگەکەی هێنایەسەرپێ وداوای لەسێ پیاوەکەی تریش کرد کە ئەوانیش هەمانشت بکەن، بۆیە پیاوخراپەکان پاشەکشەیان کرد و ئاماژەیان بەشۆفێرەکەدا کە بکەوێتەڕێ.

دوای چەند کیلۆمەترێك تیلۆ لەکاکمی پرسی:

-(تۆ بڵێی بەنیازی چیبن؟)

-ئاسانە، گەر سواربوونایە شۆفێرەکەمانیان ناچارکرد بەرەو باشوور بڕوات و لەناوچەیەکی بیاباندا چەند فیشەکێکیان ئەنا بەسەرمانەوە ولاشەکانمانیان بۆ داڵ و ڕێوی بەجێئەهێشت و دوایئەوە ئەچوون ئەو خەڵاتە وەربگرن کە بەڵێنیان پێدراوە.

ساڵی ١٩٣٧ سەرەڕای نەهامەتییەکانی کوردانی جەزیرە لەئەنجامی ململانێی سوریا و فەرەنسا، نەهامەتی دووناوچەی کوردستانی تورکیاشی هاتەسەر، یەکەمیان "ساسۆن" کە ناوچەیەکی شاخاوی پارێزگای "سیرت"ە، بەرگریی دژی سوپای تورکیا بەسەرکردایەتی خێزانی "عەلی یوسف" دوای ١٢ ساڵ و دوایەوەی زیانێکی گەورەیان بەهێزەکانی تورکیا گەیاند، راوەستا، و نزیکەی ٦٠خێزان پەنایان هێنایە بەرسوریا بەسەرۆکایەتی "عەبدولرەحمانی کوڕە گەورەی عەلی یونس"، کە پیاوێکی نەخوێنەواربوو، بەڵام ستراتیژیی و سیاسییەکی بەهرەمەندبوو،تەنانەت تورکەکان ناویان نابوو مامۆستای بیروباوەڕ لەساسۆن. دوایەوەی ٥ برای و زیاتر لەنیوەی خێڵەکەی لەشەڕەکاندا لەدەستدا، رێی خۆی کردەوە بەرەو سوریا و ژن منداڵان و پاشماوەی خێڵی "میرخاسی" لەگەڵ خۆی هێنا، کاتێک داوای مافی پەنابەرێتیی سیاسیی لەفەرەنسییەکان کرد، دەسەڵاتی "ئینتداب" داواکەی رەتکردەوە و دووریان خستەوە بۆ دیمەشق و پیاوەکانیشیان بەچەندین گوندی جەزیرەدا بڵاوە پێکرد.

عەبدولرەحمان خۆی لەناو رووناکبیرانی کوردا دۆزییەوە کە هەندێکیان وەك نمونەی "عوسمان سەبری" زمانی کوردییان وەك ئوستاد ئەزانی. عەبدولرەحمان سەریکردە خوێندن وهەموو بەیانییەك وەك منداڵە خوێندکارەکان کتێب و دەفتەرەکانی ئەخستە بندەستییەوە و بەشەقامە تەسکەکانی (حی الاکراد)دا ئەڕۆی بەرەوماڵی عوسمانی سەبری و بەگەرموگوڕی ورێکوپێکیی ئەرکەکەی جێبەجێ ئەکرد، تا دوای چەند مانگێك توانی خوێندنەوە و نووسین فێربێت بەزمانی کوردی و پیتی لاتینی کە (ئەلف بێ)ەکەی "میر جەلادەت بەردخان" دایتابوو. دوای ماوەیەکی تر دەستیدایە نووسینی چیرۆك و شیعر، ئەوکاتە تەمەنی ٥٧ ساڵ بوو.

دوای ئەو کۆتاییە خەماوییەی ساسۆن، کارەساتی دەرسیم دەستیپێکرد، خاکی زیو و ناوچەیەکی شاخاویی فراوان کە بەشێکی گەورەی باکووری خۆرئاوای کوردستانی تورکیا ئەگرێتەوە، چیا سەخت و عاسییەکان کە داپۆشرابوون بەدارستانی داری زانی کۆن،

دەرسیمی کردبووە دورگەیەکی سەربەخۆی دوور لەداگیرکاریی راستەوخۆی ئەو ئیمپراتۆریی و زلهێزانەی حکومی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیان ئەکرد. دوای "رۆمان و سەلجووقی و بیزەنتییەکان" چەندین جار عوسمانییەکان سەری خۆیاندا لەبەردی شاخەکان و دوائەوەی دڵنیابوون ناتوانن ناوچەکە کۆنترۆڵ بکەن رازیبوون بەسەربەخۆیی ناوخۆیی تەواوی ئەو ١٢ خێڵەی لەدەرسیم ئەژیان.

بەڵام مستەفا کەمال دوائەوەی سیستمی خەلافەتی هەڵوەشاندەوە و کۆماری دامەزراند پەنای بۆ فێڵ و تەڵەکەبرد بۆ ئەوەی دەرسیم بەدووربێت لەو راپەڕینانەی لەناوچەکانی تری کوردستان سەرهەڵئەدەن.

سەید رەزای سەرۆکی خێڵە هاوپەیمانەکانی بانگکرد بۆ ئەنکەرە و پێشوازییەکی شاهانەی لێکرد و بردی بۆ پەرلەمان و کورسی سەرۆك کۆماری بۆپێشنیازکرد. ئەم مامەڵەیە بەردەوامبوو تا ساڵی ١٩٣٧، ئەو ساڵە چارەنووسسازەی کەمستەفا کەمال بەرگریی کوردی تێکشکاندبوو. سەرەتای ئەوساڵە داوای لەسەرۆك خێڵەکان کرد، بەتایبەت(سەید ڕەزا) کەئەوکاتە تەمەنی گەیشتبووە ٧٠ساڵ،چەکەکانیان رادەستی ئەو بنکە سەربازییانە بکەن کە لەدەوروبەری ناوچەکانی دەرسیمدا دانراون، ئاگادارکردنەوەکەشی هاوکات بوو لەگەڵ لەسێدارەدانی ژمارەیەکی زۆری رووناکبیران و نیشتمانپەروەرانی کورد. مستەفا کەمال خۆی مەسەلەی دەرسیمی گرتەدەست و یەکێکبوو لەنمونە زەقەکانی دڕندەیی و خوێنڕێژیی. دەسەڵاتی سەربازیی و بەڕێوەبەرێتیی ناوچە کوردییەکان سپێردرا بە(عەبدولڕەحمان پاشا) کەفەرماندەی هێزە چەکدارەکانی تورکیابوو. ئەویش دەستەی ئەرکانەکەی گواستەوە بۆ جەزیرە و زیاتر لە(١٠٠ ٠٠٠) پیاوی کۆکردەوە و چەکداریکردن بەنوێترین چەکی سەردەم بۆ کۆتایی پێهێنانی کورد. فڕۆکەکانی بۆردومانی ئەو گوندانەیان ئەکرد کە جگە لەژن و منداڵ و پیر،کەسی

تیانەمابوو، سەربازانی تورکیش بەچیمەنتۆ دەروازەی ئەو ئەشکەوتانەیان داخست کە سەدان منداڵ و ژن لەترسی بۆردومان پەنایان بۆ بردبوو.

ساڵی ١٩٦٣ چاوم بەیەکێ لەرۆژنامەنووسانی تورك کەوت کە ببووە دیپلۆمات لەیەکێك لەوڵاتانی خۆرئاوا، ئەوەی بۆ ئاشکراکردم: توانیویەتی وێنەی یەکێك لەرووبارەکانی دەرسیم بگرێت کە پڕبووە لەلاشە، بەڵام کەس شایەتییەکەی نابینێت، چونکە مێجەرێکی (موقدەم) سوپای تورکیا فیلمەکەی لێوەرگرتووە و سوتاندوویەتی.

ئەو تاوانەی لەدەرسیم ئەنجامدرا، هەواڵەکانی لەدەرەوە بەکەس نەگەیشت، تەنیا لەرێی رووناکبیرێکی کوردەوە نەبێ، ئەویش دکتۆری بەیتەریی (نووری دەرسیمی) بوو کە لەقەسابخانەکە رزگاریبووبوو وپەنای بردبووە بەرسوریا. ئەوکاتە سەرکردەکانی سوپا دژایەتی تورکەکانیان ئەکرد بەرامبەر بەداواکانیان سەبارەت بەسنجاقی ئەسکەندەروونە، بۆیە رێیان ئەدا رۆژنامەکان تاوانەکانی سەربازانی تورك و بەرگریی پاڵەوانانەی کوردانی تورکیا بلاوبکەنەوە.

رۆژنامەی (القبس) لەیەکێك لەمانشێتەکانیدا نووسیبووی: (کوردەکان بەخۆرسکیی سەربازن.)

رووداوەکانی کوردستانی تورکیا هەراسانیان کردم، بۆیە یاداشتێکم ئامادەکرد سەبارەت بەسیاسەتەکانی تورکیا بەرامبەر بەکوردی تورکیا بەگشتیی و بەرامبەر بەدەرسیم بەتایبەتی و سەرۆکایەتی شاندێك کەپێکهاتبوو لەژمارەیەك لەخوێندکارانی دواناوەندی فرەنسایی و ژمارەیەکی تر لەخوێندکارانی (حی الاکراد)،رووماکردە چەندین باڵوێزخانە بۆ پێشکەشکردنی یاداشتەکە، لەهەموو باڵوێزخانەکان پێشوازیی گەرمیان کردین و گوێیان لێگرتین و بەڵێنیاندا حکومەتەکانیان لەسکاڵاکەمان ئاگاداربکەنەوە، بەڵام جیهان بەرامبەر بەکارەساتی کورد هەر بێدەنگ بوو. ئینگلتەرە کەمەزنترین هێزی ئەو سەردەمەبوو، ئەیویست هاوپەیمانێتییەکەی لەگەڵ تورکیا بپارێزێت بۆ رووبەڕووبونەوەی

هێزی گەشەکردووی ئەڵمانیای هیتلەری و گوشاری خستەسەر فرەنساش تا سنجاقی ئەسکەندەرونە بەپێچەوانەی ویستی دانیشتوانەکەیەوە بداتە تورکیا.

پێکهێنانی ئەو شاندە، بوو بەخاڵی دەستپێکی یەکەمین کۆمەڵەی خوێندکاری کورد "هێڤی" لەکۆتایی ساڵی ۱۹۳۷دا کە پێکهاتبوو لە۱۵ خوێندکار وتەنها ساڵ و نیوێک بەردەوامبوو. لەو ماوەیەدا و سەرەڕای یاداشتەکە لاوانی کورد لەپێویستیی خۆڕێکخستن تێگەیشتن و کەوتنەپێکهێنانی یانەی ئەدەبی و وەرزشی و ڕێکخراو و پارتی سیاسیی نهێنی، تا لەساڵی ۱۹۵۷دا "پارتی دیموکراتی کورد لەسوریا" دامەزرا.

لەماوەی دووساڵدا دەرسیم ڕووبەڕووی جەنگێکی سەرتاسەریی بووەوە و لەوماوەیەدا لەناوچەکانی تری کوردستان دابڕدرا، جیهانیش پشتگوێی خست، سەدان هەزار هێکتار دارستان سوتێنران و خەڵکەکە بێبەزەییانە قەڵاچۆکران، لەکۆتایی ساڵی ۱۹۳۸ دا ئیتر دەرسیم سەربەخۆیی نەماو تورکەکانیش پەنایان بردەبەر جۆرێکی نوێی چەوسانەوە، هەموو ئەو سەرکردە کوردانەیان کوشت کە هاوکارییان کردبوون.

زیندانەکانی شارەگەورە نزیکەکانی وەك ئەلعەزیز و ئەرزنجان و سیواس و مالاتییە، لەدەستەبژێری جەنگاوەرانی کورد ئاخنران و دانیشتوانەکەش کە زیاتر لەملیۆنێك کەسبوون ڕاگوێزران بۆ خۆرئاوای تورکیا و بەگوند و شارەکانیدا پەرشوبڵاوکرانەوە و دەرسیم وەك ناوچەی قەدەغەکراو ڕاگەیەنرا، ئەوانەشی ڕزگاریان بووبوو و نەوەکانی دواتری ئەم ڕاگوێزانەش، نەیانتوانی بگەڕێنەوە تا دوای ساڵی ۱۹۵۰، کە پارتی دیموکرات سەرکەوتنی بەدەستهێنا.

لەلای خۆمەوە ئەوکارەساتەی کە بەسەر گەلەکەماندا هات، دواتریش ڕاگەیاندنی جەنگی جیهانیی دووەم هەژاندمی و وام بەباشزانی لەناو کوردەکاندا بمێنمەوە و هەوڵی فێرکردن و ڕێکخستنیان بدەم بۆ خۆئامادەکردن بۆ ئەو ڕۆژەی دۆخی ئێستای خۆرهەڵاتی ناوەڕاست ئەگۆڕێت.

چـونکه ئاشــکرابوو نەخــشەی خۆرهــەڵاتی ناوەڕاســت لەئــەنجامی ســەرکەوتنی هاوپەیمانەکان و ململانێکانی نێوانیان دارێژرابوو، وەك چارەسـەری نـاوەنجی دوای جـەنگی جیهانیی یەکەم، کەکارەساتی گـەورەی بـۆ کـورد بـەدواوە بـوو و کـورد بوونـە قوربـانیی بەرژەوەندیی گەلانی تر،بەپلەی یەکەمیش بوونە قوربانیی بەرژەوەندیی ولاتانی زلهێـز. لـەو ماوەیەدا بیرم لەوەئەکردەوە کە ئەمجارە لەمافە رەواکانمان بێبەش ناکرێین. کاکم کـە هـەوڵی ئەدا من پزیشکیی بخوێنم، هەڵسوکەوت و بۆچوونەکانی من لەگەڵ راکانی ئەو ناکۆك بـوو، چونکە ئەو ئەیویست خوێندن تەواوبکەم پێش ئەوەی بچمە ناو سیاسـەتەوە. بـەڵام چـونکە بڕیارەکەی من یەکلاکەرەوەبوو، بۆیە ناچار قایل بوو و ئامۆژگاریی کـردم کـە میـانڕەوبم و سالێکی تریش لای بمێنمەوە پێش گەڕانەوەم بـۆ زانکـۆ. لـەو ماوەیـەدا لەقامیـشلی-وەك گوند و ناوچەکانی تر- ئـەو قوتابخانانـەی بـەزمانی عـەرەبی ئەیانخوێنـد دەگمـەن بـوون، لەبەرامبەر ئەوەدا قوتابخانەی تایبەتی سەرەتایی و ناوەندیی سـەر بەکەمینـە ئاینییـەکانی ئەرمەنی و سریانی لەشارەکانی حەسەکە و قامیشلیدا هەبوون. کچانی گەنجت ئـەبینی کـە لەو قوتابخانانـە ئەگەڕانـەوە و راهیبـەکانی (دڵـی پـیرۆز) سەرپەرشـتییان ئـەکردن، بـەڵام قوتابخانەی کوردیی نەبوو.

سـەرەڕای نـەبوونی قوتابخانـەی کـوردیی بنەمایـەکی پتـەوی ناسیۆنالیـستانی کـورد لەقامیشلی و گوندەکانی دەوروبەری لەجگەرخوێنی شاعیر کۆبوونەوە، ئەویش لەبەرئـەوەی هـانی خـەڵکی ئـەدا دژی ئاغاکـان و مـەلاکان و خوێنـدکارانی حوجرەکـان (فـەقێ) کەخوێندنیان لەخوێندنگەکان تەواوکردبوو،منیش هاوکاریی شاعیرە میللییـەکان و مـەلا و خوێنـدکار و لاوەکـانم ئـەکرد بـۆ ئـەوەی گـەلی کـورد بهـەژێنین و لەخـەو هەڵبـسێنین. شیعرەکانی جگـەرخوێن کاریگـەریی زۆری هـەبوو لەسـەر ئـەو گەلـەی زۆر دەوڵەمەنـدە بەدابونەریتی ئەدەبی و فۆلکلۆریی. جگەرخوێن شـیعرەکانی بـەزمانی خـەڵك ئەنووسـی و بەشێوەی داسـتان ئەیخوێندنـەوە. ئـەو جوتیـارە کوردانـەی بـۆ یەکـەمجار ئـەیانبینی کـە

ئەگۆڕەپانێکی گشتیدا لەسەر کورسییەك راوەستاوە و باسی سەروەرییەکانی رابردووی گەلی کورد ئەکات و سکاڵا لەدۆخی ئێستای ئەکات وپێشبینی داهاتوویەکی رووناکی بۆ ئەکات، بەمەرجێك تێبکۆشن و یەکگرتووبن، هەندێکیان بەشێتی تێنەگەیشتن وەك ئەوەی لەشێتخانە رایکردبێ. چەندین جار ئەمبینی کە وەك ئەوەی مامەڵە لەگەڵ شێتێکدا بکەن، مامەڵەیان لەگەڵ ئەکرد و سەریان رائەوەشاند و ئەیانوت:

-(گوناهە، گەنجێکی قۆزی وا شێتبووە!)

بەلای شێخەکانی تاریکی و ئاغا و دەرەبەگەکانەوە ئەم شاعیرە مەترسییەك بوو کەئەبوو بەزووترین کات لەکۆڵ خۆیانی بکەنەوە،بەڵام لەبەرامبەر ئەو پشتیوانییە فراوانەی کە وردەوردە لەلایەن خەڵکەوە لێیئەکرا، هاوسۆزیی و دڵبەندیی جێی گومان و دژایەتییان دەگرتەوە و خەڵکێکی زۆر شیعرەکانیان لەبەرکردبوو و شێخ و مەلاکان ناچاربوون گوێ لەو شیعرانە بگرن کە تیایدا گاڵتەی بەوان ئەکرد و پێی رائەبواردن.

سەرەڕای حەوسەڵەی خراپی کارمەند و توندڕەوە عەرەبەکان، بەڵام فرەنسا،ئازادی دابوینێ بۆ چالاکیی شیعر و مۆسیقا و هەڵپەرکێی میللی و گوێی خۆیان خەواندبوو لەوەی بەناو گوندنشینەکاندا ئەگەراین و لەناو جوتیارەکاندا چالاکی نەتەوەییمان ئەنجامئەدا وچەندین هەفتە لەلایان ئەماینەوە، هاوبەشیمان ئەکردن لەخواردنە سادەکانیاندا و ورەی رووخاویانمان بەرزئەکردەوە. ئازار و نەهامەتییەکانیان هانی ئەداین هۆشیاریان بکەینەوە سەبارەت بەو چەوساندنەوە نەتەوەییەی تووشی بووبوون و هانمان ئەدان بۆ راپەڕین لەدژی.

سەرەتا کاردانەوەی خەڵکە هەژارەکە دووربوو لەوەی کاردانەوەیەکی باش بێت، چونکە کاری کێڵگە، بڕستی لێبڕیبوون، دووربوون لەرووداوەکانی جیهان، دیلی دەستی نەزانین بوون، و سەرۆکە ئایینیی و دنیاییەکانیان کوێریان کردبوون، و هیچ بایەخێکیان نەئەدا بەهۆنراوە و گۆرانییە نیشتمانییەکان. هەندێکیان پێکەنینیان ئەهات بەباوەڕمان و

بەکوردستانێکی ئازاد و سەربەخۆ، هەندێکیشیان هەڵئەستان و قسەی رەقیان ئاڕاستەی ریش سپییەکانیان ئەکرد.

ریشسپییەکانیش ئەیانوت:

-ئێوە گەنجن و خوێندەواری شارن و ئەتانەوێت کێشەمان بۆ دروست بکەن. ئێمە بەچارەنووسی خۆمان شادمانین، نیعمەتی خواردنی رۆژانەمان هەیە و ئەتوانین پێنج فەرزە نوێژ بکەین، ئێمە بەمە شادمانین. تکاتان لێئەکەین داوای لەوەزیاترمان لێمەکەن، و بەبیروباوەڕی دژ بەئاین و دەوڵەت کێشەمان بۆ مەنێنەوە.

یا ئەیانوت:

-ئێوە شارین و کەس ناوێرێت دەستتان بۆ بهێنێت، بەڵام ئێمەی جووتیار گەر هەستی نیشتمانی خۆمان دەربڕین، یەکسەر حەیزەرانی ژەندەرمەکان ئەبینین بەسەر سەرمانەوە.

ئەمانویست تێیان بگەێنین کە:(ئێمە دژی ئاین نین و زۆردووریـن لـەوەوە. ئێمـە تـەنیا داوائەکەین شەریعەت بەتەواوی جێبەجێ بکرێت و نەبێتە ئامرازێکی هەلپەرستیی و نەزانین و پێغەمبەر (د. خ) وتویەتی:"دوای زانین بکەون گەر لە(چین)یش بێت"، بەڵام بەناوی ئاینەوە لەزەلکاوی نەزانیندا نوقمکراون، جگە لەوەش قورئان ئەڵێت: "باوەڕداران برای یەکن "، کەچی سەرەڕای ئەوە وڵاتانی ئیسلامیی سیاسەتی بەکۆیلەکردن، تەنانەت قەڵاچۆکردنی کورد ئەگرنەبەر، جا ئەو کوردە موسڵمان بێت یا کریستیان و ئێزدیی، جگە لەوەش دەوڵەتی سوریا لەلایەن زلهێزێکی بێگانەوە پێکهێنراوە و بەزۆر بەسەر کورددا سەپێنراوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە نیازمان نییە لاوازی بکەین یا دژایەتی بکەین، ئێمە تەنیا داوائەکەین تایبەتمەندیان لەبەرچاو بگیرێت و رێزمان بگیرێت، سەرەنجامیش ئەمانەوێت هەموو میللەت راستییەکان تێبگات و ویستی خۆی دەربڕێت بەوەی دان بەناسنامەیدا بنرێت و رێزی مافە رەواکانی بگیرێت. ئێمە تەنیا ئەوەندەمان ئەوێت و هیچی تر.)

لەبەردەم بانگە ئاشکراکانماندا بەرامبەرەکانمان یا بێدەنگ ئەبوون و یا ئەکەوتنە ورتە ورت:

-(لەوانەیە ئێوە راستبکەن، پاشان ئێوە گەنجن، بەڵام ئێمە تەمەنمان کۆتایی هات و سەرمان لەلێواری گۆڕ ئەلەرزێت و ناتوانین دواتانکەوین. ئێوە بەردەوامبن و ئێمەش داوای سەرکەوتنتان بۆ ئەکەین.) سەرەڕای دژایەتیی توند و هەڕەشەی زەقی هەندێك لەئاغاکان بەکلکگرێدان لەگەڵ کاربەدەستاندا، بەردەوام ژمارەی ئەو جووتیارانە لەزیادبووندابوون کە لەناسنامەی نەتەوەی خۆیان ئەگەیشتن و لێمان نزیك ئەبوونەوە.

(حی الاکراد)ی دیمەشق کە ژمارەیەکی زۆری رووناکبیران و خوێندکاران و دەرچووی دواناوەندیی تیابوو، زەمینەیەکی لەباربوو، بۆیە لەوێ کەوتینە دامەزراندنی رێکخراوی رۆشنبیریی وەرزشیی، و ئەدیبان و زمانزانەکان بەئازادیی زمانی کوردییان ئەوتەوە. ساڵی ۱۹۳۹ تیپێکی تۆپیێ بەناوی (کوردستان)دامەزرا، بەشداریی خولی شاری دیمەشقی کرد و ساڵی ۱۹٤۰ پلەی یەکەمی بەدەستهێنا و جەماوەرێکی زۆر فراوانی هەبوو، بەشێوەیەك خەڵك لەقامیشلییەوە ئەهاتن بۆ هاندانی یاریزانەکان. رووداوێکی نائاسایی بوو کاتێك هەزاران بینەری دیمەشق هاواریان ئەکرد (بەڵێ کوردستان، پەلاماریەرە کوردستان، بژی کوردستان.)

لەرۆژنامەکانیشدا لەبارەی خولەکەوە نوسرا:

-(کوردستان سەرکەوت).

باڵوێزخانەی تورکیا لەدیمەشق لەوەی زیاتر پێویست نەبوو، تا کێشەبنێتەوە، وهەموو قورسایی خۆی لای بەرپرسانی فەرنسا و سوریا خستەگەڕ، بۆ کۆتاییهێنان بەو دیاردانەی دژایەتیکردنی تورکەکان، بەهوتافکێشان بەناوی کوردستانەوە. بۆیە فەرنسی و سورییەکان بۆ قایلکردنی ئەنکەرە، کۆمەڵەکانیان ناچارکرد چالاکییەکانیان رابگرن.

دەسەڵاتدارانی ئەنکەرە هەر بەم سەرکەوتنە نەوەستان، بەڵکو کاتێك گەیشتنە ئەوباوەڕەی هەستی نەتەوەیی کورد لە(جەبەل الاکراد)ی باکووری حەلەب بوژاوەتەوە،

ئەفسەرێکی تـورکی سـەر بەموخابـەراتیان نـارد، تابـەنهێنی بـچێتە ناوچـەکە لەبـەرگی شێخێکی ئایینیدا بەناوی "شێخ ئیبراهیم". دوای ئـەوەی ژمارەیـەکی زۆری شـوێنکەوتوو (مورید)ی لـەخۆی کـۆکردەوە، جـەنگێکی بێبەزەییانـەی دژی ئاغـاواتی ناوچـەکە و خێزانەکانیان و لایەنگرانیان راگەیاند و لەماوەی چەند مانگێکدا ناوچـەی (جەبـەل) کـە ژمارەی دانیشتوانەکەی ۲۵۰ هەزار کـەس ئـەبوو کەوتـە کـوورەی جـەنگێکی نـاوخۆوە، لەجیاتی ئەوەی سوپا بێتە ناوەوە بۆ راگرتنی قەسابخانەکان، دەسەڵاتی ئینتـدابی فرەنـسیی ژەندرمەی سوپای بەو ئەرکە راسپارد، ئەوانیش کە ژمارەیان کەم و چەکی خراپیـان پێبـوو، بەناکامی لەگۆڕەپانی شەڕ کشانەوە هیچیان پێنەکرا وهەردوولایان جێهێشت بێبەزەییانـە یەکتربکوژن.

ئەم شەڕی براکوژییە سەرەتای ساڵی ۱۹۳۹ دەستی پێکرد و ماوەی ۲ســاڵی خایانـد و ئەنجامەکەی کوژرانی زیاتر لە ۱۰ هەزار کەس و وێرانکردنی ناوچەیەکی گەشەسەندوو بـوو، ورقی لەنێوان خەڵکەکـەدا چـاند، شـێخ بـراییش دوای ئـەوەی ئەرکەکـەی جێبـەجێکرد، لەپڕێکـدا بـێ هـیچ ناونیـشانێك دیارنـەما و کـەس نـەیزانی ئـەو پیـاوە کێبـوو، وچـی بەسەرهات؟!

دوای ئـەوەی راپەڕینـە کوردییـەکانی کوردسـتانی تورکیـا بەشـێوەیەکی دڕندانـە و خوێناویی سەرکوتکران، رژێمی کەمالی لەهـەموو شـوێنێك چـاودێریی هـەر جووڵەیـەکی کـوردی ئـەکرد بۆئـەوەی بەشـێوەیەکی راستەوخۆ یـان ناڕاسـتەوخۆ هـەر لەلانکەکەیـدا سەرکوتی بکات، لەبەرئەوە بەردەوام مەترسیی بەسەرسەری پەنابـەرانی کـوردی تورکیـا و کوردە نیشتمانپەروەرەکانی سووریاشەوە ئەسوڕایەوە. هەمیشە لەبەردەم هەڕەشەی سـکاڵای دروستکراوی حکومەتی تورکیا و هەواڵنێرانیان بـوون بـەناوی تاوانبـاری مـافی سـیڤلی و راونان و رفاندن و کوشتن. پیاوە بەتەمەنەکان هەمیشە ئامۆژگاریـان ئـەکردین بـەنهێنی و هۆشـیارانە کاربکـەین. ئامۆژگـاریی منیـشیان کـرد کەسـواری شـەمەندەفەری نێـوان

"قامیشلی- حەلـەب" نـەبم، چـونکە بەشـی زۆری ڕێـڕەوی شـەمەندەفەرەکە کـەوتبووە ژێردەسـەڵاتی تورکیـاوە، بـەڵام مـن خـۆم خـستە مەترسـییەوە و لـەو ڕێـیەدا تووشـی چەرمەسەریی بووم.

جارێکیان دۆخەکە ناچاری کردم لەحەڵەبەوە بگەمە قامیشلی.

ئەمە لە٢٠ی نیسانی ١٩٤٢ دابوو، کە ١٠ ڕۆژبـوو لەیـەکێك لەئوتێلـەکانی حەڵەبـدا گیرم خواردبوو.

من پێشتر لەبەیروتەوە بەرێگەی دیمەشقدا هاتبووم و چەندین جانتا و جلوبـەرگی تیپـی هەڵپەڕکێی کوردی و کتێب و گۆڤار و ڕۆژنامە و وێنەم هێنابوو، و ئەبوو بـەزووترین کـات بگەمە قامیشلی. ڕێگەی هاتوچۆی نێوان حەڵەب و قامیـشلی بـەهۆی ئـەو بارانـە زۆرەی ماوەی مانگێك بوو بـەردەوام ئـەباری، گیرابـوو، و چـەندین گۆمـاوی تیـا دروسـتبووبوو کەئۆتۆمبیل نەیئەتوانی پیایاندا تێپەڕێت.

لەحەڵەب دەست و پێم بەسترابووەوە. هەنـدێك لەشـۆفێرەکانی ناسـیاوم ئامۆژگاریـان کردم کە بەشەمەندەفەر سەفەرەکەم بکەم. ژمارەیەکی زۆری خەڵکی قامیـشلی لەهـەمان ئەو ئوتێلەبوون کەمنی لێبووم وسەرگەرمی کارەکانیان بوون، لەوانە هەنـدێکیان بەرهـەمی کشتوکاڵ و ئاژەڵیی هێنابوو بۆ فرۆشتن وهەندێکیان هاتبوون بۆ کڕینی "کوتـاڵ و پـێلاو و چا و قاوە و شەکر و سابوون" بۆ دووکانەکانیان. زۆربەی ئەوکەسـانە بـەکورد و عـەرەب و سریان و ئەرمەن و جوولەکەوە ناسیاوم بوون، هەندێکیان زۆر نزیکبوون لەکاکمـەوە، لەوانـە گەنجێکی سریانی کاسۆلیك بەناوی "جۆرج ئەزمیرلی" کە ماڵەکەیان نزیکی ماڵی خۆمـان بوو لەقامیشلی.

ئەزمیرلی، خەریکی بازرگانی ئاژەڵ و مانگابوو، و هەموو مانگێـك چـەندین فـارگۆن ئاژەڵی ئەهێنا بۆ حەڵەب بۆ فرۆشتن. کـەمن گەیـشتمە حەلـەب ئـەو بـەقازانجێکی بـاش ئاژەڵەکانی فرۆشتبوو، وژمارەیەکی زۆر بەستەلیرەی سووریی خـستبووە نـاو کیـسەیەکەوە

وخۆی ئامادەکردبوو بۆ ئەوەی بەشەمەندەفەر بگەڕێتەوە بۆ قامیشلی، زۆرم لەگەڵ خەریکبوو کە لەگەڵیدا سەفەربکەم.

پێم وت(کە ناتوانم بەرگەی ئازاری شەهیدبوون بگرم. وەك زۆر لەکوردەکانی ناو زیندانەکانی تورکیا.)

هەوڵیدا دڵنیام بکاتەوە کەسەفەرەکە بێ هیچ ڕووداوێك تەواوئەبێت و وتی:

-(جاری پێشوو پۆلیسی تورکیا داوای ناسنامەشیان لێنەکردین، خۆ ئەگەر بەڕێکەوت کەسێك ڕێی پێگرتیت، ئەوا خۆت ئەزانی پارەیەکی زۆرم پێیە و مرۆڤ ئەتوانێت بە١٠ لیرە هەرکام لەو فەرمانبەرە برسی و بەرتیل خۆرانە بکڕێت.)

لێم پرسی:

-(بەڵام من ژمارەیەك کتێب و گۆڤاری کوردیم پێیە یان لەبارەی کوردەوەن، گەر بیدۆزنەوە کاردانەوەیان چۆن دەبێت؟)

-(ماوەی ئەوەیان نییە سەیری کتێب بکەن و زۆربەی پیاوانی گومرگی تورکیا بەهەزارحاڵ خوێندنەوە و نووسین ئەزانن. بەهەرحاڵ ژمارەیەکی زۆر جانتا و کتێبم پێیە بیخەرە ناو ئەوانەوە و بۆیان جیاناکرێتەوە.)

هەوڵەکانی "جۆرج ئەزمیرلی" و ویستی زۆری خۆشم بۆ گەیشتنە قامیشلی،بڕیاری ئەوەیان پێدام ئەم سەفەرە سەرکێشانەیە بکەم.

پەنجەرەی فارگۆنە کۆنەکان و چراکانی کەبەشینێکی تۆخ ڕەنگکرابوون دیمەنێکی ناشرینی نەگبەتیان هەبوو، لەوە ئەچوو لەمەیدانەکانی جەنگ گەڕابێتەوە، فارگۆنەکانی پلەدوو کە ئێمەی تیابووین لەفارگۆنی شەمەندەفەری ناو فیلمی کاوبۆی ئەچوو.

من و جۆرج بەرامبەر ژن و مێردێکی مامۆستا دانیشتین کە دواتر پێیان وتین، لەقەیسەرییەوە هاتوون و ئەچن بۆ وەرگرتنی ئەرکەکانیان لەدێرێك کە یەکێکە لەناوچەکانی پارێزگای ماردینی کوردستانی تورکیا.

سـعات ٤ی پاشـنیوەڕۆ شـوتی کەوتنەگـەڕی شـەمەندەفەرەکە لێیـدا و دووکـەڵ نەشەمەندەفەرە هەڵمییەکەوە بەرزبووە و هێڵەناسـنەکە زیکەیـەکی تونـدی گوێگەرکـەری نێبەرزبووەوە، دوای پەڕینەوەمان لەپردێکی سەر فورات چووینە ناوخاکی تورکیاوە. تاریـك داهاتبوو، چراشینە تۆخەکان شـوێنەکەیان روونـاك ئـەکردەوە، چـاودێرانی تـورك بـەلایتی دەستیی درێژەوە خۆیانکرد بەفارگۆنەکاندا، پۆلیسێکی چەکدار لەگـەڵ پیـاوانی گـومرگ و ناسایشی گـشتیدا دابـوو. کـە کارمەندەکـەی ناسـایش گەیـشتە لامـان هاوڕێکـەمی ناسییەوە، ئەویش پاکەتێك جگەرەی ئینگلیزیی لـەگیرفانی دەرهێنـاو پێـشکەشی کـرد و وتی: (ئەم دیارییەم بۆ هێناویت.) کارمەندەکەش بەخۆشـییەوە وەڵامـی دایـەوە: "باشـە، سـوپاس"، دوایـی وەریئەگـەرم، مـن ناسـنامەکەم گرتبـوو بەدەسـتمەوە بـۆ ئـەوەی بیدەمـەدەستی، بەڵام ئەو تەنیا سەرێکی راوەشاند و وتی: (باشە، باشە...سوپاس.)

هەر دوایئەوە ئێمە خۆمانکرد بەفارگۆنی چێشتخانەکەدا و چاکترین خواردنمان داواکـرد، روونـاکی گونجـاو و پاکوخـاوێنی سـەرمێزەکان و هەڵـسوکەوتی رێکـوپێکی کارمەنـدانی چێشتخانەکە، کەبەرەچەڵەك لەیۆنانییەکانی ئەستەمبوڵن، دڵیکردینـەوە، و بـەدەم قـسەی خۆش و نوکتەوە کەوتینـە خـواردنی خۆراکـە بەلەزەتـەکان لەزەڵاتـە و گۆشـت و پـەنیر و (مەی)ەکەش خۆشییەکی تری بەخواردنەکە بەخشی.

خەریکی قاوەخواردنەوەبووین کـەژن و مێـردە مامۆسـتاکە پێـشنیازیان کـرد لەسـەر مێزەکەی ئێمە دانیشن. ویستمان سەری قسەیان لەگەڵدا بکەینەوە،بـەڵام زۆر بەئاگاییـەوە قسەیان نەکرد و بەزۆر رامانئەکێشان بـۆ قـسەکردن، بـەڵام وردە وردە ئەوپێکـە مەیانـەی پێـشکەشمان ئـەکردن زمانیـانی بـەردا و دەیـان پرسـیاریان لێکـردین سـەبارەت بەچالاکییەکانمان و ژیانی ئابووریمان لەسوریا و نرخی کەلوپەل،و بـەراوردییان ئـەکرد لەگـەڵ نرخی شتەکان لەتورکیا وسەرسامبوون لەوەی لەسـوریا برسـێتیی نییـە و نـرخ بەوشـیوەیە نزمە،سەرەڕای بوونی هێزەکانی فرەنسا و بریتانیا لەو وڵاتە.

بەسادەییەوە وەڵامم دایەوە: (بۆوا سەرسامن؟ لەبەرئەوەی کە لەتورکیا برسێتی هەیە؟)

وەك ئەوەی سەرنجی ئەو راستییەم نەدابێت کـە بەدرێـژایی سـنووری سـوریا و تورکیـا بەسەدان سەرباز و جووتیاری تورك پەنائەبەنە بەر سوریا بۆ بەدەسـتهێنانی پارووییـەك نـان.

ژنە مامۆستاکە وەڵامی دایەوە:

-(بەداخـەوە سـەربازگیریی گـشتیی ١٩٣٩ هێـزی کـاری لەگوندەکانـدا نەهێـشت و بەرهەمی دانەوێڵەی ئەم ساڵانەی دوایی خۆرهەڵاتیش مێرووی سن بەتەواوی لەناوی برد.)

خۆم پێنەگیرا و لێمپرسی:

(مەبەستت لەخۆرهەڵات چییە؟)

ژنە مامۆستاکە وەڵامی دامەوە:

-(خۆرهەڵات بەشێکە لـەتورکیا و پێکهـاتووە لـەپارێزگاکانی مالاتیـە و ئەلعـەزیز و دیاربەکر و ماردین و ئۆرفە و سیرت و وان.....هتد.)

جارێکی تر لێمپرسییەوە:

- (تایبەتمەندیی ئەم پارێزگایانە چییە؟)

پیاوە مامۆستاکە بەتووڕەیی قسەکانی پێبڕیم و وتی:

-(هیچ تایبەتمەندییەکی نییە و هەروەك پارێزگانی تری ولآتەکەمان وایە.)

مامۆستا ژنەکە بەهەمان تووڕەییەوە وتی:

-(هەمیشە بەشێکی جیانەکراوەبوون لەتورکیا، ئەوەنـەبێت کـە جـاران پێیـان ئـەوتن ویلایەتەکانی خۆرهەڵات، بەڵام ئەمڕۆ پێیان ئەوترێ خۆرهەڵات و باشووری خۆرهەڵات.)

پێم وت، و بێویستی خۆشم دەنگم بەرزبووەوە:

-(بـــەڵام مـــن لەسەرنەخـــشە عوسمانییـــەکان بینیوومـــە کـــە بـــەپێتی گـــەورە نوسراوە"ویلایەتەکانی کوردستان" و هەموو کەسـێکیش ئـەزانێ خۆرهـەڵات و باشـووری خۆرهەڵات مەبەست کوردستانە، چونکە بەسادەیی هەموو دانیشتوانەکەی کوردن.)

بەبێزارییەوە وڵامیان داینەوە:

-(لەفەرهەنگەکانی ئێمەدا وشەی کورد و کوردستان نییە. ئەوە درۆی دوژمنانی نەتەوەی یەکگرتووی تورکیایە و گەر هەندێك سەرلێشواوی بەکرێگیراوی بێگانە ویستبێتیان ئەو دەستەواژەیە بقۆزنەوە، ئەوا پەندێکمان داداون کە قەت لەبیریان ناچێتەوە و ئەمڕۆ وڵاتەکەمان لەو گەمانە پارێزراوە.)

وێرام کەجارێکی تر بپرسم:

- (بەڵام سبەینێ ڕووبەڕووی کێشە ئەبنەوە، چونکە ئێوە مامۆستان لەدێریك، چۆن ئەو منداڵانە فێرئەکەن کە جگە لەزمانی کوردی نازانن؟ و چۆن خزمەتی وڵاتەکەتان ئەکەن، گەر نکوڵیی لەراستییەکی ئاوا ڕوون و ئاشکرابکەن؟)

پیاوەکە وەڵامی دایەوە:

-(ئەو کوردییەی تۆ باسی ئەکەیت هیچ نییە جگە لەزاراوەیەکی تورکی. لەتورکیاش هەروەك هەموو وڵاتانی جیهان زمانی فەرمی هەیە لەگەڵ زاراوەی خۆماڵی و بەبڵاوکردنەوەی خوێنەواریی ئەو زاراوانە لەناوئەچن.)

هەوڵمدا بۆیان ڕوونبکەمەوە کە:

-(ئەگەر لەراستیدا کوردیی زاراوەیەکی هەڵقوڵاوبێت لەزمانی ئەدەبی و فەرمیی تورکیا، ئەوا، وەك تۆ پێشبینی ئەکەیت لەناوئەچێت، بەڵام لەراستیدا زمانی کوردی تەواو جیاوازە و ڕێزمان و فۆلکلۆر و ئەدەبی تایبەت بەخۆی هەیە، و لەڕوانگەی ئەم ڕاستیانەشەوە بەئاسانی ناتوانن ئەم زمانە لەناوبەرن و زمانی تورکیی بخەنە شوێنی، جگە لەوەی چەندی ئێوە هەوڵبدەن ئەم زمانە لەناوبەرن بەرگریی زیاترئەبێت و رقوقینی گەل دژتان زیاترئەبێت.)

لەم کاتەدا شەمەندەفەرەکە لەوێستگەی "جەبەل ئابیچ – گردە سپی" ڕاوەستا، و مامۆستا پیاوەکە هەستایەسەرپێ و دووچاوە سەوزەکەی تێبڕیم و وتی:

-(بەداخەوە کەکەسێك بەو رەوانییە بەزمانی تورکی قسەبکات و تا ئەو رادەیە بەرگریی لەمەسەلەیەکی خراپ بکات.)

پاشان دەستی ژنەکەی گرت و لەفارگۆنی چێشتخانەکە چوونە دەرەوە. جۆرجی هاوڕێم سەرەکۆنەی کردم و وتی: -(یەکەم، نەئەبوو ئەو مشتومڕەیان لەگەڵ بکەیت، دووەمیش، قسە لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەدا بێسوودە، چونکە ئێمە لەتورکیادایین نەك لەسوریا.)

پێم وت:

-(ئەبێت بەردەوام بیریان بخەینەوە، ئەگینا ئەو سیاسەتەی مستەفا کەمال دایڕشتووە، لایان ئەبێت بەئینجیل.)

-(بەڵێ، تۆ راستئەکەیت، بەلاَم پێویستە بەئاگابین.)

دوای ئەوە داوای هەندێك خواردنەوەمان کرد تا رووداوەکەمان لەبیربچێتەوە و شادیمان جارێکیتر بۆ بگەڕێتەوە، بەلاَم بێسوودبوو.

شەمەندەفەرەکە ماوەیەکی زۆر راوەستا، جۆرج گەڕایەوە بۆ فارگۆنەکە بۆ زانینی هەواڵی دووماموستاکە، یەکێك لەئەفەرەکانی خەلکی قامیشلی پێی وتبوو، کە دووماموستاکە چوون بۆ خانووی وێستگەکە لەبەری تورکیا.

-(بەلاَم بۆ ئەچن بۆ ویستگە؟ خۆ ئەوان ئەبێت لە"دەرباسیا" دابەزن بۆئەوەی بگەنە دێریك!)

پرسیاری لەو جۆرە نیگەرانیان کردم ، بۆیە جۆرج پەرداخە بیرەکەی بەرزکردەوە و پێی وتم:

-(بخۆرەوە، گوێی مەدەرێ.)

بەنیگەرانییەوە ئەمانخواردەوە و پێشبینی شتێکی خراپمان ئەکرد، خولەك و چرکەکان بەقورسی تێپەڕین و شەمەندەفەرەکەش هێشتا لەوێستگەکە وەستابوو، سەرەنجام و دوای ٤٠ خولەك فارگۆنەکە لەرایەوە و شەمەندەفەرەکە کەوتەڕێ، لەوێدا جۆرج چوو بۆ

فارگۆنەکەی خۆمان بۆ ئەوەی بەدوای دووماموٚستاکەدا بگەڕێت ، کەنەیدۆزینەوە بڕیاریدا لەفارگۆنەکانی تر بەدوایاندا بگەڕێت. لەم کاتەدا پیاوێک بەهەنگاوی سەربازیی هاتەپێشەوە و لەسەرکورسییەك لەپشتمەوە دانیشت، پاشان ئاوڕیدایەوە بەرەو من و وتی:

-(ببورە، پێمەچێت تۆم لەشوێنێك بینیبێت، بەلاّم نایەتەوە بیرم لەکوێ، ئا..لەوانەیە لەقامیشلی تۆم بینیبێت، تۆ لەوشارە نیشتەجێ نیت؟)

بیرمکەوتەوە کە بەماموٚستاکانم وتبوو: (من نیشتەجێی شاری قامیشلیم.) بۆیە لەکاتێکدا کە هەوڵمئەدا هێمن دیاربم، پێم وت: (لەڕاستیدا ئەوە شاری منە.) پیاوەکە وتی:

-(کەواتە بەدڵنیاییەوە لەوێ بینیومیت. بەڵێ من نزیکەی ساڵێك ئەبێت بەئەرکێك لە"نسێبین"م و زۆرجار ئەچم بۆ قامیشلی و لەچێشتخانەی "کەربیس" نان ئەخۆم.)

ئەمە زۆر ماقوڵە چونکە منیش زۆرجار ئەچم بۆ ئەوێ، کابرا بەردەوامبوو لەقسەکردن و وتی:

-(ئەوە تۆ نەبوویت بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە بەزمانی کوردی گوتارێکی ئاگرینت دا ؟!)

ولاّمم دایەوە:

-(بەڵێ، ئەمە راستە.)

-(وایە، لەوێ بینیومیت، ئەبێت دان بەوەدابێنم کە بەچەپڵەرێزانێکی گەورە پێشوازیت لێکراو ئەو رایەم لادروستبوو کە تۆ گوتاربێژێکی بەئەزموونیت و راهاتوویت لەسەر قسەکردن لەناو جەماوەرو گوتاردان لەکۆبوونەوەدا، خۆمن هەڵەنیم؟!)

-(جارجارە لەناو جەماوەردا قسەئەکەم.)

-(تۆ برایەکت نییە کەپزیشکێکی زۆر ناسراوە لەقامیشلی؟)

پێم وت:

-(بەڵێ وایە.... بەم پرسیارانەت ئەتەوێت بگەیتەچی؟)

-(هیچ، هەر لەبەرئەوەی روخسارت بەلامەوە نامۆ نەبوو، رێم بەخۆمدا قسەبکەم، بۆئەوەی دڵیشت پاکبێتەوە داوای لێبووردن ئەکەم گەر هەراسانم کردبێت. بەهیوای دیدارێکی تر، لەوانەیە لەچێشتخانەی "کەرییس"!).

پاشان بەشێوازی سەربازانی ئەڵمانی سلاوی لێکردم و بەخێرایی لەفارگۆنی چێشتخانەکە چووە دەرەوە. دڵنیابووم کەپۆلیسی تورکیا ئەیەوێت پیلانێکم بۆ بچنێت، بۆیە بڕیارمدا بەپەلە لەشەمەندەفەرکە دابەزم و ئامرازێك بدۆزمەوە بۆ گەیشتنە سوریا. لەوێستگەی دواتر بەپەلە خۆم گەیاندە یەکێك لەدەرگاکان، ژەندرمەیەکی تورك لەبەردەمیدا وەستابوو، رێی نەدام دابەزم و بەپەنجە ئاماژەی کرد بۆ وشەیەکی سەربازیی بەناوبانگی تورکی "یاساق" واتە قەدەغەیە.

خۆم کوتا بۆ دەرگایەکی تر سەیرئەکەم ئەویش لەلایەن خوێرییەکی ترەوە گیراوە و پاڵی پێوەنام بۆ ناوە و قیژاندی "یاساق"ە. هیچ چارەیەکم نەما جگە لەوەی کە بگەڕێمەوە بۆ فارگۆنەکەی خۆم بەدڵێکی پڕ لەئازار و ترسەوە لەئەنجامی ئەم پێشهاتە.

دوای چەند خولەکێك شەمەندەفەرەکە کەوتەڕێ، جۆرج گەڕایەوە و ئەفسەرێك و دووسەربازی چەکدار دەوریاندابوو، ئەفسەرەکە فەرمانی پێکردم دوایکەوم بۆ فارگۆنەکەمان. دوایئەوەی شتەکانم هەڵگرت،ئەفسەرەکە لەبەردەم فارگۆنی پۆستەکەدا وەستاو داوای لەکارمەندی پۆستەکە کرد هەموو گوێنی پۆستەکان بێنێتە دەرەوە، کابراش بە بۆڵەبۆڵێکەوە وتی:

-(ئەو هەموو گوێنیە لەکوێ دابینێم؟)

ئەفسەرەکە تێی خوڕی:

-( لەکوێ ئەتەوێ داینێ؟ ئەمە کێشەی خۆتە)

کارمەندە هەژارەکەی پۆست بەتەتەڵەکردنەوە وەڵامی دایەوە:

-(بەڵێ...بەڵێ جەنابی ئەفسەر بەدوای شوێنێکی تردا ئەگەڕێم، پێموایە لەفارگۆنەکەی تەنیشتمان شوێنێکی گونجاو ئەدۆزمەوە.)

دوایئەوەی سەربازەکان لەبەردەم دەرگای ژوورەکەماندا وەستان، ئەفسەرەکە دەستیکرد بەپشکنینمان و کاتێ سەفتە پارەکانی لای جۆرج دۆزیەوە، یەکسەر دەستی بەسەرداگرت و کەوتە پشکنینی گیرفانەکانی من بەو هیوایەی چەکێکی ئاگرین بدۆزێتەوە. کە بێهیوابوو لەوە، ناسنامە سوریەکەم و ناسنامە رۆژنامەنووسییەکەمی کە هی رادیۆی بەیروت بوو برد. لەکاتی پشکنینی گیرفانەکانمدا چەرخێکی بەنزینی جوانی دۆزیەوە کە یەکێك لەناسیاوەکانم لەدیمەشق بەدیاری دابوویمێ، ئەفسەرەکە بەتامەزرۆییەوە لەناودەستیدا ئەمدیودیوی پێکرد و پاشان دایەوە دەستم. دوای رۆیشتنی ئەفسەرەکە، پۆستەچییەکە داوای لێکردم چەرخەکەی پێبفرۆشم.

منیش بەتوندی وەڵاممدایەوە:

-(ئەوە دیارییە ونافرۆشرێت!)

ئەویش زیاتر سوورنەبوو، بەڵام بێهوا نەبوو لەوەی کە دەستینەکەوێت.

لەفارگۆنی پۆستەکەدا، جۆرج بەخەمباریی دانیشتبوو، منیش بەپێوە پاڵمدابوو بەپەنجەرەکەوە و چاودێری رێڕەوەکەم ئەکرد کەدووسەربازەکە بەکڵاوخودی جەنگییەوە وەستابوون و پۆستەچییەکەش کەرووخسارێکی منداڵانەی کەڵلەڕەقی هەبوو،خەوی بەچەرخەکەمەوە ئەبینی. لەو دیمەنە و وردبوومەوە، هەستم بەترسناکی دۆخەکە کرد. لەوکاتەدا نەهامەتییەکەی (رەشاد)م بیرکەوتەوە لەدیاربەکر و رووخساریم هێنایەوە بەرچاوی خۆم، کەکاتێك گەیشتە قامیشلی، شوێنەواریی ئەشکەنجە کاری کردبووە سەر جەستە و تەندروستیی، لەدڵی خۆمدا وتم: (نا... نابێت منیش وام بەسەربێت، ئەبێت لێرەنەمێنمەوە و خۆم رزگاربکەم لەچنگاڵی گۆستابۆی تورك، پێشئەوەی کاتەکە درەنگ ببێت.)

(ڕەشاد) ماوەی چل ڕۆژ لەدیاربەکر ئەشکەنجە درابوو، بەڵام پاسەوانێکی کورد بەزەیی پێداهاتبووە و بەهەموو توانا یارمەتی دابوو تا بەزیندوویی بمێنێتەوە. لەژێر دەرگەی زیندانەکە و لەدرزەکانی بنمیچەکەوە قەراغە نانی بۆ فڕێئەدایە ژوورەوە. ڕۆژێك والی ئەچێت بۆ پشکنینی زیندانەکە و سەری ئەسوڕمێت لەو قیژە توندەی لەزیندانەکەوە گوێی لێئەبێت و داوائەکات ئەو کەسەی بۆ بهێنن کە ئاوا ئەقیژێنێت، ئەوانیش ڕەشاد ئەهێننە بەردەمی کەبەشێوەیەکی ترسناك لاوازبووە وهەمووگیانی لەئەنجامی ئەشکەنجەی درِندانە شین بۆتەوە.

ئەو ڕۆژە و لەبەردەمی پۆلیسی تورکدا بەقووڵی بیرم لەڕەشاد ئەکردەوە، چونکە بیانووی زۆرم هەبوو کە بترسم لەوەی ڕاپێچی تورکیام بکەن. ئەترسام مامەڵەیەکی لەو جۆرەم لەگەڵ بکەن، چونکە تەنیا تەمەنم ١٠ ساڵبوو کە بەبێ ویستی خۆم تورکیام بەجێهێشت، بەڵام چۆن ئەتوانم خۆم ڕزگاربکەم؟.

هەستم ئەکرد پەتەکە وردە وردە لەدەوری گەردنم دێتەوەیەك. دوای شەنوکەوی هەموو ئەگەرەکانی بەردەمم و بیرکردنەوە، گەیشتمە تەنیا چارەسەری گونجاو، ئەویش ئەوەبوو لەکاتی ڕۆشتنی شەمەندەفەرەکەدا لەپەنجەرەکەوە خۆم فڕێدەمەخوارەوە.

گەنجێکی وەرزشکاربووم و ڕاهاتبووم لەسەر سواربوون و دابەزین لەترامەوای لەکاتێکدا بەخێراییەکی زۆر ئەڕۆیشت، خۆشبەختانە ئەو ڕۆژەش جووتێك پێڵاوی نەرمی وەرزیشم لەپێدابوو. پلانەکەم هێنایە بەرچاوی خۆم کەبریتیبوو لە: (خۆم هەڵدەمە دەرەوە و بەقەراغی پەنجەرەکەدا خۆم شۆڕکەمەوە و هەردوو قاچم گیربکەم لەشەمەندەفەرەکە و پاشان بەهەموو هێزمەوە خۆم هەڵدەم بۆدواوە بۆئەوەی لەسەرقاچ خۆم بگرمەوە.) لەڕاستیدا ڕزگاربوونەکەم بەشێوەیەکی جیاواز لەوەی بیرم لێکردبووەوە و بەخێراییەکی چاوەڕوان نەکراو ڕوویدا.

دوای ئەوەی بڕیاری ڕاکردنمدا، دەستم خستە پشتمەوە بۆ پشکنینی پەنجەرەکە، هـەرزوو دڵنیابووم لەوەی کە پەنجەرەکە دووتاکە و بەئاسانی بەلای ڕاست یان چەپدا دەکرێتەوە، ئـەم دۆزینەوەیە شادمانی کردم و سوورتربووم لەسەر خۆرزگارکردن.

بەهێمنی تاکێکی پەنجەرەکەم ڕاکێشاو بـەنیوەکراوەیی بەجێمهێـشت، لەبەرئـەوەی نـاو فارگۆنەکە تاریکبوو ئەم کارەم سەرنجی کەسی ڕانەکێشا، ئیتر ئەبوو ڕێگەیەك بدۆزمەوە بـۆ چەند چرکەیەك دووسەربازەکە سەرگەرم بکەم، بۆیە بەبیرمدا هـات قوربـانیی بەچـەرخەکەم بدەم. ئاماژەم بۆ پۆستەچییەکە کرد و پێم وت:

-(ئەوە ڕام گۆڕی و ئامادەم چەرخەکەت پێبفرۆشم.)

ئەویش بەناباوەڕییەوە وەڵامی دامەوە:

-(گاڵتە ئەکەیت!)

-(نەوەڵا، ها ئەوە چەرخەکە)

پۆستەچییەکە چەرخەکەی وەرگرت و بەتامەزرۆییەکی ئاشکراوە پرسی:

-بەچەند؟

پێم وت:

-(ئەزانم زۆر حەزئەکەیت ببیتە خـاوەنی ئـەم چـەرخە و ئامادەشـیت چـەند داوابکـەم بدەیتێ، بەڵام من نامـەوێت هەلەکـە بقۆزمـەوە، لەفارگۆنەکـەی تەنیـشتمان ژمارەیـەك خەڵکی سووری لێیە و بێگومان ئەوان ئەزانن چەند ئەهێنێت، بڕۆ لێیان بپرسـە چـەرخێکی ئاوا بایی چەندە ئەوان هەرچەندێکیان وت و لەوەش کەمتر ئەدەمێ.)

بۆئەوەی بچێت بۆ فارگۆنەکە، ئەبوو بەبەردەم دووپاسـەوانەکەدا بـەڕێڕەوەکـەدا بـڕوات، منیش ئەوساتەم دەستنیشان کردبوو بۆئەوەی لەشەمەندەفەرەکەوە خۆم هەڵدەمـەخوارەوە، بەڵام عەقڵی ناوەوەم بڕیاری شتێکی تریدا.

دوای چەند رۆژێك جۆرج بۆی گێرامـەوە کـە پەنجەرەکـەم کردۆتـەوە و بەسـەردا خـۆم هەڵداوەتـە دەرەوە وەك ئـەوەی خـۆم هەڵدەمـە نـاو مەلەوانگـە یـان دەریـاوە، خێرایـی دەستپێـشکەرییەکەم بـەلای دووسـەربازەکەوە زۆر کتوپڕبـوو و بەپەلـە بـەرەو دەرگـای فارگۆنەکە هاتن بۆ گرتنم، لەتاریکییەکەدا یەکێکیان هەولیدا کوێرانە تەقـە بکـات، بـەڵام ئەویتریان دەستی گرت و وتی:

- (وازی لێبهێنە،خوا ئەیکوژێت.)

منیش کەبەسەر سەرودەستمدا کەوتم،بەشێوەیەکی شێتانە رامنەکرد بـۆ دوورکەوتنـەوە لەشەمەندەفەرەکە کەبەخێرایی ٨٠ کم لەسـەعاتێکدا ئەرۆیـشت و وەسـتا و گەڕایـەوە بـۆ شـوێنی رووداوەکـە. لـەوێوە لەبـەر روونـاکی برۆجیکتۆرەکانـدا پـۆلیس و ژەندرمـە و سەربازەکانی تورك دوامکەوتن. کارەکەشـیان بـەوە ئاسـانبوو کەلـەکاتی خۆهەڵدانەکـەدا کاتژمێرەکەم لێکەوتبوو، لەو ماوەیەدا من لەشوێنەکە دوورکەوتمـەوە، لـەکاتی راکردنـە شێتانەکەمدا لەپڕدا هاتە خەیاڵم کە گوێم لەدەنگە دەنگـە و پێـشمەوابوو سـێبەری خـەڵکم بینـی، بۆیـە بەنائاگاییـەوە بەدەمـدا خـۆم فڕێدایـە پـەنا تەپۆلکـە کایەکـەوە، کاتێـك ئارامبوومەوە،هەستامەوەو بەنائاگاییەوە کەوتمەڕێ.

دوای ماوەیـەك هۆشـم کەوتـەوەکار، بـەڵام بەشـێوەیەکی زۆر ناهاوسـەنگ، چـونکە نەمئەزانی لەکوێم، بۆ بەم شەوە باراناوییە ئەسوڕێمەوە؟ لەکاتێکدا من ئـا لـەم سـەعاتەدا لەجێیەکی گەرم و نەرمدا ئەخەوتم.

لەبەرخۆمەوە ئەمپرسی:

- (ئایا راستە مـن لەشەمەندەفەرێکدابووم و تورکـەکان لەفارگۆنێکـدا دەستبەسـەریان کردووم و منیش رامکردووە و لەپەنجەرەکەوە خۆمهەڵداوەتە خوارەوە؟ بـەڵام مـن لـەکوێم؟ ئایا لەناو سوریام یان تورکیا؟و لەکام ناوچەی ئەو دوو وڵاتەدام؟)

بەدەم ئەم پرسیارانەوە ڕێگەیەکم دۆزییەوە و گرتمەبەر.ئەمە بارانێکی نەرمی پاییزیی شەوەکەی سازگارئەکرد بەبێ ئەوەی زۆر تەڕم بکات، بەڵام یارمەتیدام بۆئەوەی بێمەوە هۆش خۆم. دوای چەند خولەکێك کۆمەڵێك خانوو و درەختم بینی: بێگومان من لەگوند یا شارێك نزیك ئەبمەوە بەڵام ئاخۆ کوێ بێت؟

دڵنیانەبووم کە لەناو سوریادام و ئەترسام وانەبێت. بەڵام نەوەستام، لەپڕێکدا کەسێك بەزمانی عەرەبی هاواریکرد:

-(ئەوە کێیە؟)

وەڵامم دایەوە:

-(خۆمانین)

-(باشە، ئەتوانیت بپەڕیتەوە.)

لەوێوە تێگەیشتم کە لەناو سوریادام و ئەو شارەش شاری (عامودا)یە کە نزیکەی ٣٠کم لەقامیشلییەوە دوورە. کاتێك چوومە ناو ماڵەکانەوە دڵنیابووم شاری عامودایە، شارێکی بچووکی کوردییە و ژمارەیەکی زۆر ناسیاو و هاوڕێی تیایە، لەهەمووشیان چاکتر خێزانی (شێخ موس) کە بەپاکیی و نیشتمانپەروەرێتی راستگۆیانە ناسراون، ئەمزانی ماڵیان لەکوێیە، بەڵام لەوساتەدا هێشتا تەواو نەهاتبوومەوە هۆش خۆم، بۆیە لەرێبوارێکم پرسی کە ماڵەکەیانم پیشان بدات.

ئەویش بەلایەوە سەیربوو کە لەودرەنگ وەختەدا بەشەقامەکانی عامودادا ئەسوڕێمەوە و لێی پرسیم:

-(چیت بەسەرهاتووە؟ لەوەئەچێت کەسێك لێیدابیت؟ دەی...دوایی بۆمانبگێڕەرەوە چیت لێبەسەرهاتووە.)

دەرگاکە داخرابوو و ماڵەکەش بێدەنگبوو، بۆیە چەندین جار لەدەرگامانـدا و بەدەنگی بەرز بانگمانکردن، سەرەنجام محەمەد عەلی دەرگاکەی بۆ کردینەوە، کاتێك بینیمی لەتر

ئەدەم بەپەلە بردمی بۆ هۆڵی میوان و جێگەیەکی بۆڕاخستم. کە پاڵکەوتم هەوڵمدا بەپێی توانا ڕووداوەکەیان بۆ بگێڕمەوە، بەڵام دیاربوو کەوتنەکەم زۆرتوندبووە، بۆیە هەرزوو تام لێهات و کەوتمە قسە وەك ئەوەی وڕێنەبکەم:

-(تورکەکان شادمان بوون کە منیان بینی لەبەردەستی خۆیاندا، بەڵام نایەڵم داخی خۆیانم پێبڕێژن، ناتوانن لەناومانبەرن، بڕوام پێبکەن سەرەنجام بەسەریاندا سەرئەکەوین.)

بەو شێوەیە قسەکانم دەستپێکرد و وردە وردە بوو بە پرخەپرخ. بەرەبەرەیان دەنگەدەنگێکی بەهێز بێداری کردمەوە. لەهۆڵەکەدا نزیکەی ١٠ کەس لەهاوڕێیانی کورد و ئەرمەن کەکاکیشمیان لەگەڵ بوو کۆبووبوونەوە تا دڵنیابن من هێشتا زیندووم و بەچاوی پڕ فرمێسکەوە باوەشیان پیاکردم. ئێستاش هەروەك ئەوەی دوێنێ ڕوویدابێت، دێتەوە یادم کە چۆن کاکم و خاوەنە ئەرمەنەکەی چێشتخانەی "کەربیس" وەك منداڵ فرمێسکی گەرمیان ئەڕشت و پشتیان تێئەکردم بۆ شاردنەوە و سڕینی فرمێسکەکانیان ، بۆیە پێموتن:

-(پێویست بەگریان ناکات وەك ئەبینن تەندروستیم باشە.) لەگەڵ ئەو وشانەدا لەسەرجێگەکە هەستام، بەڵام قاچم لەگەڵم نەهات و کەوتمە سەرجێگەکە. کاکم لەشمی پشکنی بۆئەوەی دڵنیابێت کە هیچ کوێم نەشکاوە. قوڕ سەر و دەستی داپۆشیبووم و مشت و پەنجەکانم زۆر ئازاریان ئەدام، بەڵام هیچ شکاویی و لەجێچوونێکم نەبوو، تەنیا جەستەم کوترابوو. ئەو هاوڕێیانەی لەدەورمبوون پێیانوابوو کە ڕاکردنەکەم بەم شێوەیە، لەبەخشندەیی خواوەبووە و "کەربیس" بەڵێنیدا بەو بۆنەیەوە قوربانیی بکات، هەر بەڕاستیش بەو بۆنەیەوە دووبەرخی برژاند. خۆرهەڵهات و ئەبوو بگەڕێینەوە بۆ قامیشلی، هەرچەندە ڕووداوەکە شەو ڕوویدابوو کەچی کۆمەڵێکی زۆر خەڵك لەبەرماڵەکەماندا کۆبووبوونەوە و بۆ دڵنیابوون لەبێوەیی من.

ماوەیەکی کەم دوای راکردنەکەم تورکەکان بەدەسەڵاتدارانی فرەنسی و ئینگلیزیان لەقامیشلی وتبوو کە سیخورێکی ترسناکی ئەڵمانی شەو لەشەمەندەفەر خۆی هەڵداوەتەخوارەوە و ئێستا لەسەرخاکی سوریایە و پێویستە سنوور دابخرێت بۆ ئەوەی دەستگیربکرێت پێشئەوەی کارێکی تێکدەرانە ئەنجام بدات.

دوای دووڕۆژ پیاوانی ئاسایشی فرەنسی و ئینگلیزی هاتن تا لەبارەی ئەو رووداوەوە لێکۆڵینەوەم لەگەڵدا بکەن، دوایئەوەی بەسەرهاتەکەم بۆگێڕانەوە دەستیانکرد بەپێکەنین و بەڵێنیاندا یاداشتێکی نارەزایی ئاڕاستەی دەسەڵاتدارانی تورکیا بکەن سەبارەت بە(پێشێلکردنی مافی رێبوارانی خەڵکی سوریا)و بەڵێنیشیاندا هەوڵ بدەن بۆ گەڕاندنەوەی جانتاکاکانم کە هەرگیز چاوم پێیان نەکەوتەوە.

سەبارەت بەجۆرج ئەزمیرلی هاوسەفەریشم کە هیچ پەیوەندییەکی نەبوو بەبزووتنەوەی نیشتمانی کوردەوە، راپێچی ماردینیان کردبوو و سێ رۆژ خستبوویانە زیندانەوە و پاشان ناردیانەوە بۆ قامیشلی، دوایئەوەی ٥٠٠ لیرەی سوریان لێبەتاڵان بردبوو.

بۆ ماوەی چەندین مانگ بەدرێژایی سنووری تورکیا لەپارێزگای ئەلجەزیرە،خەڵك لەدانیشتنەکانیاندا باسی راکردنەکەی منیان ئەکرد.

لەپاییزی ١٩٤٢دا دەستمدایە کشتوکاڵ بەمەبەستی بەردەوامبوونی پەیوەندییەکانم لەگەڵ خەڵکی کورد و لەهەمانکاتدا دابینکردنی بژێوی خۆم. تا ساڵی ١٩٤٠ زەوییە کشتوکاڵییەکان نرخێکی گەورەیان نەبوو و ئەتوانرا، بەمەرجی زۆرباش وەربیگرێت. لەلای خۆشییەوە نوسینگەی دانەوێڵە لەسوریا کەدەسەڵاتی ئینتدابی فرەنسی و ئینگلیز دایانمەزراندبوو وبەڕێوەیان ئەبرد، تۆوی برنجی هاوردەی میسریان بەجووتیارەکان ئەفرۆشت و توانیبووشیان سەرمایە و زەوی بەراوی بەکەڵك بۆ چاندنی برنج (مەرمزە) پەیدا بکەن.

یەکێك لەسەرمایەدارەکانی لوبنان کەناوی (سەید خەباز)بوو، بەڕێوەبەری بانکی سوری- لوبنانی بوو لەقامیشلی، سەرمایەیەکی گەورەی هەبوو و بەشێکی فراوانی

زەوییەکانی جزیرەی وەبەرئەهێنا و کۆمپانیاکەی بەناوی (شای برنجی جەزیرە)زۆر سەرکەوتووبوو.

کاتێک خۆم ئامادەئەکرد بۆ چاندنی زەوییەکانمان لە(جالوساکان)،سەید خەباز پێشنیازی کرد بەهاوبەشیی بیچێنین، ئەشیویست بەتوانای دارایی زۆر و کارگوزارە پسپۆڕەکانییەوە کارم تێبکات، بەلام پێشنیازەکەیم رەتکردەوە، چونکە پێشتر لەگەڵ جووتیارە کوردەکان رێکەوتبووم و زەوی و ئاو و تۆوم خستبووە بەردەستیان بەومەرجەی هەمووکارەکان ئەنجام بدەن و بەرامبەر بەوە داهاتەکەی بەنیوەیی بەشبکەین، کارەکەیان سەختبوو و چەند هەفتەیەکی ئەخایاند و ئەبوایە جۆگە هەڵبەستن و قەراغی زەوییەکە هەڵبدەنەوە بۆ ئەوەی وەك گۆمی گەورەی لێبێت و پڕبێت لەئاو و شەتڵەکان داپۆشێت.

ئەم چالاکییە بوارێکی فراوانی رەخساند تا هاموشۆی گوندەکان بکەم و بەشداری گفتوگۆ سیاسیی و کۆمەلایەتیی و ئایینیی و ئەدەبییەکان بکەم لەگەڵ جووتیارانی کورد و کاربەدەستانی فرەنسی و ئینگلیز و هەوڵی زۆرم ئەدا تا بایەخیان بەلای مەسەلەی کورددا رابکێشم.

لەساڵی ١٩٤٣وە سەرتاپای قوچەکی دەسەلاتی فرەنسی و ئینگلیزی لەسەرەوە بۆ خوارەوە هەندێك قایلبوونیان دەربڕی لەهەموو بوارەکاندا بەرامبەر بەگەلی کورد. لەسوریا ئەم هاوسۆزییە بەشێوەی سەردانی کەسانی سیاسیی و پیاوماقوولی کورد بەرجەستەبوو،هاوسۆزییەکە ئاشکرابوو بەتایبەت لەعێراق کە لەساڵی ١٩١٩ەوە لەلایەن ئینگلیزەوە داگیرکرابوو، لەساڵی (١٩٣٤)یشەوە هەردووبرا "ئەحمەد و مستەفا بارزانی" وبەشێکی زۆری خێڵەکەیان راگوێزرابوون بۆ بەسرە،لەوێش لەئۆردوگای زۆرەملێدا دانرابوون و پاشماوەی خێزان و خێڵەکەشیان لەسەرتاسەری عێراقدا پەرشوبلاو کرابوونەوە،و ئینگلیزەکان ناوچەی بارزانیان وەك ناوچەی قەدەغە راگەیاندبوو، ساڵی ١٩٤٢ بارزانییەکان لەبەسرەوە گواسترانەوە بۆ سلێمانی کە ناوەندی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردبوو

نەعێراق و لەو دەمەشدا ڕێکخراوێکی سیاسیی لەشارەکەدا دامەزرا بەناوی (هیوا) کەچالاکییەکانی بۆ سەرتاسەری کوردستان فراوان کرد. کادر و ئەندامانی هیوا، بریتیبوون لەجووتیاران و خوێندکاران و ڕووناکبیران، سەرەڕای دەرەبەگەکان و ئەو ئەفسەرانەی لەریزەکانی سوپای عێراقدا بوون.

چالاکیە نهێنییەکانیان بەرهەمەکەی ئەوەبوو کە لەساڵی١٩٤٣دا و بەیارمەتی سەرکردایەتی هیوا، مستەفا بارزانی و هەندێك لەپیاوەکانی توانیان ڕابکەن و بگەنەوە ناوچەی بارزان و تەنیا ماوەیەکی کەمی پێویستبوو تاسەدان کەس لەجەنگاوەرانی خێڵەکەی لەدەوری کۆببنەوە و ئیتر کەوتە پەلاماردانی چەندین بنکەی پۆلیس لەناوچەکەدا، و بەدیل ئەیگرتن و بەئاسانیی چەکی ئەکردن، کاتێکیش هەستیکرد بەهێزبووە، لیستێکی داواکارییەکانی پێشکەش کرد.

لەو ماوەیەدا ئەڵمانیا بەهێز و سەرکەوتووبوو لەمەیدانەکانی جەنگدا و بریتانیاش چاوپۆشی ئەکرد لەپەیوەندی بازرگانی و نوێ و پتەوی نێوان ئەڵمانیا و تورکیا، تەنانەت خۆشی لەوەبێدەنگ کردبوو کەتورکیا ماددەی خاوی پێویست بۆ پیشەسازیی جەنگ ئەدات بەئەڵمانیا. ئینگلتەرە چاوەڕێبوو تا (فەرماخت) لەیەکێتی سۆڤییەت و باکووری ئەفریکا شکستی هێنا ئینجا تورکیای ناچارکرد ناردنی کرۆم بۆ ئەڵمانیا ڕابگرێت.

کاتێك ئینگلتەرە لەوە دڵنیابوو کەتورکیا بایەخ بەڕەخنەکانی نادات،بیرۆکەی ڕاپەڕینێکی کوردی قبوڵ کرد و ئەمجارە نەچووە ناوەوە تابەهێزە تایبەتەکانی خۆی سەرکوتی بکات و لێگەڕا بەغداد خۆی کێشەکە چارەسەر بکات و دژی ڕاپەڕیوانی کورد بجەنگێت، لەولاشەوە بەیارمەتی ڕێکخراوی هیوا، بارزانی سوپای عێراقی تێکشکاند و بەرەو هەولێر ڕۆیشت، بۆیە بەپەلە نووری سەعید کەئەو کات وەزیری یەکەم(سەرەك وەزیران)ی عێراق بوو داوای ئاگربەستی کرد و بارزانی بانگهێشتکرد بۆ بەغداد بۆ پێشکەشکردنی داواکارییەکانی. بارزانی بەهاوڕێیەتی وەفدێك چووە بەغداد، لەوێ

دانپیانانی حکومەتی عێراقی بۆ مافە ڕووناکبیریی و ئیدارییەکانی کوردستانی عێراقی بەدەستهێنا. لەرێگەی گەڕانەوەی بەهەولێر و کەرکوکدا بارزانی لەلایەن کوردەکانەوە وەك رزگارکەری کوردستان پێشوازی لێکرا. هەر لەوساتەوە حەزم ئەکرد بچم بۆ عێراق بۆ دیداری بارزانی و لێپرسراوانی هیوا، بەڵام سەرەڕای دەستێوەردانی بەرپرسێکی ئینگلیزیش، کەچی لێپرسراوانی ئینگلیز لەقامیشلی زۆربەتوندی ئەوەیان ڕەتکردەوە فیزای چوونەناو عێراقم بدەنێ.

لەو ماوەیەدا یەکێك لەئەندامانی کاریگەری هیوام ناسی کە ئەوکاتە لەبەشی کیمیای زانکۆی ئەمێریکایی لەبەیروت ئەیخوێند و جارجار بۆ هەندێك ئیشوکار ئەهات بۆ قامیشلی. لەیەکێك لەسەردانەکانیدا نیازەکەی خۆمم پێوت، ئەویش ئامادەیی دەربڕی لەرۆژێکدا کە ئەو دیاریئەکات لەسەر سنووری عێراق و سوریا ببینێت و بمبات بۆلای بارزانی.

چەند مانگێك تێپەڕی و من بێئومێدبووبووم، کەهەندێك هاوڕێی نیشتەجێی سنووری عێراقم هاتن و پێیان ڕاگەیاندم کە(ئامێدی) لەماڵی ئەوان چاوەڕوانمە، تابمبات بۆلای بەرپرسانی کورد لەعێراق.

منیش یەکسەر بەسواری ماتۆڕە (جاوا) کەم بووم و دوای چەند سەعاتێك لای ئەو بووم.

# عێراق و لوبنان

- دوومانگ لەزیندانەکانی موسڵ و بەغداد

- مانگرتن لەخواردن

- ژیان لەزیندانەکانی عێراقدا

- لەبەندینخانەی عەمارە

- لەناو گیراوانی کورد و عەرەب و ئەوروپییدا

- دۆخی بارزانی و کوردەکان لەسایەی ئینتدابی ئینگلیزیدا

- خوێندن لەبەیروت و کردنەوەی قوتابخانەیەکی شەوانە

- پەنابەرانی کورد لەلوبنان

لـەمانگی تـەموزی ١٩٤٤دا بـووین، لەوسـاڵەدا چـەندین تـەمن بـرنجم چـاندبوو و بەتامەزرۆییەوە چاوەڕێی دروێنەبووم، کاتێك هاوڕێکەم لەموسـڵەوە هـات تابعیـات بـۆلای بارزانی و سەرکردایەتی هیوا. بێئەوەی یەك چرکە دوودڵبم و بواریشم هەبێت راوێـژ بـەکاکم و ئەوهاوڕێ کوردانەم بکەم کـە شانبەشـانی مـن تێئەکۆشـان، سـەبارەت بـەپرۆژەی ئـەم گەشتە. باوەڕی تەواوم بەئامێدی هەبوو.

رۆژی دوایی پێش بەرەبەیان ڕێگەیەکمان گرتەبەر بـۆ گەیـشتنە خـاکی عێـراق و دوای دووسـەعات، رووبـەڕوو تووشـی دووپـۆلیس بـووین. کەلەپـشت گردێکـەوە دیارنـەمان و وایانئەزانی ئێمە دووکەسی ئەڵمانین وبەموعجیزە لەوشوێنە دانیشتووین.

بەئامێدیم وت:

-(هەسـتیان بـەبوونمان کـرد و بەمزووانــە بــەهێزێکی گــەورەوە ئەگەڕێنــەوە بــۆ دەستگیرکردنمان. با پێشئەوە ئێمە بگەڕێینەوە بۆ سوریا.)

وەلامی دامەوە:

-(بەڵام... نا..ناگەینــە سـنوور... ئـەوانیش بەدوامانـەوە ئـەبن و کاتێـك کەئـەزانن ڕامانکردووە تەقەمان لێئەکەن، بۆیە باشتروایە لەسەر رۆیشتنی خۆمـان بـەردەوامبین، وەك خەڵکی ناوچەکە.)

-(گەر قسەمان لەگـەڵ بکردنایـە ئـەمانتوانی شـتێك بکـەین. بـەڵام تـازە هیـچمان پێناکرێت.)

ئامێدی دڵنیای کردمەوە و وتی:

-(گریمان دەستگیرکراین، زۆر لەزیندانـدا نامێنینـەوە، دڵنیابـە بـارزانی دواناکـەوێت لەدەستێوەردان و داواکاریی ئازادکردنمان.)

من وەك ئامێدی گەشبین نەبووم، بەڵام نەمنەتوانی جێی بهێڵم و بگەڕێمەوە بۆ سوریا.

دوای سـەعاتێك، ۱۰ پۆلیـسی سـوارە دەوریانـداین، تفەنگـەکانیان رووتێکـردین و فـەرمانیان پێکـردین بوەسـتین و دەسـت بەرزبکەینـەوە. یـەکێك لەپۆلیـسەکان سـەربەند (عەریف)بوو، سەیری ناسنامەکانمانی کرد، بەڵام نـەبڕوای بەناسـنامە سـوریبەکەی مـن و نەناسنامە عێراقییەکەی هاوڕێکەم کرد و هەردووکیانی خستەگیرفانییەوە و کەلەبـچەیەکی لەپشتێنەکەی دەرهێناو کردیەدەستی راستی من و دەستی چـەپی هاوڕێکـەم. پۆلیـسەکان دەوریانگرتین و دە کیلۆمەترێك رۆیشتین تا گەیشتینە مەخفەرەکە.

عەریفەکە کەوتە پرسیارباران کردنمان:

-(ئێوە کێن؟ چی ئەکەن لەم ناوچەیەدا؟ هاوڕێکانتـان کـێن؟ مـەرامی راسـتەقینەتان چییە؟)

ئامێدی وەڵامی دایەوە، کەئەو عێراقییە و مامۆستای کیمیایە لەدواناوەندیی موسـڵ، ئێمەش دووهاوڕێی نزیکین ولەبـەیروت یـەکتریمان ناسـیووە و ئـەو هـاتووە بۆئـەوەی مـن بانگهێشت بکات بۆ سەردانی عێراق.

کاتێکیش پرسیاری پاسپۆرتەکەی کرد، وەڵامدایەوە کە پەیوەندی نێوان سوریا و عێـراق باشە و سەردانەکەم بۆ عێراق زۆر کورت ئەبێت.

دوای گوێگرتن لەئیفادەکەمان، عەریفەکە چووە ژوورەکەی خۆی و دەرگاکەی داخست.

لەگەڵ سەرووخۆی بەتەلەفۆن قسەی ئەکرد و داوای رێنمایی لێئەکردن. بـەدەنگی بـەرز قسەی ئەکرد و گوێمان لەهەموو قـسەکانی بـوو، بۆیـە زانیمـان کـە شـەو لەمەخفەرەکـە بەسەردەبەین و سبەینێ ئەمانگێڕنەوە بۆ "جفتیك" کە گوندێکی کوردییە لەسەر رووبـاری دیجلـەو لـەوێوە ئەمانبـەن بـۆ تەلەعفـەر کـە شـارێکی تورکمانـە و ٦٠ کـم لەباشـووری

رۆژهەڵاتی موسڵەوەیە، وقۆناغی یەکەم بەولاخ ئەبڕین، بەڵام قۆناغی دووەم، بـەئۆتۆمبیلی پۆلیس ئەمانبەن.

کاتێك عەریفەکە تەلەفۆنەکەی تەواوکرد، بردینی بۆ حەوشەی مەخفەرەکە و کۆتەکـەی لەدەستمان کردەوە و شریفە کایەکی پیشاندایین کە لەسەری بخەوین و حەسـیرێك کەبیـدەین بەخۆماندا. هێندە شەکەت بووین پێویستمان بەوەنەبوو تکامان لێبکات.

جووتیارێکی کوردی خەڵکی ناوچەکە کاری پاککردنەوەی مەخفەرەکە و خزمـەتکردنی پۆلیسەکان و وڵاخەکانیان ئەنجام ئەدا. کاتێك زانی ئێمە کوردین بایەخی پێدایین و وتی:

-(لەهیچ مەترسن، کەس ناوێرێت ئازارتان بدات.)

ئێوارە ساوەر و چاو ماسـتیان داینـیێ و دووبـەتانی خوریـیـان داینـیێ بـۆ ئـەوەی شـەو لەحەوشەکە بەسەربەرین. بۆ ڕۆژی دوایی بەیانی زوو دوای بەرچـاییەکی سـادە پۆلیـسـەکان ئەسپێکیان داینیێ و لەژێرچاودێری خۆیاندا ڕێگەی موسڵمان گرتەبەر.

نزیکەی نیوەڕۆ گەیشتینە جفتیك کەنەمەخفەر و نەچێـشتخانە و تەنانـەت چایخانەشـی تیانەبوو.

عەریفەکە بردینی بۆ ماڵی ئاغای گوندەکە، کەوەك هەموو ئاغاکانی تر پێشوازیی لـەو ڕێبوارانە ئەکرد کە لەدەرگای ماڵەکەی ئەدەن و سەردانی ئەکـەن، ئەرکـەکانی میوانـداریی جێبەجێکرد. کوڕەکەی هەستێکی نیـشتمانپەروەرانەی باشـی هـەبوو، وخوێنـدکاربوو لای ئامێدی، هەر ئەویش هانیدابوو من لەسوریاوە بهێنێـت و بـەڵێنی پێـدابوو بمبـات بـۆلای بارزانی، بەڵام ئەو ڕۆژە کاتێك بینی ئێمە گیراوین و بەدەست پۆلیـسەوەین،خۆی واپیـشاندا کەئامێدی ناناسێت و لەناو خزمەتکارەکانیدا خۆی شاردەوە کەخەریکی هێنانی خـواردن و سەروکارکردنی ئەسـپەکان بـوون. لـەوێوە ڕۆیـشتین بـەرەو تەلەعفـەر و شـەو گەیـشتین و لەمەخفەرێکدا خەوتین. ڕۆژی دوایی بەئۆتۆمبیلێکی پۆلیس بردیانین بۆ موسڵ، لـەوێوە بـۆ دادگـە. دوای لێکۆڵینەوەیـەکی کـورت دادوەرەکـە بڕیـاری گرتنمانیـدا و یاداشتێکیـشی دەرکرد بۆ پشکنینی ماڵی هاوڕێ عێراقییەکەم.

من لەژوورێکدا گیرابووم کەلەدەرەوە بەکلیل داخرابوو، لەوکاتەشدا راوێژکاری دادوەر بەهاوڕێیەتی دووپۆلیس مالّی ئامێدی هاوڕێمی ئەپشکنی. دووشەو و دووڕۆژ لەگەنجینەی راوێژکاریی گشتیی پۆلیسی موسلّدا بەندبووین، هەر لەوێش کۆمەلێك جەنگاوەری بارزانیمان بینی کە لەکاتی پاسەوانی خالێکی سەرڕێی ناوچە کوردییەکاندا،لەلایەن هێزەکانی عێراقەوە گیرابوون. ئەوان پێیان وتین دوای ئەوەی تورکیا رازیبووە کرۆم نەنێرێ بۆ ئەلّمانیا، ئینگلترە سیاسەتی خۆی بەرامبەر بەکورد و بارزانی گۆڕیوە و دەستیکردووە بەئامادەکردنی سوپای عێراق بۆ هێرشکردنە سەریان. ئەوەشیان پێوتین کە:

-(سبەینێ شەرهەلّناگیرسێ، بەلاّم دلّنیاین کە لەمڕۆوە تاسالێکی تر ئینگلترە هێزێکی گەورە لەدژمان کۆئەکاتەوە.)

لەدلّی خۆمدا وتم، گەر ئەمە رووبدات ئەوا کوردەکانی عێراق هەلێکی باشی ئۆتۆنۆمی لەچوارچێوەی عێراقدا لەدەست ئەدەن و ئەکەونە دۆخێکی ترسناکەوە،بێگومان مانەوەی ئێمەش لەزیندانەکانی عێراق درێژە ئەکێشێت.

سێهەم رۆژی گەیشتنمان بۆموسل، بردیانینە زیندانی ناوەندیی شارەکە و لەقاوشێکدا دایاننناین کە تایبەت بوو بەتۆمەتباران و حوکمدراوان. ئەبوو شەوێك یان دووان لەڕاڕەوێکی تەسکدا بەسەربەرین کەقاوشی حکومدراوان بە مەرگ و زیندانییە ترسناکەکان بەسەریدا ئەپەڕوانی.

لەیەکێك لەقاوشەکاندا شێتێکی بەهەیکەلی تیادابوو کە بەردەوام ئەیقیژاند، جارێك ئەیوت، "مەلیك فەیسەلّە، جارێکیتر ئەیوت، کۆلۆن وێلّسنە یان جۆرجی پێنجەمە" و داوای ئەکرد بیناسنەوە و رێزی شایانی پۆستەکەی خۆی لێبگرن.

بەلاّم کاتێك بۆی دەرئەکەوت کەئەوان نییە و لەزینداندایە، دەستی ئەکرد بەجنێودان و هاوار و هەرچییەکی بەردەستبکەوتایە، ئەیگرتە پاسەوانەکان و ئەو گیراوانەی لەڕاڕەوەکەدا خەوتبوون. کەهیچیشی دەستنەئەکەوت بیهاوێت، پیسایی ئەکرد و هەردوودەستی

لێپرئەکرد و هەلّێنەدایە خوارەوە. بەرێکەوت ئەوشەوە مـن و ئامێـدی لـەنزیك دەرگاکـە خەوتبووین وتەنیا ئێمە کەوتبووینەژێر رەحمەتی شتەکانییەوە. سێ پاسەوان چـوونە ژوورەوە و لێدانێکی چاکیان لێدا تا کەوتەسەر زەوی، بەدەم نووزە نووزەوە، بەلاّم ئێمە تا بەرەبـەیان خەومان لێنەکەوت. رۆژی یەکەمان لەزینـدانی ناوەنـدیی بـەوەرگرتنی پەنجـەمۆر و کـاری ئیداریی ترەوە بەسەربرد، دەستیان گرت بەسەر پارەکانماندا و سـەریان تاشـین و خـستیانینە زیندانێکی تایبەت بەتورکمانی خەلّکی ناوچـەکەو ناچاریـشیانکردین لەسـەرئەو بەتانیانـە بخەوین کە لەسەر زەوییەکە راخرابوون.

شەوی یەکەم ئەسپێ هێرشی بۆ هێنام و ناچاربووم تا بەیانی خـۆم بخـورێنم و نـەمتوانی بخەوم، لەگەلّ خۆرهەلاّتندا کراسەکەمم داکەند تەماشائەکەم سەدان ئەسپێ لەسەرکراسـەکەم ریزیان بەستووە.

-(چۆن ئەتوانن بەم شـێوەیە زیادبکـەن؟تۆ بلّێـی نـەیانکوژن؟ یـان شـەو لەئاسمانـەوە دێنەخوارەوە؟)

لەرۆژی ئەم دۆزینەوەیەمەوە کاری سەرەکیم لەزیندانی ناوەندیی موسلّ، بـوو بەئەسـپێ کوشتن، کەئەمخستنە بـەینی دوو نینۆکمـەوە و دەسـتم پیائـەنان، دەنگـی فلیقانەوەکـەیان ئـەبووە مایـەی شـادیم وەك ئـەوەی بـەمکارە دوژمنـە راسـتەقینەکانی گـەلی کـورد بفلیقێنمەوە، ئەوانەی تائێستاشی لەگەلّ بێت تووشی نەهامەتیان کـردووم. هەنـدێکجاریش هەستم ئەکرد سەری ئەو یاساولّە تاوانبارانە پـان ئەکەمـەوە کـە بێبەزەییانـە و بـێ هـیچ هۆیەك ئەو خەلّکە بێتاوانەیان ئەشکەنجەئەدا، کەرێکەوت و زولّمی کۆمەلاّیەتیی ئەیخـستنە بەردەستیان. لەو بەندیخانە تازەیـەدا هێنـدەم ئەسـپێ کوشـتبوو کـە هـەموو نینۆکـەکانم سوورهەلّگەرابوون.

بەشی تایبـەت بەحوکمـدراوانی بەندینخانەکـە کارگەیـەکی چـنین و دارتاشـخانەیەکی تیابوو، کە سەدان بەندی، رۆژێکی تـەواو ئیـشیان تیائـەکرد لـەپێناو دوو دینـار موچـەی مانگانەدا.

راستە، ئەو ماوەیە لەعێراق موچە زۆر کەمبوو و کاتێك کە لەیەکێك لەپۆلیسەکانمان پرسی، موچەکەی چەندە؟ دوای دوودڵییەك بەهێمنی وەڵامی دایەوە: (٥ دینارە). وتیشی: (موچەکەمان کەمە، بەڵام بەخشیش هەیە.)

کاتێك زۆرسەرمانکردەسەری و لێمانپرسی کە کۆی ئەوەی وەریئەگرێت چەندە؟ وەڵامی دایەوە: (نزیکەی ١٥ دینار).

پۆلیسەکان بێشەرمانە کەوتبوونە بەرتیل وەرگرتن کە داهاتێکی باشی بۆ دابین ئەکردن، بەڵام بەندییەکی جۆلا یا دارتاش لەخوای ئەویست گەر مانگی دوو دینارەکەی دەستبکەوتایە.

١٠ رۆژی یەکەمان لەزیندانەدا، نەمن و نەئامێدی هیچ هەواڵێکمان لەدەرەوە پێنەگەیشت، تا رۆژی دوانزەهەم بەبڵندگۆ هاورێکەم بانگرا و توانی ماوەی ١٠ خولەك لەگەڵ خەزووری قسەبکات. بەمرومۆچی گەڕایەوە و وتی:

-(خەزوورم پێی وتم، هەندێك پارێزەری کورد لەموسڵ داوایان بردۆتە بەردەم دەسەڵاتی تایبەت بۆئەوەی لەبەردەم دادگەدا بەرگریمان لێبکەن، بەڵام دەسەڵاتداران رێیان نەداون بەهیچ شێوەیەك پەیوەندیمان پێوەبکەن. ئەوەشی پێوتم، کە خەڵك لەدەرەوە نیگەرانی مەسەلەکەمانن و هەزار و یەك ئەگەر لەسەرچارەنوسمان تاووتوێ ئەکرێت.)

رۆژی پانزەهەم ئۆقرەم نەما و لەرێی بەڕێوەبەری بەندیخانەوە داوام لەلێپرساوانی دادوەریی و ئیداریی کرد بمدەنە دادگەی تایبەت و گەر تاوانبارم بەپێی قانون سزام بدەن، گەر بێتاوانیش بم، داوانەکەم یەکسەر بمنێرنەوە بۆ سوریا.

هەوڵەکانم نەبوونە جێبایەخ، بۆیە بڕیارمدا مان لەخواردن بگرم. ماوەی ١٠ رۆژ دەمم بۆ خواردن نەبرد وتەنیا جارجارێك چەند قومێك ئاوی سادەم ئەخواردەوە. رۆژی دەیەم بەڕێوەبەرێتی بەندیخانەکە فەرمانیپێدام هۆکارەکانی مانگرتنم لەخواردن روونبکەمەوە، پێیم وتن:

-(ئاسانه.. ئەوەتا من مانگێکە لێرە لەناو چواردیواری زینداندام و ئەسپێ پێستی دارنیووم و خواردنی خراپ ئەخۆم بێئەوەی بتوانم هیچ هەواڵێك یاسەردانێکی خێزانەکەم بەدەستبهێنم.

لەلایەنی قانوونییەوە هیچ کەسێك ناتوانێ تۆمەتبارم بکات بەشتێك، جگە لەوەی بێ پاسپۆرت سنوورم بڕیوە و بەپێی قانونەکانی خۆشتان ئەم تۆمەتە سزاکەی لەنێوان مانگێك زیندان و ٥ دینار غەرامەدایە. ئەمەوێت یەکسەر بدرێم بەدادگە، چونکە هیچ هۆیەك نابینم بۆ ئەوەی لەم زیندانەدا بهێڵرێمەوە.)

بەڕێوەبەری زیندانەکە کەسەری سوڕمابوو، بەتووڕەیی و سووربوونەکەم، پیاوێکی چوارشانەی لاجانگ سپی بوو و دووچاوی رەشی گەورەی هەبوو، لەسەر کورسییەکەی هەستا و بەسۆزێکی باوکانەوە ویستی ئارامم بکاتەوە:

-(بەڕەییت بەگەنجێتی خۆتدابێتەوە، لەسەر ئەم رێیە بەردەوامبیت یا ئەمریت یا تووشی نەخۆشییەکی بێچارەسەر ئەبیت، ئەزانم مافی خۆتە داوای جێبەجێکردنی قانونەکانی عێراق بکەیت سەبارەت بەوەی بەشێوەیەکی ناقانونیی هاتوویتە ناو وڵاتەکەمانەوە، گەر مەسەلەکە تەنها پەیوەندی بەئێمەوە بوایە ئەوا قانونەکەمان وەك خۆی جێبەجێ ئەکرد و ٥ دینارمان لێئەسەندیت و ئەمانناردیتەوە ئەوبەری سنوور، بەڵام بەداخەوە دەستێکی بەهێز شمشێرێکی تیژی لەسەر سەرمانەوە راگرتووە، و تەنانەت وردەکارییەکانی ئیدارەکەشمان بەفەرمان پێئەڵێت. من دڵم بریندارئەبێت کاتێك بیر لەوەئەکەمەوە ئەو جەستە جوانەت لەبرسا ئەتلێتەوە.

بڕوام پێبکە بەلای کاربەدەستانی ئەم وڵاتەوە هیچ گرنگ نییە. بڕیاریانداوە بتگوێزنەوە بۆ بەغداد بۆئەوەی لەنزیکەوە لەدۆخەکەت بکۆڵنەوە، منیش کە بڕوات پێئەکەم هی ئەوەیە خۆم بەرەچەڵەك کوردم. بەڕەییم پیاتایەتەوە و پێمخۆشە هەر ئێستا واز لەمانگرتنەکەت بهێنیت، بەمەرجێك لانیکەم بۆ دووڕۆژ جگە لەشیر هیچی تر نەخۆیت، و

چەندت پێویست بێت بۆت ئەهێنین، شیرەکە یارمەتیت ئەدات پێشنەوەی بتبەن بۆ بەغـداد بێیتەوە سەرخۆت. کەواتە بەقسەم ئەکەیت وانییە ؟

لەژێر کاریگەریی ڕکوراسـتیی پێـشنیازەکانیدا، بڕیارمـدا گوێڕایـەڵیی بکـەم. بـەپێی بەڵێنی بەڕێوەبەر شیرم بەبڕی پێویست و زیاتریش بۆ هێنرا.

سەرلەبەیانی ڕۆژی ٢ی ئـاب پێیـان وتین،بەشـەمەندەفەری ئێـوارە ئـەمانێرن بـەرەو بەغدا. پاشنیوەڕۆ هەردوودەسـتی مـن و ئامێـدییان کەلەپـچەکرد ودووپۆلیـسی تفـەنگ بەدەست و عەریفێکیان لەگەڵ ناردین.

لەبەردەرگای بەندیخانەکەدا ژمارەیەکی زۆری کورد کۆبووبوونەوە و پۆلیس هەوڵی ئـەدا لێمان نزیك نەبنەوە. سەرەڕای ئەوەش توانیم لەناو خەڵکەکەدا "مستەفا بـۆتی" بناسمـەوە کەڕۆژێکیان خوێندنگەیەکی کوردیی لەدێریك کردەوە بەرەزامەندی ئەلفۆنـسێی راوێـژکاری فرەنسی، مستەفا بەدەستێکی فرمێسکەکانی چاوی ئەسـڕی و دەسـتەکەی تریـشی بـۆمن بەرزئەکردەوە و هێمای هانـدانی بۆئـەکردم. لەپڕێکـدا و لـەکاتی ڕۆیـشتماندا لەبەردەمـدا قوتبووەوە و خەمباربوو کەمنی ئەبینی دەسـتم لەکەلەبـچەدایە و نـاتوانم تەوقـەی لەگـەڵ بکەم و بیدوێنم.

هەموو ئەمانە حەوسەڵەیان پێ لەدەستدام و وەك منـداڵێکی بـچووك کەوتمـە گریـان و لەبەرئـەوەی فرمێـسکەکانم بەرچـاویان گرتبـووم و نەمئـەتوانی ببیـنم کـەمێك ڕۆیـشتنم خاوکردەوە، بۆیە پۆلیسـەکە زنجیری کەلەپـچەکەی بەتونـدی ڕاکێـشاو خـەریکبوو بکـەوم بەئەرزدا، بەوە هاتمەوە سەرخۆم و بەخێرایی کەوتینەوە ڕێ بێئەوەی ئاوڕبدەمەوە.

لەوێـستگەی شـەمەندەفەرەکە، بەپاسـەوانیی عـەریف و دووپۆلیـسەکە خـستیانینە فارگۆنێکی پلەدووەوە کە بەگشتیی بۆ پۆلیس تەرخان ئەکرێ، دوایئەوەی شەمەندەفەرەکە لەموسڵ دوورکەوتەوە،سەر و جگەرەمان پێشکەشی پاسەوانەکان کـرد ودەرگـای قـسەمان

لەگەڵدا کردنەوە کە خەڵکی کوێن،ئایا شارەزای بەغدان،بەچەند سەعات ئەگەینە بەغدا، لەم وەرزەدا ئاووهەوای ئەوێ چۆنە؟ پاشماوەیەك عەریفەکە رووبکردە پۆلیسەکان ووتی:

-(پێنەچێت ئەم بەندییانە خەڵکی خوێندەوارین و داخم لێدێت ئاوا بەکەلەبچەکراوی بیاننەوە. ئەڵێم کەلەبچەکانیان بکەینەوە ئێوە ئەڵێن چی؟)

دووپۆلیسەکە وەڵامیان دایەوە:

-(بێگومان دووکەسی بەڕێزن و نرخی راستەقینەی ئەم بایەخپێدانەمان ئەزانن!)

ئامێدی وەڵامی دایەوە:

-(بەدڵنیاییەوە.... نابێت هیچ گومانێکتان هەبێت لەم بارەیەوە.)

عەریفەکە کەلەبچەکانی کردینەوە و لەبەرامبەر ئەوەدا چاوەڕێی پاداشتێکی گونجاوبوو،ئامادەیشی پیشاندا بەدرێژایی رێگەکە خزمەتمان بکات.

ئامێدیش بۆئەوەی سوپاسی بکات نیودیناری لەگیرفانی دەرهێنا و خستییە دەستی عەریفەکەو پێی وت:

-(کە گەیشتینە بەغدا ئەوەندەی تریشتان ئەدەمێ.)

بەم شێوەیە سەفەرەکەمان بێ هەراسانکردن تێپەڕی و پاشنیوەڕۆی ٣ی ئاب گەیشتینە وێستگەی بەغدا. ئێمەش ئەو پاداشتە گونجاوەی بەڵێنمان پێدابوون کردمان بەگیرفانی عەریفەکەدا، بەڵام ئەمەش رێی لێنەگرتن کە کەلەبچەکە بکەنەوە دەستمان تالەشۆستەی وێستگەکە ئەپەڕینەوە. ئۆتۆمبیلێکی پۆلیس راستەوخۆ بردینی بۆ بەڕێوەبەرێتیی گشتیی پۆلیس و لەوێشەوە بۆ بەشی تۆمەتبارانی بەندیخانەی ناوەندیی. خۆمان لەیەکێك لەگەورەترین بەندیخانەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا بینییەوە و سپاردیانین بەعەریفی بەرپرسی قاوشی تۆمەتبارانی نوێ.

عەریفەکە،کردینی بەحەوشەیەکی فراوانی قووڵدا کە سێ ژووری بۆ زیندانەوانەکان تێدا دروست کرابوو ویەکێکیان، کرابوو بەنووسینگە. هەریەکەمان دووبەتانی خووریمان وەرگرت،

بەندییەکانیش تۆزێ خۆیان کۆکردەوە تا لەژوورەکەدا جێمان بکەنەوە، بەتانییەکانمان لەسەر کۆنکرێتەکە ڕاخست. گەرما و ماندوویی شەکەتی کردبووین، بۆیە بێئەوەی گوێبدەینە ئەوهەمووکەسەی لەسەر زەوییەکە وەك ئێمە پاڵکەوتبوون، بۆخۆمان خەوتین.

سەعات ٥ی پاشنیوەڕۆ زەنگی کۆبوونەوە بۆ دابەشکردنی خواردنی ڕۆژانە لێدرا، کەپێکهاتبوو لەنانێك و قاپێك خورما و ئەبوایە بۆ وەرگرتنی لەڕیزێکی ڕێکوپێکدا ڕاوەستین، بەڵام ئەو گیراوانەی ملکەچی ئەم سیستەمە نەئەبوون ئەوا بەزللە و شەق و قامچی پاداشت ئەکران، بێگومان لەخواردنەکەش بێبەش ئەکران. بەندییە هەژارەکان ئەوانەی نەیانئەتوانی لەشوێنێکی ترەوە خواردن بۆخۆیان پەیدابکەن ملکەچی فەرمانە توندەکان ئەبوون.

بەڵام ئەوانەی کەمێك دەستیان ئەڕۆیشت،ناچارنەبوون مل بۆ ئەم سوکایەتییە کەچ بکەن، من و ئامێدیش بڕیارماندا دەستبەرداری ئەو نان و قاپە خورمایە بین، و ڕێگەیەك بدۆزینەوە بۆ ئەوەی لەبرسا نەمرین. ئەو ئێوارەیە هێشتا پاشماوەی ئەو دیارییانەمان پێمابوو کەخێزانی ئامێدی پێشئەوەی موسڵ بەجێبهێڵین پێشکەشیان کردبووین.

دواتریش بیر لەوەئەکەینەوە بزانین بۆ ڕۆژێکی تر چیبکەین.

من و هاوڕێکەم لەگفتوگۆی ئەو کێشەیەدابووین کەپیاوێك بەرەولامان هات. پیاوێکی دەموچاو سپی، ڕوومەت سووری ناوچەوان پان بوو، کەهەردووقاچی بەزنجیر بەسترابوونەوە بەتۆپێکی ئاسنی چەند کیلۆییەوە وئەویش بەسترابوو بەزنجیرێکی درێژی ترەوە کە نزیکەی مەترێك ئەبوو. کاتێك لێمان نزیکبووەوە واقمان وڕما، چونکە ئەوپیاوەی لەبەردەمماندابوو ڕەمزی ئاغابوو کە کوڕی یەکێك لەخێزانە زۆر بەناوبانگەکانی ناوچەی هەولێری عێراق بوو.

ساڵی ١٩٤١ کاتێك ڕەمزی بەشی زانستە ئابوورییەکانی ئەخوێند لەزانکۆی ئەمێریکایی لەبەیروت،نەتەوەپەرستێکی کوردبوو، بەتوندی دژایەتی ئینگلیزی ئەکرد و بووبووە لایەنگری ئەڵمانیا و هیواداربوو ئەڵمانیا سەرکەوێت بەسەر ئینگلیزی چەوسێنەرو

دوژمنی گەلان و تەنیا هۆکاری مەینەتییەکانی گەلی کورد. دوای ساڵێك بەیروتی بەجێهێشت و پێشنەوەی بچێت بۆ زانکۆی ئەستەنبوڵ بۆ وەرگرتنی کۆرسی ئابووریی، گەڕایەوە ماڵی خۆیان لەعێراق. دوایئەوەی رەمزی چوو بۆ ئەڵمانیا و چووە ریزی رێکخراوی لاوانی ئەڵمانیا (هینلەر جۆکەند) وبەخێرایی پۆستێکی سەرکردایەتی تیاوەرگرت.

دوایئەوە دەزگای خزمەتگوزاریی ئەڵمانیا "گۆستابۆ" خستییەگەڕ و بەهاوڕێیەتی ئەفسەرێکی ئەڵمانی بەپەرەشووت لەدەوروبەری هەولێر لەنزیك گوندێکی خێزانەکەی نیشتنەوە و بەگەرمی لەلایەن عوسمانی خزمەتکاری باوکییەوە پێشوازییان لێکرا.

رەمزی و ئەڵمانییەکە لەخانوویەکی دێهاتی رەشید ئاغادا بێخەم لێی خەوتبوون. تاهێزەکانی ئینگلیزی جێگیر لەناوچەکە، لەخەودا ئەدەن بەسەریاندا و رەمزی و ئەڵمانییەکە و عوسمان راپێچی بەغدا ئەکەن.

ئێمە پێشتر پڕوپاگەندەیەکمان بیستبوو کە هەرسێکیان براون بۆ میسر و حوکم دراون بەکاری سەختی هەتاهەتایی بۆ ئەوەی لەبەندیخانەیەکی ناوەڕاستی بیاباندا بۆ خۆیان داڕزێن. بینینی رەمزی بەساغوسەلامەتیی وخەندە منداڵانەکەیەوە،لەراستیدا بۆ هەردووکمان کتوپڕبوو، بەڵام تێیگەیاندین کەباش نییە پاسەوانەکان پێکەوە بمانبینن، گەر پێویستمان بەهەرشتێك بوو هەوڵ ئەدات یارمەتیمان بدات، پاشان بەبەردەماندا تێپەڕی بەزنجیرە قورسەکانی پێیەوە و تۆپەئاسنەکەی بەدەستەوە گرتبوو و بەسەختی رێی ئەکرد.

چەند رۆژێك دوای ئەوەی گەیشتینە بەندینخانەی بەغدا، عەلی حەمدی نوێنەری هیوا لەبەغدا توانیبووی مۆڵەتی چاوپێکەوتنمان بۆ وەربگرێت بۆ رۆژی ٥ شەممە کەرۆژی سەردانی گیراوەکانە. سەردانەکان لەحەوشەی بەشی منداڵان ئەنجامئەدرا،هاوڕێکەم ئەو بەرپرسە کوردەی ئەناسی، چونکە هەردووکیان نیشتەجێی هەمان شاربوون. سەیرمان کرد عەلی حەمدی لەسوچێکی حەوشەکەدایە و کۆمەڵێك قوتوو و بەستەو بتڵی لەچواردەورە.

پێی وتین:

-(هەندێك شتی بچووکم بۆ هێناون بۆ خواردن و جگەرەکێشانی چەند رۆژێك و دواتر ئەگەڵ یەکێك لەچێشتخانە نزیکەکان رێکئەکەوم کەرۆژانە خواردنی گەرمتان بۆ بهێنێت. سەبارەت بەجلە چلکنەکانیشتان، لەسەردانی داهاتوومدا ئەیبەمەوە بۆ ماڵەوە و بۆتان ئەکوڵێنم تا تووشی گەری نەبن، چونکە من دۆخی بەندیخانەکانمان ئەزانم چۆنە و زۆرجار میوانیانم.)

عەلی حەمدی کە لەبەهاری تەمەنیدابوو، کورتەباڵا و لاواز و دەموچاوی هێلکەییەکی گەنم رەنگبوو، چاوەکانی قاوەییەکی کاڵبوون، بەبرژانگی درێژەوە کە دەربڕی بەخشندەیی و ژیانی تێکۆشان و قوربانیدان بوون.

لەماوەی مانەوەماندا لەبەغدا بایەخی زۆریدا بەدابینکردنی پێداویستییەکانمان و هەوڵی زۆریشیدا بۆ ئازادکردنمان، لای مستەفا بارزانیش هەوڵی دابوو کەداوا لەدەسەڵاتدارانی ئینگلیز و عێراق بکات بۆ کۆتاییهێنان بەدیلێتیمان، بەڵام ئەوان پشتیان کردبووە بارزانی و لەخۆئامادەکردندابوون بۆ هەڵکوتانە سەری.

"ماجد مستەفا"ی کەسایەتی کورد کە ساڵی ١٩٤٣ پۆستی وەزیری دەوڵەتی بۆ کاروباری باکوور پێسپردرابوو لەکارخراو ئەو فەرمانبەرانەی کەبەناوی ئەفسەری پەیوەندییەوە لای بارزانی دانرابوون بانگکرانەوە بۆ بەغدا. هەموو بەڵێنەکانی پەیوەست بەبوارەکانی بەڕێوەبردن و رووناکبیری و ئابووریی، تەنیا بەڵێنی بۆش بوون، کەچی سەرەڕای ئەوەش "عەلی حەمدی" بێ هیوا نەبووبوو.

پەنای بردەبەر وەزیرە کوردەکان لەوانەش، زمانزان و مێژوونوسی بەناوبانگ تۆفیق وەهبی، کە ساڵی ١٩٣٣ لەماڵی جەلادەت بەدرخان بینیبووم. عەلی حەمدی پێی وتبوو:

-(ئەو کورە قژ زەردەی دەساڵ لەمەوپێش لەدیمەشق بینیبووت،ئێستا خەریکە لەزیندانەکانی عێراقدا دائەرزێت.)

ماوەی مانگێك زیاتر بەسەر گەیشتنماندا بۆ بەغدا تێپەڕیبوو کەبانگکرام بـۆ ئیـدارەی بەندیخانەکە، پیاوێکی چوارشانە پشتی لەمن بوو، لەگەڵ بەڕێوەبـەری بەندیخانەکـە قـسەی ئـەکرد، کەچـوومە ژوورەوە ئاوڕیدایـەوە و بەچـاوەگەورەکانی سـەیری کـردم، منـیش بەسەرسووڕمانەوە هاوامکرد: (ئای رەشید بەگ!)بەرەولای چووم تاتەوقەی لەگەڵـدا بکـەم. رەشید بەگ تەواو خۆی خوارکردەوە تا بتوانێت باوەشم پیابکات و ناوچـەوانم مـاچ بکـات. پێی وتم: -(تۆفیق وەهبی بەگ ناردوومی تا بایەخت پێبـدەم. بەڕاسـتی پێمبڵـێ پێوسـتت بەچییە؟)

پێم وت:

-(پێویستم بەهیچ نییە، جگە لـەئازادیی، گـەر بتوانیـت لـەم دۆزەخـە دەرمبهێنـە و ببەرەوە بۆ ماڵەوە.)

-(سەبارەت بەئازادیی، ئەوا تۆفیـق وەهبـی بـەگ ئـەڵێت، جـارێ بـیری لێمەکـەرەوە ودانبەخۆتدا بگرە. لەراستیدا ئەم ماوەیە ئینگلیزەکان ململانێـی ئەمێریکییـەکان ئەکـەن لەرێکخستنەوەی دۆخی ناوچە عەرەبییەکان و هێـشتنەوەیان لەبازنـەی کـۆنترۆڵی خۆیـان، بۆیە هەر چـالاکییەکی نەتـەوەیی کـورد بەچـاوێکی خـراپ سـەیری ئـەکرێت و تـووڕەیی حکومەتی خاوەن شکۆ و ئینگلیز تووشی خۆی ئەکات. ئەوان دڵنیـان کـەتۆ و هاوڕێکـەت بەتەواویی لەناو بزووتنەوەی نەتـەوەیی کـورد دان و پێنەچـێت بڕیاریـان دابێـت لەعێراقـدا بەبەندی بتانهێڵنەوە.)

وەڵامم دایەوە:

-(گەروایە با وەك زیندانی سیاسیی سـەیرمان بکـەن و بمانگوێزنـەوە بـۆ کەمپـەکانی گرتنی سەر بەبریتانیا،کە ئەتوانین هیچ نەبێت سوود لەبوارێکی فـراوانتر وەك لـەوەی ئێـرە وەربگرین.)

رەشید بەگ، بەدەنگێکی هێمن و بەکلاکەرەوە پێی وتم:

-(تۆفیق وەهبی، ئامۆژگاریت دەکات کە هەڵپەنەکـەیت. ئێـستاش پـێم بڵـێ ئـەتوانم چیت بۆ بکەم.)

-(کەواتە دەسەڵاتی خـۆت یـا باشـتر بڵـێم دەسـەڵاتی تۆفیـق وەهبـی بەکاربهێنـە و بمگوێزەرەوە بۆ نەخۆشخانەی زیندانەکە، چونکە پێموایە تووشی مەلاریا بووم.)

رەشید بەگ، وەڵامی دامەوە:

-(ئەمەیان هەرئێستا ئەتوانم بۆت جێبـەجێ بکـەم، چـونکە بەرێوەبـەری بەندیخانەکـە یەکێکە لەهاورێکانم، لەوەش زیاتر وانەکەم هەموو ئێوارەیەك لەماڵی ئێمەوە خواردنـت بـۆ بهێنن جا لەنەخۆشخانەکەبیت یا لەزیندان. ئێـستاش بگـەرێرەوە بـۆ قاوشـەکەت و دواتـر ئەنجامەکانت پێ رانەگەیەنم.)

هەمان رۆژ گواسـتیانەوە بۆنەخۆشـخانەی زیندانەکـە. ئەبوایـە بەبەشـی حوکمـدراوان بەکاری قورسدا تێپەریت، کە زۆربەی زیندانەکان بـەزنجیر بەسـتراونەتەوە و یـەکی تـۆپێکی ئاسنینیان پێیە بەکێش و قـەبارەی جیـاوازەوە، هەریەکـەیان بـەپێی ئـەو سـزایەی دادگـا بەسەریدا سەپاندوون.

بەندیخانەی بەغداد چـەندین کارگـەی بەرگـدوورین و چـنین و پیـشەی تـری زۆر زیـاتر لەبەندیخانەی موسڵی تیابوو.

بەندییەکان بەبەرگی خەت خەتی شین و سپییەوە لەبەردەم ئامێرەکاندا کاریان ئـەکرد و هەریەکەی تۆپێکی ئاسنینی گەورە بەقاچیانەوە بەسترابوو، کە نەك تـەنیا لەمۆتەکەیـەکی ترسناك ئەچوو، بـەڵکو هەسـتم ئـەکرد لەسـەر هەسـارەیەکی تـرم دوور لـەزەوی و بگـرە لەقووڵایی دۆزەخدام.

بەڵام هەرزوو ئەم دیکۆرە گۆرا، کاتێك جێگە پاکوتەمیزەکانم بینـی لەنەخۆشـخانەکە و باخـچەیەکی گـەورەی پـڕ لـەگوڵ و گـوڵزار کەئـەتوانم بـەئازادیی پیاسـەی تیابکـەم. لەبەرخۆمەوە هەنـدێك ورتـەی دڵنـەوایی و شـادمانیم کـرد و هەوڵمـدا ئـەو مۆتەکەیـەم بیرچێتەوە کەتیایدا ئەژیم.

بۆ رۆژی دووەم، بەڕێوەبەری نەخۆشخانەکە بەوردی گیانمی پشکنی و بۆی دەرکەوت ئەومەلاریایەمە کەخۆم پێشبینیم ئەکرد و شوشەیەك دەرمانی (کینین)ی بۆ نووسیم. لەلای خۆشیەوە رەشید بەگ لەیادی نەچووبوو کە هەموو نیوەڕۆیەك براکەی، بەسەفەرتاسێك خواردنی جۆراو جۆر و بەلەزەتەوە بنێرێت. ئەو ئەیتوانی بێتە قاوشی نەخۆشخانەکە وبێ چاودێریی هیچ کەسێك قسەم لەگەڵ بکات.

ئەو ماوەیەی مانەوەم لەنەخۆشخانە زۆر خۆشبوو، چونکە بەچاکی چارەسەریان ئەکردم و لەشیان ئەشێلام، بەڵام غەمباری ئەوەبووم کەئامێدی نەیئەتوانی بێت بۆ نەخۆشخانەکە و هەر لەقاوشی گیراوەکاندابوو. جگە لەوەش نەخۆشخانەکە هەراسانییەکی تری هەبوو، چونکە پەیوەستبوو بەنەخۆشخانەیەکی ترەوە کەبەشی نەخۆشییە دەروونییەکانی بەسەر باخچەکەی نەخۆشخانەکەدا ئەیڕوانی و ژمارەیەکی زۆر نەخۆشی دەروونیی تیابوو لەهەموو جۆر و پلەیەك. بەهۆی گەرمای بەرزی بەغداوە لەهاویندا شەوانە پەنجەرەکانیان بەکراوەیی بەجێئەهێشت، لەبەرئەوە زۆرجار لەدەنگی هاوار و قیژە و بۆڕەبۆڕی نەخۆشەکان خەبەرمان ئەبووەوە.

سەرەڕای بوونی ئەو نەخۆشە دەروونیانە ئەمویست لەنەخۆشخانەکە بمێنمەوە، تاپێم ئەڵێن خۆت ئامادەبکە ئەتبەینەوە بۆ سوریا. بەڵام پێشئەوەی چارەسەری تەواو وەرگرم بەفەرمانێکی وەزیری ناوخۆ نێردرامەوە بۆ زیندان. لەوێش چوومەوە لای ئامێدی و کەشی گۆڕستان ئاسای زیندانەکە و زەوییەکەی کەبەقیری رەش سواخ درابوو و بەگەرمای خنکێنەری هاوین نەرم بووبوو.

دیەنی خەماویی و پیس و پۆخڵی دەرەوەی زیندانەکە، تەنیا شت نەبوو کە ئازاری ئەداین، رۆژانە تووشی زوڵم و زۆر ئەبووین، چەند ناخۆشبوو کەئازاری رەمزی رەشید ئاغامان ئەبینی بەکۆتوبەند و تۆپە ئاسنینەکەیەوە و مەترسی مردن کە بەردەوام بەدەوریا ئەخولایەوە.

عوسمانی خزمەتکاری کێڵگەکەشی لەگەڵبوو، کە ئەرکی قاوەچێتی لەقاوشەکەیدا ئەبینی تابتوانێت پێداویستییەکانی بۆ دابین بکات.

بەردەوام ئەمانپرسی، بۆچی پیرێکی وایان لەزیندان گلداوەتەوە کە تەمەنی زیاتر لە ٦٠ ساڵە و تەنیا گوناهی ئەوەیە کە کوڕی ئاغای لەماڵە دێهاتییەکەی ئاغا خۆیدا داڵدەداوە.

ئەم مامەڵە توند و نامرۆڤانەیە عوسمانی کردبووە نیشتمانپەروەرێکی هۆشیار و شۆڕگێڕ.

کە لێمان ئەپرسی:

- مام عوسمان تۆ کێیت؟

مشتی ئەنوقان و دەستی بۆ پشتەوە بەرزئەکردەوە ئەیوت:

-من کوردم.

لەماوەی چەند رۆژێکدا توانیمان ئەو جووتیارە پیرە نەخوێندەوارە فێری خوێندنەوە و نوسینی کوردی بکەین. دیارە چارەنووسی بەندیەکانی تریش کاریگەربوو. ئێستاش ئەو جووتیارە عەرەبەی باشووری عێراقم لەیادە کە ١٥ساڵ لەو زیندانەدابوو بێ دادگاییکردن. کوڕی پیاوێکی دەوڵەمەندبوو، بەناهەق تۆمەتبارکرابوو بەکوشتنی باوکی کە لەڕاستیدا مامی خۆی کوشتبووی. لەکاتی دەستگیرکردنیدا تەمەنی تەنیا ١٥ ساڵبوو.

لەئەنجامی ئەشکەنجەدانی درندانە مێشکی تێکچووبوو و لەبەرامبەر چەند فلسێکی عێراقیدا بەدەم سووڕ و چەقەنە لێدانەوە، تەنیا گۆرانی کەنەیزانی ئەیوت. گۆرانییەکە ئەمەبوو:

ئەی ڕێوی فێڵباز
بۆ مریشکەکانم ئەخۆیت؟
لێیگەڕێ گەورەبن
ئێمەش پێشکەشی ژەندرمەکانی ئەکەین
تا بەبرنجەوە نۆشی بکەن و

ئێمەش سەلامەت بین.

هەروەها ئەو برینپێچە شەلە کوردەشم دێتەوە یـاد کەپێـشتر چارەسـەری نەخۆشـەکانی ئەکرد لەناوچە دوورەدەستەکاندا، لەو شوێنانەی کەهێشتا پزیشك پێـی تێنـەنابوون، لـەوێ دەرزی لێئەدان و حەب و شرووبی ئەدانێ و برینەکانیانی ئەپێـچا،بەرامبەر چـەند فلـسێك. توانیبووی ئازاری هـەزاران جووتیـاری نەخۆشـی هـەژاری بێـدەرەتان کەمبکاتـەوە. بۆیـە پزیشکێکی حکومی شکاتی لێکردبوو، پاشان گرتبوویان و لەموسڵەوە گواستبوویانەوە بـۆ بەغـدا و وا ئێـستای مـاوەی ١٠ مانگـە لـەم زیندانـەدا کـەوتووە و ژن و منداڵەکانیـشی لەماڵەوە چاوەڕێن کە باوکیان پێخۆرێکیان بۆ بەرێتەوە.

وا سێ مانگە من و ئامێدی لەبەغدا لەپشت شیشەکانی زیندانەوەین و چرکە و خولەك و سـەعاتەکانمان بەقورسـی لێئـەڕوات. تـەنیا داوای ئێمـە ئـەوەبوو یابماندەنـە دادگـە یـا بمانگوێزنەوە بۆ بەندیخانـەی زیندانییـە سیاسـییەکان، لـەپێناوی ئەوەشـدا بەڕێوەبـەرێتیی بەندیخانەکە و وەزیـری نـاوخۆ و نـووری سـەعیدی سـەرەك وەزیرانمـان عـەرزە و حاڵبـاران کردبوو، بێگومان هاوڕێیانیشمان لەدەرەوە دەستەوەستان نەبوون.

زۆرکەسایەتی گەورە هەوڵیان بۆدابووین، دیـاربوو هەوڵەکانیـشیان بەرهـەمی هـەبوو، چونکە دوای ١٥ رۆژ بەڕێوەبەرێتیی بەندیخانەکە پێـی راگەیانـدین کـە ئەمانگوێزنـەوە بـۆ شوێنێکیتر.

لەماوەی چـەندین رۆژدا مـن و ئامێـدی بێئـۆقرە، وەك ئـەوەی بەسـەر پـشکۆوە بـین چـاوەڕوانبووین. سـەرەنجام رۆژێکیـان لـەو زیندانـە تاریکـە هاتینـەوە دەرەوە،پێمـانوابوو ئەمانبەن بۆ کامپی عەمارە لەباشووری خۆرهەڵاتی بەغدا، کەناویان بیستبوو و ئـەمانزانی ژمارەیەك تێکۆشەری ناسراوی کوردی تێدایە.

بەڵام تووشی بێئومێدییەکی گەورەبووین چونکە بردیانین بۆ یەکێك لـەتاك زیندانـەکانی بەڕێوەبەرێتیی گشتیی پۆلیسی بەغدا. هەوڵماندا دڵنـەوایی خۆمـان بکـەین بـەوەی ئێـرە

تەنیا وێستگەیەکی کورتە لەسەر رێی عەمارە، بەڵام چەندین هەفتە لەو ژوورە تاکە تەسك و بۆگەنانەدا ماینەوە کە تەنەکەیەکی ژەنگاویی تیادانرابوو بۆ میزکردن. بەپێچەوانەی بەندیخانەی ناوەندیشەوە لێرە لەپیاسە و سەردانکەر بێبەش بووین.

زۆربەی گیراوەکان کوردی ئێران بوون کەبەبێ پاسپۆرت و بەقاچاغ هاتبوونە عێراقەوە بۆ کارکردن. پۆلیسیش بێبەزەییانە ئەیگرتن و بۆ چەندین مانگ فرێینەدانە زیندانەوە، پاشان سنوورداشی ئێرانی ئەکردنەوە. ئەوانیش هەرئەوەندەی ئەگەشتنەوە ئەوێ، جارێکیتر هەوڵی هاتنەوەیان ئەدا بۆ عێراق بۆ پەیداکردنی بژێوی. چەند ئازارمان ئەچەشت کاتێك ئەمانبینی پاسەوانەکان لێیان ئەدان جنێویان پێئەدان و پێیان ئەوتن:

-(کوردی هیچوپوچ، چی ئەکەن لەوڵاتی ئێمە؟ بۆچی شا ئیشوکارتان بۆ دابین ناکات؟دێن ونانی ئێمە ئەدزن. لەماڵی خۆتان بمێننەوە و مەیەن بۆ بێزارکردنی ئێمە.)

ئەو کوردە بەشەمینەتانەش وەڵامیان ئەدانەوە:

-(هیچ چارەیەکی ترمان نییە،چونکە شا دەستی گرتووە بەسەر زەوییەکانماندا ولەناوچەکانی ئێمەش هیچ کارگە و کارخانەیەك نییە،بۆیە ناچارین هەرکارێك بکەین کەنانی خۆمان و منداڵەکانمانی لێوەبەدەست بهێنین، ئێمە لەعێراق سەختترینی ئەوکارانە ئەکەین کەعێراقییەکان بێزی لێئەکەنەوە، بۆیە وازمان لێبێنن لێرەبین تا سوود بەوڵاتەکەتان بگەیەنین.)

ئەم مشتومڕە پۆلیس و پاساوڵەکانی ئەهێنایە پێکەنین، پاشان بەحەیزەران تێیان ئەکەوتن، ئینجا بەپۆستاڵی سەربازیی کەهەمووینەکەی بزمار رێژکرابوو بەرشەق و لەقەیان ئەدان.

لەژێر کاریگەریی ئازارەکانی رۆژانەماندا کەهەرکامیان لەویتر ناخۆشتربوو،داوامان لەلێپرسراوان کرد لەم شوێنە دەرمانکەن و هەڕەشەی مانگرتن لەخواردنمان کرد.

لەبەرئەوەی داواکەمان هیچ دەنگدانەوەیەکی نەبوو بڕیارماندا مانبگرین لەخواردن.

لــەماوەی چــەندرۆژێکدا کارەکــەمان بــووە هــۆی نیگــەرانی هاوڕێکانمان،هــەروەها لێپرسراوانیش. رەشید بەگ مۆڵەتی سەردانمانی وەرگرت و لەکاتی دیدارەکەدا بــەدەنگێکی باوکانەوە پێی وتین:

-(پێویست ناکات ژیانی خۆتان بخەنە مەترسییەوە، چونکە وەزیرە کوردەکــان لەهــەوڵی ئازادکردنتانــدان. گــەر مەســەلەکە پەیوەنــدی تــەنیا بەحکومــەتی عێراقــەوە بوایــە چارەسەرئەکرا، بەڵام ئەوە ئینگلیزەکانن کەخەریکی ئامادەکارین بۆ هەڵمەتێکی نــوێ دژی کورد،ئەوانەش مانگرتنەکەتان هیچ کارێکیــان تێناکــات، بۆیــە بێهێزیــی و ئەونەخۆشــییە ترسناکانەی تووشتان ئەبێت هیچ سوودێکی نییە.)

-(بەڵێ.....بەڵام گەر دەست هەڵگرین،مەترسی ئەوە هەیە کــە بــۆ هەتاهەتایــە لێــرە بەجێمانبهێڵن و وردە وردە بمرین. یــان ئــەبێت وەك بــەڵێنیان پێــدابووین بمانگوێزنــەوە بــۆ شوێنێکیتریان یابەردەوام ئەبین لەمانگرتن تا مردن.)

رۆژی دەیەمی مانگرتنەکەمان بەڕێوەبــەر داوایکــردین و بەبیجامــە و ریــشی درێــژ و دەموچاوی ساکار و رومەتی چرچەوە بردیانین بۆ نوســینگەکەی بەڕێوەبــەر کەتەمــەنی ٥٠ ساڵێك ئەبوو،ئەسمەرێکی لێونەستووربوو،هاواری کرد بەسەرماندا:

-(بۆ داوتانەتە کەللەرەقی و سوورن لەسەرمانگرتن؟!)

ئامێدی ئازایانە وەڵامی دایەوە:

-(چونکە ئەمانەوێت لێــرە دەرمانکــەن و بەشــێوەیەکی قــانونیی مامەڵــەمان لەگــەڵ بکەن.)

بەڕێوەبەر راپەڕی و بەدەنگێکی بەرز قیژاندی:

-(لێرە بچنە دەرەوە؟! ئەی ئەتانــەوێت لــەکوێ داتــانێم؟! لەوانەیــە بەتــەمای ئوتێــل سەمیرامیس بن! ئەبێت هەر لەو زیندانەدابن و هەر لەوێشدا ئەمن چونکە ئێوە سیخوڕن.)

لێم پرسی:

-(باسی کام سیخوڕی ئەکەیت؟)

-(ئێوە سیخوڕی بارزانین.)

ئامێدی وەڵامی دایەوە:

-(ئێمە کوردین و وەك هەموو کوردێك گەلەکەی خۆمان خۆشئەوێت وحەز بەسەرکەوتنی ئەکەین. ئێمە بەسادەیی تەنیا هاوسۆزی بارزانین. لەبەرئەوە هیچ هۆکارێك نابینم کە وا لەحکومەت بکات لەم کولانەیەدا دامانرزێنێت. سەرەڕای ئەوەش بارزانی تەنیا داوای هەندێك مافی کەلتووریی و ئیداریی کردووە و حکومەتی عیراقیش بەڵێنیداوە بەبایەخەوە لەداواکارییەکانی بکۆڵێتەوە.)

لەبەردەم هەڵوێستی بەهێزماندا بەڕێوەبەر مێشکی لەکەللەدا نەمابوو. لەزەنگەکەیدا بۆئەوەی پاسەوانەکان بمانبەنەوە بۆ زیندانەکەمان و فرمانی بەکۆمیسەرەکە کرد:

-(ئەم دوو قانون شکێنە بەرەوە ژوورەکانیان و لێگەڕێ تا لەبرساندا ئەمرن.)

وەك ئەوەی هەموو پۆلیسەکان ئەمەیان پێخۆشبێت، هەریەپاڵ تازیندانەکەیان بردین، لەوێش کۆمیسارەکە قسەیەك خواردنی لەژوورەکەماندا دانا وەك ئەوەی بیەوێت مانگرتنەکەمان بشکێنین و بەهەڕەشەوە پێی وتین:

-(تا لەسەر مانگرتن بەردەوامبن زیاتر تووڕەیی بەسەرخۆتاندا ئەهێنن. گوێتان لەقسەکانی بەڕێوەبەربوو، ئەگینا ئەتانخەینە ژووری تاکەکسییەوە لەژێرزەمیندا کە ئیتر رووناکی نەبینن. بۆیە هەر ئێستا دەست لەم کارە منداڵانەیە هەڵبگرن.)

ترساندن وهەڕەشەکانیان کاری تێنەکردین و سووربووین لەسەر بڕیارەکەمان.

بۆ رۆژی دوایی موعجیزەیەك روویدا، کە کۆمیسار بەشادمانییەوە پێشوازی لێکردین و وتی:

- (هەواڵێکی خۆشم پێیە بۆتان، خۆتان ئامادەکەن بۆ ئەوەی لێرە بڕۆنە دەرەوە.)

-(بۆ، ئازادمان ئەکەن؟!)

-(نا یەکجار واش نا، بەڵام ئەمجارە راستەوخۆ ئەچن بۆ عەمارە. هەرچەندە ماوەکە دوورە بەڵام کاتی تەواوتان لەبەردەستدا ئەبێت. خۆ ئێستا رازین؟)

-(ئەگەر راستبێت بەڵێ، کەی ئەڕۆین؟)

-(دوای ٥ رۆژی تر. گەر ئێستا دەستبکەن بەخواردن تەندروستیتان باش ئەبێت و بەرگەی سەختیی سەفەرەکە ئەگرن.)

بەپێشنیازەکەی کۆمیسار قایل بووین و شیری گامێشیان بۆ هێناین.

کاتی رۆشتنمان هات، بەشادییەوە زیندانەکەمان بەجێهێشت. لەراڕەوەکەدا یاساوڵەکان دەستی هەردووکمانیان بەیەکەوە بەست بەکەلەپچەیەك کە زنجیرێکی پێوەبووە و بەدەست پۆلیسەکەوەبوو. ٦ پۆلیس لەگەڵمان هاتن و بەپێ شەقامەکانی شاری بەغدادا کەوتینەڕێ. دوای چەند حەوانەوەیەکی کورت لەمەخفەرەکانی پۆلیس، گەشتینە وێستگەی بەسرە. تەنیا سیان لەپۆلیسەکان لەگەڵمان سواربوون تابەسرە و لەوێشەوە لەژێر پاسەوانییەکی توندا بەمیکرۆپاسێکی پۆلیس بردیانین بۆ عەمارە.

ئەم سەفەرە بواری بۆ رەخساندین تا بەناوچەی بیابانی عێراق ئاشنابین.

هەر لەگەڵ کەوتنەڕێی شەمەندەفەرەکە لەبەغداوە پاسەوانەکان کۆتەکانیان لەدەست کردینەوە و بەشی دووەمی رێگەکەشمان بەمێرگەکاندا تێپەڕنەبوو،و ناخۆش نەبوو.

ئۆتۆمبیلەکەمان چەندین جار لای مێرگە بچووکەکان ئەوەستا و رێیانداین چەندین جۆری جیاوازی خورما بخۆین.

درەنگانێکی شەو گەیشتینە کەمپی عەمارە. پاسەوانەکە ئەفسەرێکی لەخەوهەستان کەناو و پلەی خوێندنمانی تۆمارکرد و داینییە دەست پۆلیسێك.

قاوشەکە هۆڵێکی گەورەی فراوانبوو، کە پەنجەرەکانی شکابوون و جێ خەوەکانیشی بەتاڵبوون. من و ئامێدیش لەیەکێك لەگۆشەکاندا جێگەیەکمان گرت بۆ خۆپاراستن لەسەرمای تەزێنەری شەوانەی مانگی کانون.

ئەوشەوەی لەبەغداد خەومان پێوەدیبوو و لەپێناویدا مانمان لەخواردن گرتبوو، بەهەزار حاڵ ئەو شەوە چاومان چووەخەو،لەسەر جێگەیەك كە لەكا دروستكرابوو و پێخەفەكانی پیس و پۆخڵ و رزیبوون.

بۆ بەیانییەكەی بەنیشتەجێ نوێیەكەمان ئاشنابووین: كامپی عەممارە.

كامپەكە بریتیبوو لەكێڵگەیەكی فراوان لەناوەڕاستی بیابان و خۆرهەڵاتی شاری عەممارە. چادری قەبارە جیاوازی تیاهەڵدرابوو و هەرچواردەوری بەچەند ریزێك تەلی دڕكاوی تەنرابوو و لەهەر گۆشەیەكیشدا بنكەیەكی پۆلیسی بۆ پاسەوانی تیابوو.

هەندێك لەچادرەكان ٥٠ جێگەیان تیابوو، هەندێكیان تەنیا دوو یان سێ جێگەیان تیابوو، هەندێكیشیان یەك كەسیی بوو. لەناوەڕاستی كێڵگەكەدا گەرماوێكی توركی هەبوو،كە یەكێك لەبەندییەكان سەرپەرشتی ئەكرد و هەمووكەسێك ئەیتوانی بەسەرە خۆی لێبشوا،دوای بڕینی بلیتی چوونەژوورەوە.

بەندییەكان دابەشكرابوون بەسەر سێ جۆردا، بەپێی پایەی كۆمەڵایەتیی و ئاستی خوێندن. جۆری یەكەم، تەنیا ئەو پاشا و كۆنە ژەنەراڵانەی تیابوو كە ساڵی ١٩٤١ بەسەركردایەتی رەشید عالی گەیلانی بەشداریی شەڕی دژی ئینگلیزیان كردبوو. جۆرەكەی تریان، كەژمارەیان كەمبوو. بریتیبوون لەدەرچووانی زانكۆ و خوێندكار و ئەفسەر و پزیشك و مامۆستا و خەڵكانی لەو بابەتە.

بەڵام جۆری سێیەمیان، ئەو گیراوانەبوون كە بۆرژوازیی بچووك و رەشە خەڵكەكەبوون (جووتیار، كرێكار، كاسبكار و فەرمانبەر.)

ماوەیەكی كەم پێش گەیشتنی ئێمە، بەندیخانەكە پڕبوو لەوكەسانەی بەگومانی زایۆنیزم و سۆزداریی بۆ ئەڵمانیای هیتلەریی دەستگیركرابوون. ئەوكاتەی خەریكبوو ئەڵمانیا ئەدۆڕا،ئینگلیز وردە وردە كەوتنە ئازادكردنی دوژمنەكانی پێشوویان و جێگەكانیانی بەكوردانی نیشتمانپەروەر و نیشتمانپەروەرانی دیموكراتیی پڕكردەوە.

لەناو ئەوکوردانەی لەکامپی عەممارەبوون،کاپتن(میر حاج)مـان بینـی، کەسـاڵی ۱۹٤۳ لەلایەن حکومەتی بەغداوە وەك ئەفسەری پەیوەندیی لای بـارزانی دامـەزرێنرابوو. لەگـەڵ (عەونی یوسف)ی دادوەری پێشوو کەئامادەنەبووبوو حوکمی ئەو کـوردە ئێرانیانـە بـدات، کەبێ پاسپۆرت هاتبوونە عێراقەوە ، و سەید عەبدولغـەنی خـەڵکی زاخـۆ کـە تاوانەکـەی ئەوەبوو میوانـداری عـەونی یوسـفی کـردووە ئەوکاتـەی دادوەر بـووە لـەزاخۆ. هـەروەها عەبدوڵڵا شەرەفانی سەرۆکی خێڵی شـەرەفان لـەباکووری عێـراق کەیـەکێك بـوو لەوانـەی سەرکێشی زۆری ئەکرد و کێشەی ئەنایەوە.

لەناو بەندییە عەرەبەکانیشدا نەتەوەپەرستانی بەناوبانگ هەبوون، وەك (سادق شنـشل) کەیەکێکبوو لەبیریارانی سۆسیالیزمی نەتەوەی عەرەب و خەونی بەدەوڵەتێکی یـەکگرتووی عەرەبییەوە ئەبینی لەکەنـداوەوە بـۆ ئۆقیـانووس.لەئـەنجامی هەسـتی دژ بەئینگلیزیـشی هیواداربوو ئەڵمانیای نازی سەرکەوێت. سەرەڕای رۆشنبیرییە فراوانەکەی و مانـەوەی زۆری لەئەوروپا، سادق شەنشەل شۆڤێنییەکی تەسـکبین بـوو و هـیچ تێگەیـشتنێکی بەرامبـەر بەمەسەلەی کورد نەبوو و بەکەسانێکی ئاژاوەگێڕی گێلی ئەزانین کەلەبەرژەوەندیی ئینگلیـز کارئەکەن. زۆرجار ئەوەی دووپات ئەکردەوە:

-هەرکاتێ ئینگلیزەکان رۆیشتن،ئەوا کوردەکان بەئاسانی ئەکرێن بەعەرەب!

کەمپی عـەممارە لـەژێر سەرپەرشـتی ئینگلیزدابـوو و تـەرخانکرابوو و بـۆ گیراوانـی سیاسیی. کەمپێکی زۆر تایبەتبوو و هیچ شتێکی لەزیندانەکانی ئەڵمانیای نازیی یـا ئـەو زیندانانە نەئەچوو کەرژێمە دیکتاتۆرییەکان دوای سەربەخۆیی لەوڵاتانی عەرەبدا دروسـتیان کردبوو. ئێمە لەوێدا ئازادبووین لەوەی یەکتربببینین و بخوێنینەوە و بنوسین و گفتوگۆ بکـەین و داوای رۆژنامە لەدەرەوە بکەین، بەندییە خێزاندارەکانیش مافی ئـەوەیان هـەبوو مـانگی جارێك هاوسەرەکانیان ببینن لەشـوێنێکی تایبـەت دوور لەچـادرەکان، بـەڵام تـەنیا چـەند کەسێکی کەم لەبەندییەکان ئەم مافەیان بەکارئەهێنا.

بەندییەکانی عەممارە هەموو هەفتەیەك موچەیان وەرئەگرت، موچەکەش پەیوەستبوو بەجۆرەکانیان: جۆری یەکەم رۆژی دینارێك و جۆری دووەم رۆژی نیودینار و جۆری سێیەم چارەکە دینارێکیان وەردەگرت. جگە لەوەش هەر بەندییەك رۆژانە مافی پاکەتێك جگەرەی هەبوو.

ماوەی دووهەفتە من و ئامێدی رۆژانە و چارەکە دینارێکمان وەرئەگرت،ئەگەرچی ئێمە لەبەغدا بەجۆری دووەم دانرابووین. میرحاج کردی بەهەرا و داوای کرد دووبارە بروسکەیەك بنێردرێت بۆ تۆفیق وەهبی وەزیری کورد.

خۆم چووم بۆلای بەڕێوەبەری کامپەکە و بروسکەکەم دایەدەستی و گەڕامەوە بۆ ژوورەکەی میرحاج. دوای ۱۰ خولەك لەدەرگادرا و پۆلیسێکی عێراقی هاتەژوورەوە و سلاوێکی سەربازیی بۆ میرحاج کرد و پۆستاڵەکەی دا بەزەویدا و وتی:(گەورەم هەریەکسەر لەبەغداوە فەرمان هات و ناویان بەپلەی دووەمدا تۆمارئەکەم.)

پۆلیسەکە چووە دەرەوە و من و میرحاج خۆمان پێنەگیرا و دەستمان کرد بەپێکەنین، چونکە بەبێ ئەوەی بروسکەکەمان بگاتە بەغدا، کاریکرد.

فەرماندەی کامپەکە ئیتر ناتوانێت لەوەزیاتر دزیمان لێبکات و ئێمەش بەکوللەمەرگیی و سکهەلگوشین بژین. موچەی پلەی دووەم، بەشی ئەوەی ئەکرد بەشێوەیەکی سروشتیی پێداویستییەکانمان دابین بکەین.

بەڕەزامەندیی بەڕێوەبەرێتیی کامپەکە،چەند منداڵێك پێویستییەکانیان بۆ دابین ئەکردین بەرامبەر بە۲۵ فلس. هەموو بەیانییەك ئەهاتن بۆ کامپەکە و داوای پارە و ئەرکەکانیان ئەکرد. لیستی کڕینیان وەرئەگرت و ئەچوون بۆ عەممارە بۆهێنانی و کەئەگەڕانەوە، لەچادرەکەی (سەید عەبدولغەنی یوسف) سەرگەرمی چێشتلێنان ئەبووین. عەونی چێشتی لێئەناو منیش شۆردنی قاپەکانم پێسپێردابوو، چونکە ئەوکاتە تەنیا ئامادەکردنی قاوەی تورکیم ئەزانی. رۆژەکان بەخێرایی تێپەڕین و ئێمەش سەرگەرمی

وەرزش و جل شتن و چێشتلێنان و قاپشتن و خوێندنەوە و سەردانی یەکتر لـەناو کامپەکـەدا و گفتوگۆبووین بۆ بەرێکردنی ژیانمان.

ئەو ماوەیەی لەوێ گیرابووین، تەنیا دوو پێشهات روویانـدا کەبەرپرسـانی کامپەکـەی وروژاند: یەکـەمیان، پەیوەسـتبوو بەشـیعەکان کەحـەزیان ئـەکرد لەعاشـوورادا(١٠ رۆژی یەکەمی مانگی موحەرەم) خۆیان بریندارکەن، راسـتە ئـەم رێورەسمـە لەسـاڵانی سـییەوە لەلایـەن کاربەدەسـتانی عێراقـەوە بەتونـدیی سـەرکوتکرابوو(کەئەیانویـست ئـەم بۆنەیـە بقۆزنەوە بۆ وروژاندنی هەستی رق و کینە لەنێوان شیعە و سـوننەدا)، بـەڵام شـیعەکان زۆر بەنهێنیی خۆیان بۆ ئەو بۆنەیە ئامادەئەکرد.

بەمەبەستی رێگرتن لەهەر رووداوێکی هەراسانکەر لەناوچەکەدا، شەوی پێش عاشـوورا جێگری بەرێوەبەری کەمپەکە لەگەڵ ١٠ پۆلیسدا بەجلی مەیدانەوە چوونە قاوشـی گـیراوە شیعەکان و دەستیانگرت بەسەرهەموو شتێکی بریندارکەر و کونکەردا، سـەرەڕای ئـەوەش رۆژی دوایی هەندێك لەشیعەکان خۆیان بریندارکرد و چەندین کەسـیان بـران بـۆ تیمارگـەی کەمپەکە.

روداوی دووەمـی نـاو کەمپەکـە لەئـەنجامی راکردنـی یـەکێك لـەو تێکۆشـەرە فەلەستینییانە بوو کـەدژی دامەزرانـدنی دەوڵـەتێکی جولەکـە بـوو لەفەلەسـتین. کاتێـك پۆلیس ئەیانگواستەوە بۆ بەغدا و بۆ دادگایی کـردن، ئـەو دڵنیـابوو لـەوەی ئینگلیزەکـان حوکمی لەسێدارەدانی بۆ دەرئەکەن وەك پێشتر لەگەڵ زۆر لەهاورێکانی خەباتی کردبوویـان، بۆیـە بڕیارئـەدات لەناوچـەیەکی دەشـتایی تەختـدا کـە شـارەزای نـەبوو رابکـات. خۆپیـشاندانێکی گـەورە لەبـەردەم نوسـینگەی بەرێوەبـەری کەمپەکـە روویـدا وجنێویـان بەئینگلتەرا و زایونیزم ئەدا، بۆیە بەرێوەبەرەکە پۆلیسەکانی لێهاندان و بڵاوەیان پێکـردن و ناچاریان کردن بچنەوە قاوشەکانیان.

لەماوەی مانەوەم لەکەمپی عەممارە، بەدرێژایی ڕۆژانی مانگی کانوون لەبەرەبەیانەوە تا دنیا تاریك ئەبوو، دەرەبەگایەتی ڕاستەقینەم ئەبینی لەباشووری عێراق، ڕۆژانە ئەو حوشترانەم ئەبینی کە دانەوێڵەیان بارکردبوو بۆ شاری عەممارە، ڕێگەی کاروانەکە تەنیا چەندمەترێك دووربوو، و ئەمانتوانی پێی پەتی وبەرگی شڕی حوشترەوانەکان ببینین. پێیان وتین، کەهەموو ئەو کاروانانە هی شێخێکی عەرەبە کەنزیکەی ٣٠ گوند و هەزاران حوشتری هەیەو جووتیارە بێنەواکان وەك کۆیلەی ڕاستەقینە کاری بۆ ئەکەن.

تەنیا کورد و عەرەب لەکەمپی عەممارەدا نەبوون، بەڵکو ژمارەیەك ئەندازیاری هەنگاریی و بولگاریشی لێبوو. ئەمانە لەئێران کاریان ئەکرد، ساڵی ١٩٤١ هەوڵیاندابوو لەڕێی تورکیاوە بگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکەی خۆیان بۆ ئەوەی بەدیل نەگیرێن لەلایەن ئینگلیزەکانەوە کەلەباشوورەوە ئەهاتن و سۆڤێت کەلەباکوورەوە ئەهات، بەڵام سەرەنجام لەلایەن ئینگلیزەکانەوە بەدیل گیرابوون و لەعەممارە خرابوونە زیندانەوە.

یەکێك لەئەندازیارە هەنگارییەکان،لەبەدبەختیی کەوتبووە بەردەستی کۆمەڵێك سەربازی ڕاکردووی ئێرانیی و کاتێك ددانە ئاڵتوونەکانیان بینیبوو،یەکەیەکە هەموو ددانەکانیان هەڵکێشابوو لەپێناوی ئاڵتوونەکەدا.

من ئەندازیارە هەنگارییەکەم ئەبینی و پێکەنینمان بەو سەرکێشییە خراپەی ئەهات، چونکە زۆربەی زۆری ددانەکانیان دەرهێناوە، بەڵام سەرەڕای ئەو یادەوەرییە ناخۆشانەش هێشتا زیرەکیی خۆی بۆ کارکرن پاراستبوو توانیبووی قامیش پەیدابکات و کاتی خۆی بەچنینی سەبەتە و جانتا و کورسی بەسەرئەبرد و لەناو کامپەکە و لەدەرەوەی کەمپەکەش بەیارمەتی منداڵەکان ئەیفرۆشتن.

بەدوو بەندیی خۆشەویست ئاشنابووم، کە ڕیش و سمێڵەکەیان ناچاری ئەکردی ڕێزیان لێگریت، یەکەمیان عێراقییەکی چاوشینی بەنەژاد ئەلبانی و ئەویتریان ئاشوورییەکی عێراقیی بوو کەگەنم ڕەنگ و ڕیش وسمێڵ و قژی وەك خەڵووز ڕەشبوو.

دەوروبەری کۆتایی مانگی شوبات میرحاج گوێزرایەوە بۆ زینـدانی هێـزە ئاسمانییـەکان لەبەغـداد، بـەڵام کـارێکی وایکـرد کـە ژوورەکـەی بـدرێت بـەمن. دوای چـەند ڕۆژێـك لەنامەیەکدا بۆی نووسیبووم، زۆر هەوڵی تردراوە بەمەبەستی ئازادکردنم و شـەش ئەندامـە کوردەکەی پەرلەمانی سوریا نامەیەکیان ڕاستەخۆ ئاڕاستەی نوری سەعیدکردووە و داوایـان کردووە سنوورێك بۆ دیلێتی من دانێن.

لەمانگی ئایاردا فەرمانی گواستنەوەم بۆ بەغداد دەرچوو.

شەوێکی ترم لەبەسرە بەسەربرد لەیەکێك لەبنکـەکانی پـۆلیس، لەسـەر مێزێـك و بـێ هیچ پێخەفێك تابەیانی بێنەوەی خەو لەچاوم بکەوێت لەسەرمانا هەڵلەرزیم. ئێـوارەی ڕۆژی دواتر، ١٠ زیندانی مافە سڤیلییەکان لەیـەکێك لـەژوورەکانی زیندانەکـە هێنرانـەدەرەوە و پۆلیس کۆتی کردەدەستیان، کاتێك ویـستیان دەستی منیش لەگەڵ دەسـتی یـەکێك لەوانـە ببەستن، بەتوندی ڕەتمکردەوە و ڕازی نەبووم لەگـەڵ ئەوانـە مەخفەرەکـە بـەجێبهێڵم، بۆیـە پۆلیس و ئەفسەرەکە بانگی کاپتنیان کرد،ئەویش قیژاندی بەسەرما و وتی:

-(یان ئەبێت قایلبیت وەکو ئەوانی تر کۆت بکرێتە دەستت یا ئەمشەویش لەسەر ئـەو مێزە ئەتخەوێنم بەبێ پێخەف.)

لەبەردەم ئەو هەڕەشەیەدا دەستی چەپم دانێ و ئەڵقەیەکی کەلەبچەکەیان کـردە دەسـتم و ئەڵقەکـەی تریـشی لەدەسـتی پیـاوێکی بێنـەوای بـەرگ شـڕی پێپەتیـدابوو. پاشـان پاسەوانەکان بەپەلە خستیانینەڕێ، تالەکاتی گونجاودا بگەینە شەمەندەفەرەکە.

ململانێیەکەی من کـاتێکی زۆری کوشـتین و کەگەیـشتینە شـەمەندەفەرەکە شـوێنی چـۆڵمان دەسـتنەکەوت ولەڕاڕەوەکـەدا لەسـەرئەرزەکە دانیـشتین، عـەریفی لێپرسـراوی سەفەرەکەمان کەلەبچەکەی لەدەستمدا توندکرد و سەرکەوتەسەر ڕەفـەی کەلوپەلـەکان بـۆ خەوتن. منیش لەسەر حەسیرێکی بـچکۆلەی قـامیش دانیـشتم کـە لـەکابرای هـەنگاریم کڕیبوو.

شەمەندفەرەکە پڕبوو لـەحاجی شـیعەی ئێرانـی کەبـەنیازی سـەردانی کەربـەلا بـوون کەشوێنێکی پیرۆزە لای شیعەکان.

هەموویان لەوجووتیارانەبوون کەبۆنی هـەژاریی و چـڵکنییان لێـەهات. لـەماوەی ١٥ کیلۆمەتری یەکەمدا هەستمکرد کە مێروو تێیداوم، لەشـم کەوتـەخووران، دەسـتی راسـتم بەرزکردەوە بۆلای ملم و ئەو زیندەوەرە بچووکانەم گرت، ئەسـپێی رەشـبوو کـە هێنـدەیان خوێنمژیبوو گەورە بووبوون، لەبەینی پەنجەکانمدا فلیقاندمنەوە. لەپـشت و سـنگمدا بۆیـان ئەگەڕام، وەك ئەوەی لەپێشبڕکێیەکی گەرمدابن هەموو گیانمیان تەنیبوو.

یەکێك لەپۆلیـسەکان ئەهامەتییەکـەمی بینـی و تکـای لەعەریفەکـە کـرد کەدەسـتم بکاتەوە و شوێنێکی دانیشتنم بۆ بدۆزێتەوە و پێی وت:

-(ئەو بەرێزە شایەنی ئەوەنییە لەودۆخەدابێت.)

عەریفەکە وەڵامی دایەوە:

(نا..شایەنێتی، ئەم ئێوارەیـە هەراسـانیکردین و بـەهۆی ئـەوەوە لەشـەمەندەفەرەکەدا شوێنێکی باشمان دەستنەکەوت. کەواتە بابیخوات.)

وشەی بەرێز (سید) لەعەرەبیدا تـەنیا مانـای بـەرێز ئەگەیـەنێت، بـەڵام لای گـەلانی موسڵمانی ناعەرەب بەتایبەت لەناو شیعەدا، سەید واتـە ئەوانـەی لەنـەوەی پێغەمبـەرن. بۆیە ئەو وشەیە مقۆمقۆی خستەناو شیعەکانەوە، فارسەکان لەشوێنەکانی خۆیـان هەسـتان و بـەرەو لای مـن هـاتن و کەوتنــە دەستماچـکردنم، وبەپۆلیـسەکانیان وت، کـەئامادەن شوێنەکانی خۆیانم بدەنێ.

عەریفەکە هەستایە سەرپێ و تێی خوڕین کە هەقی منیان نـەبێت و لەشـوێنی خۆیـان دانیشن ئەگینا لەشـەمەندەفەرەکە دایانئەبـەزێنێت. زۆربـەی ئـەوجووتیارە هەژارانـە بـێ مۆڵەت هاتبوونە ناو عێراقەوە، وەك سەگی مەشقدیدە ملیان کەچ کـرد و دوایئـەوە کـەس بایەخی بەو (سید)ە نەدا کەمن بووم!

دەوروبەری بەیانی شەمەندەفەرەکە گەیشتە کەربەلا، کاتێك گیراوەکان و پۆلیسەکان و حاجییەکان دابەزین، سەیرمکرد مەچەکم ئاوساوە و ئازارم ئەدا و سەرتاپای لەشم وەك ئەوەی دووپشك پێوەی دابێ نەکزێتەوە. لەم گەشتەدا یادەوەرییەکی خراپم لەبارەی ئەسپێوە بۆ مایەوە. خۆشبەختانە وردە وردە دۆخەکە گۆڕا، ئەفەرەکان لەشەمەندەفەرەکە دابەزین و تەنیا دووپۆلیسی پیاوچاك لەگەڵ مـن مانەوە و کۆتەکانیان کردمەوە و بردیانم بۆ فارگۆنێکی پلەدوو،منیش بەنیودینار سوپاسم کردن و داوامليکردن پێش چوونمان بۆ بەندیخانەی بەغدا بمبەن بۆ سەرتاشخانە. ئەوانیش وتیان:

-(بێگومان ئەتبەین، ئێمە لەخزمەتداین.)

کە گەیشتینە وێستگەی بەغدا،عەرەبانەیەکی دوونەسپیمان بەکرێ گرت و بردینی بۆلای ئەوسەرتاشەی کەپێشتر میرحاج ناونیشانەکەی دابوومێ. خۆشبەختانە پۆلیسەکان رێیاندام سەرتاشەکە ببینم و ئازادانە قسەی لەگەڵدا بکەم. پاش ماوەیەکی کەم رەشید بەگ هات بۆلام بۆ بەڕێوەبەرێتیی زیندانەکە. پێم وت:

-(تکات لێدەکەم چیت لەدەست دێت بیکە، بۆ ئەوەی منیش وەك میرحاج لەزیندانی هێزە ئاسمانییەکاندا دابنرێم.) رەشید بەگ بەڵێنی پێدام و وتی:

-(بەڵێ، من بەڕێوەبەری پۆلیسی بێگانەکان باش ئەناسم، چونکە بەنەژاد کوردە،ئەچم بۆلای و قسەی لەگەڵ ئەکەم.) دوای ئەو قسانە رۆیشت و پاش تەنیا ١٠ خولەك دەم بەخەندە گەڕایەوە. لەئەرکەکەیدا سەرکەوتووبوو، بۆیە هەر یەکسەر بەئۆتۆمبیلێك بردمی بۆ باخچەیەکی گەورە کە لەژێر پارێزگاریی هێزە ئاسمانییەکاندا بوو.

میرحاج هات بەپێشوازیمەوە و بردمی بۆ ژوورەکەی خۆی کە چێشتخانەیەکی بچووك و گەرماوێکی خۆشی تێدابوو. پێی وتم:

-(ئەم جلەپاکانە لەبەربکە، بەم زووانە عەلی حەمدی دێت بۆ سەردانم و ئەتوانی جلەکانی خۆت بدەیتەدەست ئەو.) جەستەم کەئەسپێ کۆڵەواری کردبوو،هەر ئەوەی پێویست بوو.

که لەگەرماوەکە هاتمەدەرەوە عەلی حەمدی دانیشتبوو ولەگەڵ میرحاج قسەی ئەکرد، پێی وتم:

-(لەماوەی ١٠ رۆژدا ئەتبەین بۆ مەخفەرێکی سەرسنووری سوریا لەتەلکۆچەر و ئەدرێیتەدەست ئاسایشی سوریا.) هەواڵێکی خۆشبوو،سەرەنجام ئازادئەبم و سەرلەنوێ کاکم و هاورێکانم ئەبینمەوە...بەلام شادییەکەم زۆری نەخایاند بەهۆی هەواڵەکانی پەیوەست بەکوردی عێراق و رێکخراوەکانیان و گۆڕانی تەواوی سیاسەتی بریتانیا بەرامبەریان، چونکە رێکخراوی هیوا بەتەواویی لەکارکەوتبوو، و حکومەتیش هەموو هەوڵی خۆی بەگەرخستبوو بەمەبەستی دروستکردنی ئاراستەی دژبەیەك بۆ تێکدانی ریزەکان، سەرەڕای هەموو ئەمانەش ژەنەراڵ (رینتۆن)ی بریتانی، فەرماندەی پێشووی تیپی (سەردتاسی) کە لەئەرکێکی جەنگیی بوو لەبیابانی لیبیا لەکاتی جەنگی جیهانی دووەمدا،ئێستا سەرگەرمی مەشقپێدانی سوپای عێراق بوو لەسەر جەنگی شاخ و هێزی ئاسمانیی خاوەنشکۆ شاژنیش خرابۆوە ژێر فەرمانەدەیی ئەوەوە. ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکان لەدەستپێکردندابوون.

پرسیم:

-(هەڵوێستی بارزانی چییە؟ ئایا ویست و توانای بەرگریی هەیە لەبەرامبەر هاوپەیمانیی هێزەکانی عێراق و بریتانیادا؟)

-(ئەو ئەزانێت کەئێستا بۆتە تەنیا هیوای گەلی کورد و ٣٠٠٠ لەلایەنگرانی لەگەڵە و ئامادەی خەباتن.)

میرحاج هەڵدایە:

-(زۆر لەئەفسەرە گەورەکانی کورد چوونەتە پاڵ بارزانی، منیش هەرهێندەی ئازادکرام ئەگەرێمەوە بۆ باکوور و خۆم ئەخەمە خزمەتییەوە. ئەو ئەوسەرکردەییە کە گەلی کورد چەندین سەدەیە چاوەڕێی ئەکات. ئەگەر لەعێراقیش سەرنەکەوت ئەوا کوردەکانی مهاباد

کەهەموو کوردستانی ئێرانیان ئازادکردووە چاوەڕێن و وا خەریکن کۆمارێکی دیموکرات لەمهاباد رابگەیەنن.)

ئێوارە روشدی بەگ هات و خوانێکی لەگەڵ خۆی هێنابوو کەپڕبوو لەقاپە خۆراکی جۆراوجۆر. عەلی حەمەدیش ئەو زەرفەی برد کەجلە چڵکنەکانی منی تیابوو وتوند داخستبوو. کەرۆژی دواتر هاتەوە پێی وتم:

-(هەرچەندە زەرفەکەشم لەخۆم دوورخستەوە، بەڵام گیانم پڕبووبوو لەئەسپێ.)

رۆژی سێهەمی مانەوەم لای هێزە ئاسمانییەکان، وەزارەتی ناوخۆ فرمانی پێکردم کەخۆم ئامادەبکەم بۆ بەجێهێشتنی ئەم شوێنە چونکە(مەترسییەکی گەورەم بۆ سەر ئاسایشی دەوڵەت!)

گفتوگۆ درێژەکانمان لەگەڵ میرحاج و ئەوانەی ئەمهاتن بۆ سەردانمان کۆتایی هات و راپێچیان کردم بۆ بەشی هاتووان لەبەندیخانەی ناوەندیی.

ئێوارەکەی رەشیدبەگ دۆشەکێکی گەورە و لێفەیەکی بۆهێنام، بەڵام زۆر دوودڵ بووم لەوەی ئەو دۆشەکە جوانە لەسەر زەوییە پیسەکە رابخەم و ئەترسام ئەسپێ تێیی بدات، بەڵام بەنیازی مانەوەی زۆر لەم شوێنە نەبووم. رۆژی چوارەم بانگیان کردم بۆ ئیدارەی زیندانەکە و ناسناکەم و ئەو ٢٠٠ لیرە سورییەیان دامەوە کەدادوەری لێکۆڵینەوە کاتی خۆی لەموسڵ دەستی بەسەردا گرتبوو و پێیان وتم، رادەستی سوریام ئەکەنەوە.

بڕوام بەگوێی خۆم نەئەکرد. ئایا ئەکرێت دوای ١٢ مانگ زیندان کەپێموابوو کۆتایی نایەت ئازاد ببم؟

گەشتەکەم لەعێراقەوە بۆ سوریا بەهاوڕێیەتی دووپۆلیس بەسەربرد، سەعات ١٠ی شەو گەیشتمە وێستگەکە و ئەو دووپۆلیسەم لەگەڵبوو کە هاتبوون بەفەرمیی تەسلیمی سوریام بکەنەوە، ئاسایشی فەرەنسی و ئاسایشی سووری کەتازە پێکهێنرابوو، هەریەک لەلایەکەوە بۆم هاتن، لەکاتی کێبڕکێکەیاندا لەخۆمم پرسی:

-(کامیان، فرەنسییەکان یان سورییەکان لەگەڵ خۆیان ئەبەن؟)

سەرەنجام چەند کارمەندێکی گەنج و ئازای ئاسایشی سوریا توانیان لەدەستی ئاسایشی فرەنسا دەرمبهێنن. دوای ئیمزاکردنی ئەو بەڵگەنامانەی دووپۆلیسە عێراقییەکە هێنابوویان، لێپرسراوەکەی ئاسایشی سوریا کە ناسیاوی کاکم بوو هات لەگەڵم بۆ قامیشلی.

ئەوە بۆ من ئیمتیازێك بوو، چونکە بەپێی قانون ئەبوو راپێچی زیندانم بکەن، پێشئەوەی بمدەنە دادگە. بەتۆمەتی چوونەدەرەوەی ناقانونیی لەسوریا، بەڵام لێپرسراوەکەی ئاسایشی سوریا بڕیاریدا بمداتە دەست کاکم، بەرامبەر ئەو بەڵێنەی کەهەرکات پێویستی کرد بچمە بەردەم دادگە. (بانگکردنم بۆ بەردەم دادگە دوای ١٠ مانگ گەیشت و ئەوکاتەش بەرلێبووردنی گشتی کەوتم.)

نیوەشەوبوو کەگەیشتمە بەردەم ماڵی کاکم:

(سەرئەنجام هاتیتەوە؟.) کاکم بەهەناسە بڕکێوە، وتی:

-(هاتیتەوە بچکۆلەکەم، شکور زیندوویت، تووشی ئازارێکی گەورەتکردم، خوایە سوپاس بۆ تۆ.)

منیش کە خۆم گرتبوو تا فرمێسك لەچاوم نەیەتە خوارەوە پێموت:

-(بەڵێ، هەموو شتێك باشە و منیش ساغ و سەلامەتم.)

لەماوەی رۆژان و هەفتەکانی دوای ئەوەدا ماڵەکەمان پڕبوو لەهاوڕێیان و کەسانی نەناسراو کەزۆربەیان گەنج بوون و تامەزرۆی بینینی ئەو کەسەبون کە(لەتۆمەتی کوردپەروەریی رزگاری بووە) و (قوربانیی ئیمپریالیزمی ئینگلیزە).ئەمە ئەو رایەبوو کە دوای ١٢ مانگ بەندێتی لەبەندیخانەکانی عێراقدا لەسەرم دروستبوو بوو.

ئەو ئازارە جەستەیی و دەروونییەی کەچەشتبووم بەفیڕۆنەچوو، لەدڵی خۆمدا وام ئەوت،کاتێك گەلی کوردم بینی زیاتر چاوی کراوەیە و هەستیارە بەرامبەر بارودۆخی خۆی لەچاو رۆژانی رابردوودا.

لەکۆتایی ساڵی ١٩٤٥دا سوریا لەرۆژانێکی سەختدا ئەژیا، چونکە سەرەڕای بەڵێنی سەربەخۆیی کە ساڵی ١٩٤١ فەرەنسییەکان دابوویان، ئامادەنەبوون وڵاتەکە بەجێبهێڵن، ولەبەرامبەر بەرگریی، لەسەرەتادا نهێنی و پاشان ئاشکرای گەلی سوریادا، فەرەنسییەکان پەنایان بردە بەرهێز و بەکارهێنانی سوپا و تەنانەت دیمەشقیش بۆردومانی ئاسمانیی کرا. لەقامیشلی چەندین خانوو بەتۆپ و چەکی قورس تەختکران. لەبالکۆنی ماڵە سێقاتەکەی راوێژکاری فەرەنساوە کەبەرزترین خانووی شارەکەبوو، مەترەلۆز تەقەی لەماڵی بەڕێوەبەری ناحیەکە ئەکرد کە خەڵکی سوریابوو. کاکم نەخۆشەکانی بەجێهێشت و رۆیشت بۆ فریاکەوتن و چارەسەرکردنی،منیش لەژێر بارانی گوللەدا لەگەڵی چووم. سوودمان لەناراميیەکی کاتی وەرگرت بۆئەوەی بەسەر دیوارەکەدا سەرکەوین و بچینە ناوماڵی بەڕێوەبەری ناحیەکەوە. کەگەیشتین دەستڕێژێکی گوللە دای لەدیواری چێشتخانەکە، بەڕێوەبەر وەك گەڵای دار ئەلەرزی و لەیەکێك لەگۆشە بێترسەکانی هۆڵەکەیدا هەڵکورمابوو، و سەرۆکە گەنجەکەی ئاسایشی سوریا بەدەمانچەیەکی ئۆتۆماتیکەوە پارێزگاریی ئەکرد. بەورتە ورتەوە وتی:

-(چاوتان لێیە چی ئەکەن؟)

کاکم دڵنیای کردووە و وتی:

-(فەرەنسییەکان چاك ئەزانن کە ناتوانن لەوەزیاتر بمێننەوە.)

پاش کەمێك وتی:

-(بڕوام پێبکە ئەم تووڕەبوونەیان دوا پەلەقاژەیە.)

لەڕاستیدا دوای ماوەیەکی کەم دەنگەکان ئارامبوونەوە و شەقامەکان لەخەڵك چۆڵبوون و وردە وردە کلینکەکەی کاکم پڕبوو لەبریندار.

دوای چەند رۆژێك چووم بۆ دیمەشق و لەوێوە بۆ بەیروت، چونکە بڕیارمدابوو درێژە بەخوێندن بدەم و ئەمویست وەك کاکم ببم بەپزیشك، بەڵام لەکۆتاییدا زانستە سیاسییەکانم هەڵبژارد.

کاتی خۆتۆمارکردن لەئەنستیتۆی زانستە سیاسییەکان و ئابووریی لـەزانکۆی فرەنـسی لەبەیروت لەخۆمم پرسی کـە چـۆن ئـەتوانم یارمـەتی گـەلی کـورد بـدەم بـۆ رزگـاربوون لەچەوساندنەوە و زیللەت؟

هەلەکە زۆر دوانەکەوت، کە دکتۆر کامەران بەدرخان پێشنیازی بـۆ کـردم ببمـە بێـژەر لەبەشی کوردی رادیۆی بەیروت کـە ئەوکاتـە هێـشتا دانـەخرابوو. چـونکە فرەنـسییەکان سەرگەرمی کێشەی گەورەبوون، بۆیە چاودێریی سەر ئەو دەزگایە لاوازبووبوو و بواریـان بـۆ ئازادیی دەربڕین رەخساندبوو.

لـەمهابادی ئێران،کوردەکـانی ئـەوێ لەئامادەکاریـدابوون بـۆ راگەیانـدنی فـەرمیی کۆماریی دیموکراتی کوردی و لەکوردستانی عێراقیش ئینگلیزەکان خۆیـان ئامـادە ئـەکرد بۆجەنگ دژی بارزانی و هێزەکانی. چالاکیی مـن وەك بێـژەر تـەنیا پێـشکەشکردنی ئـەو هەواڵ و رووداوانە نەبوو، بەڵکو لـەبارەی مەسـەلەی کـوردەوە بەگـشتیی،بەئاشکرا قـسەم ئەکرد ودروشمی نیشتمانیی و شۆرشگێریم ئەخوێندەوە و بانگی کوردم ئەکرد بـۆ راپـەڕین و هەستان و خەبات لەپێناوی مافەکانیاندا و بەگەرموگوڕیی ئەم ئەرکەم جێبەجێ کرد تا ئـەو رۆژەی ساڵی ١٩٤٦، کە بەرپرسانی لوبنان دەستیانگرت بەسەر رادیۆی بەیروتدا و پەخـشی زمانی کوردی راگیرا.

سەرەڕای خوێندنی زانکـۆ، قوتابخانەیـەکی شـەوانەم کـردەوە بەمەبەسـتی فێرکردنـی کوردەکانی بەیروت بەخوێندنەوە و نووسین بەزمانی خۆیان. ئەمە بەشێك بـوو لـەو کـارەی لەساڵانی رابردوو دەستم پێکردبـوو وتاسـاڵی ١٩٤٧ بـەردەوامبوو. لـەپایزی ئـەو سـاڵەدا لیسانسی زانـستە سیاسـییەکانم بەدەسـتهێنا و بڕیارمـدا بـچم بـۆ سویـسرا (بەهەشـتی سەرزەوی)،بۆ ئامادەکاریی بـۆ بڕوانامـەی دکتـۆرا. هەنـدێك لـەو ژن و مێردانـەی لـەوێ خوێندبوویان هێشتا بیریان ئەکرد و ئەیانوت:

-وڵاتێکی ئارامە و میللەتێکی باش و دیموکراسیی هەیە.

منیش بیرم لەوەئەکردەوە کەئەو وڵاتەی بەشداریی شەڕناکات و زادگەی خاچی سوورە و ئەم شۆکۆلاتە بەلەزەتە بەرهەم ئەهێنێ، بێگومان ئەبێت وڵاتێکی خۆش بێت. بیرم لای ئەوەش بوو:

-بێگومان مرۆڤ ئەتوانێ لەو وڵاتە پێشکەوتووانەدا قسە لەسەر مەسەلەی کورد بکات و لەوانەشە سویسرییەکان بایەخ بەکورد بدەن و هەوڵی یارمەتیدانیان بدەن. لەوانەشە کارێك بکەن بۆ رزگارکردنی.

بەم هەموو هیوایەوە لەیەکێك لەرۆژەکانی پاییزدا بەتەنیا سواری کەشتی بووم لەبەیروتەوە بەرەو ئیتاڵیا و لەوێشەوە بۆ سویسرا.

## سویسرا

- خوێندن لەزانکۆی لۆزان
- (دکتۆرا لەزانستەکانی کۆمەڵایەتیی و پەروەردە)
- چالاکیی لەپێناو مەسەلەی کورددا
- دامەزراندنی یەکێتیی خوێندکارانی کورد لەئەوروپا
- یەکێتیی خوێندکارانی کورد لەئەوروپا لەبەرامبەر پارتە کۆمۆنیستەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا
- ئەنجامی کۆڕێکی هونەریی قەشەنگ لەبارەی نازم حیکمەتەوە

چەند رۆژێك دوای نیشتەجێ بوونم لەسویسرا، تێگەیشتم، ئەوکەسانەی شارەزای مەسەلەی کوردن،دەگمەنن و هەندێکیان شتێکیان لەبارەی(گەلێکی چیایی)جەنگاوەری سوارچاکەوە بیستووە، بەڵام زۆربەیان سەرسام ئەبن بەبیستنی باسی کورد و کوردستان.

-وتت تورکستان؟

-نا، نا، کوردستان.......بێ کۆڵدان وەڵامم ئەدانەوە

بۆناساندنی کورد و کوردستان پەنام ئەبردە بەرنەخشە زەمینییەکان، بەڵام بۆ رۆشنکردنەوەی رای گشتیی ناچاربووم پەنابەرمە بەر رۆژنامەکان و رادیۆی رۆماندی، ئینجا کۆنگرە میللییەکان. لەزانکۆش(ناوم تۆمار کردبوو لە کۆلێژی زانستەکانی کۆمەڵایەتیی وسیاسی بۆ بەدەست هێنانی دکتۆرا لەپەروەردەدا). پشووی نێوان وانەکانیشم ئەقۆستەوە بۆ گفتوگۆی گەرم لەگەڵ خوێندکاران و ئوستادەکان سەبارەت بەمەسەلەی کورد.

هاوینی ١٩٤٨ کە لەچیکۆسلۆڤاکیا وەك خۆبەخشێك لەتیپی سویسریدا کارم ئەکرد، هات بەبیرمدا لەرادیۆی پراگەوە باسی کورد بکەم، بەڵام چیکییەکان تووشی سەراسیمەیی و تۆقان بوون و بەساردیی وەڵامی دەستپێشخەرییەکەمیان دایەوە:

-بەرێز، بە هەڵە لەدەرگەت داوە!

وردە وردە راستییەکە لەبەردەمدا وەك رۆژی رووناك بەرجەستە بوو: نەچیکییەکان و نەسویسرییەکان،ئامادە نین کورد رزگاربکەن، بەڵام ئەی نەتەوەیەکگرتووەکان بۆنا؟

پایزی هەمان ساڵ رێکخراوی نەتەوەیەکگرتووەکان کۆبوونەوەکانی لە کۆشکی شایۆ بوو لەپاریس و وەك ئەندامێکی ئەو وەفدەی راسپێردرابوو یاداشتێك لەبارەی کوردەوە پێشکەشبکات،بڕیارمدا بەجیاجیا نێردراوەکان ببینم، بۆیە بەئۆقرەوە لەبەر دەرگەی

کۆبوونەوەکاندا چاوەڕێم ئەکردن. کۆپییەکی یاداشتەکەمانم دایە دیپلۆماتێکی دانیمارک و جەختم لێکردەوە مەسەلەی کورد بخرێتە بەردەم نەتەوە یەکگرتووەکان.

-دەقەکە ئەخوێنمەوە بەڵام بەگومانم بوار بدرێت بەباسکردنی ئەم مەسەلەیە....

وڕەی خۆم لەدەست نەدا و بەردەوام بووم لەهەراسان کردنی نێردراوانی نەتەوە یەکگرتووەکان،بەڵام تەنیا کەس کەبەگەرمیی پێشوازیکردم نوێنەری یۆگۆسلافیا بوو کە وەك باڵیۆزی وڵاتەکەی لەلوبنان کاری کردبوو، بەسەرسوڕمانەوە ئاگای لەمەسەلەی کورد بوو!

-بەلگراد لەمێژووی خۆیدا شەش جار سووتێنراوە، ئەبینیت، ئەو رۆژەش دێت کەسەربەخۆیی کوردستان بێتە دی!

بەم شێوەیە وەڵامی داینەوە.

هەربەهۆی قسەکانی ئەوەوە هەستم بەگەشبینیی کرد کاتێك بەرپرسی دیکیۆمێنتاریی نەتەوەیەکگرتووەکان بانگی کردم و پێی وتم:

-خۆت ئەزانیت قانونی نەتەوەیەکگرتووەکان رێنادات دەست وەردرێتە کاروباری ناوخۆی وڵاتانی ئەندامی رێکخراوەکە. کەواتە ناتوانین دەست وەردەینە کاروباری تورکیا و عێراق و ئێران و سوریا، چونکە ئێوە بە شێوەیەکی فەرمیی تورك و عێراقی و ئێرانی و سورین. کاتێك ئەتانکوژن و قەڵاچۆتان ئەکەن، تورك و عێراقی و ئێرانی و سوریەکان لەوەڵامماندا ئەڵێن:مەسەلەکە پەیوەستە بەکاروباری ناوخۆوە و پەیوەندیی بەئێوەوە نییە. سەرەنجام بەداخەوە نەتەوەیەکگرتووەکان ناتوانێت هیچ بکات، بەڵام مادام دۆسیەیەکتان هەیە، هەوڵ بدەن بەپێی توانا بە بەڵگەنامە و راستییەکان دەوڵەمەندی بکەن، لەوانەیە رۆژێك بێت دۆخەکە بگۆڕێت.

لەوانەیە.... بەڵام لەلۆزان خەمی تر چاوەڕێی ئەکردین. هاوڕێیەکی کوردی عێراقمان تووشی گرفتی دارایی بووبوو چونکە حکومەتی عێراق کۆمەکی خوێندنی لێبڕیبوو.

لەوکاتەدا بیرۆکەیەکم هات بەمێشکدا کەهەموو خوێندکارانی کوردی ئەوروپا لە یەکێتییەکدا کۆبکەینەوە.

لەرۆژێکی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٤٩دا، ئەو شەش خوێندکارە کوردەی لەسویسرا بووین، لە لۆزان کۆبووینەوە و بڕیاری دامەزراندنی(یەکێتیی خوێندکارانی کورد لەئەوروپا)ماندا، و داوامان کرد لەهەموو خوێندکارانی کورد لەئەوروپا بێنە ریزی یەکێتییەکەوە.ئێمەش بەڵێنماندا هاوکاریی هەڤاڵەعێراقییەکەمان بکەین بەوەی مانگانە چەند سەد فرەنکێکی پێشکەش بکەین. جگەلەوەش کۆنگرەی دامەزرێنەر لەلۆزان، منیان وەك سەرۆکی یەکێتییەکە دیاریی کرد و بڕیاریشیدا بڵاوکراوەیەکی مانگانە بڵاوبکاتەوە بەزمانەکانی کوردی و ئینگلیزیی و فەرەنسی،بەناوی(دەنگی کوردستان).

شەو ورۆژ سەرقاڵی نووسین و تایپکردنی وتارەکان بووم، پاشان کۆپی کردنیان. لەبەرئەوەی رێیان نەداین بڵاوکراوەکەمان لەسویسرا چاپ بکەین، یەکێ لەئەندامەکانمان لەپاریس ئەرکی چاپکردنی بەرۆنیۆ گرتەئەستۆ.

رۆژنامەکەمان کەسیاسەتی تواندنەوەی نەتەوەیی زۆرەملێی بەرامبەر بەگەلی کورد لەلایەن تورکیا و عێراق و ئێران و سوریاوە لەقاو ئەدا، بەخێرایی هاوسۆزیی لاوان و خوێندکاران و میدیای دیمۆکراسیی بەدەست هێنا، هاوکاتیش بووە هۆی ورووژاندنی رقی حکومەتەکانی داگیرکەری کوردستان و پارتە کۆمۆنیستە ستالینییەکان، کە بوختانی ئەوەیان ئەکرد، بوونی کۆمەڵەکەمان پێچەوانەی یەکێتیی چینی کرێکارە لەو وڵاتانەدا. لەوروانگەیەشەوە ئەبێت هەڵبوەشێنرێتەوە. تودە(پارتی کۆمۆنیستی ئێران) ئەم ئەرکەی پێ سپێردرا و هەڤاڵانی پاریسمان کەئەندامی تودە بوون، بوون بە مقاشی ئەم کارە.

هاوکارێکی کوردمان لەپاریس، کە تائەوکاتە چالاکترین ئەندامی یەکێتییەکەمان بوو، ئەم قسەیەی دا بەڕووماندا:

-قسەکردن سەبارەت بەکوردستان، لەبارەی نەتەوەی کوردەوە، لەبارەی رابردوو و ئێستا و مافەکانییەوە، تەنیا دەربڕی شۆڤێنیی کوردە و لێرەوە دژی نێونەتەوەیی بوونی پارتە

کۆمۆنیستەکانە. بۆگرتنەدەستی کورسی دەسەڵات، پارتە کۆمۆنیستەکان پێویستیان بەکۆکردنەوەی هەموو ئەو کەسە یاخیانە بوو کە لەسنووری ئەو وڵاتانەدا ئەژین لە تۆپەڵە بیرکردنەوەیەکی تاکڕەوانەدا و هەرکات دەسەڵاتی گرتە دەست ئەوا بێگومان بنیاتێکی نەتەوەیی کوردی ڕەچاو ئەکات و پشتیوانییان ئەکەن بۆ بەدەست هێنانی مافە سروشتییەکانیان. بەڵام ئەمڕۆ قسەکردن لەوبارەیەوە ماقووڵ نییە.

ئەم جۆر بڕوبیانووانە بەلای منەوە ماقووڵ نەبوون چونکە یەکێتییەکەمان هەرگیز بانگەشەی ئەوەی نەکردبوو کەدروست بووە بۆ بینینی ڕۆڵی پارتێکی سیاسیی، بەڵکو بۆئەنجامدانی ئەرکێکی سەندیکایی و ڕووناکبیریی و سیاسیی.

یەکێتیی خوێندکارانی کورد لەئەوروپا، تەنیا هاوارێکی ئاگاهێنانەوە بوو و بانگێکی فریاکەوتن بوو لەبەردەم مەترسیی سەر بوونی گەلی کورد.

من لەگومانیش زیاترم هەبوو سەبارەت بایەخدانی پارتە کۆمۆنیستەکانی تورکیا و عێراق و ئێران و سوریا بەمەسەلەی نەتەوەیی کورد، چونکە وێڕای پیاهەڵدانی بەنێونەتەوەییدا،کەچی خۆی گێل ئەکرد لەشۆڤێنیزمی زۆرینە لەو وڵاتانەی کوردستانیان پێوە لکێنرابوو، و تا ئەم ساتە هیچ پارتێکی کۆمۆنیستی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست نەوێراوە ڕکوڕاست ڕای خۆی لەسەرکێشەی کورد رابگەێنێت.

بەلای کۆمۆنیستە تورکەکانەوە کورد هەر نییە، بەلای کۆمۆنیستانی عێراقەوە کورد نەتەوە نین و تەنیا کەمینەیەکی ئیتنیکین. ئەندامانی تودەش، هەرچەندە دان بەبوونی کورد لەئێراندا ئەنێن، بەڵام بڕوایان وابوو کەهێشتا کاتی ئەوە نەهاتووە بایەخییان پێ بدرێت و قسەیان لەسەر بکرێت. بە لای پارتی کۆمۆنیستی سوریاشەوە، کێشەی سەرەکیی لەکاتەدا مەسەلەی نەتەوەی عەرەب بوو،و ئەبێت کورد تایبەتمەندیی خۆیان لەبیر بەرنەوە، پێویستە لەسەریان بچنە ریزی پارتی کۆمۆنیستەوە و خەبات بکەن بۆ مەزنایەتی نەتەوەی عەرەب، هەروەك سەرۆکە کوردەکەی پارتی کۆمۆنیست، خالد بەگداشی دانیشتووی دیمەشق پەیڕەوی ئەکرد.

لەکاتی کۆبوونەوەیەکدا لە لۆزان سەبارەت بەچارەنووسی یەکێتییەکەمان، هەڤاڵە تودەییەکەمان زۆرینەی دەنگەکانی بەدەست نەهێنا، بەڵام سەرەڕای ئەو ئەنجامەش کە نە بەرژەوەندیی مانەوەی ڕێکخراوەکەمان بوو، من پێشنیازم کرد بۆ ئامادەبوون هەڵیوەشێنینەوە، چونکە بەهۆی بێبەش بوونم لەیارمەتی ئەندامەکەی پاریسمان کە سەرقاڵی کارە تایبەتەکانی خۆی بوو، نەمئەتوانی تەنیاباڵ بەرپرسیارێتیی دەنگی کوردستان هەڵگرم.

دوای ئازاد بوونم لەئەرکەکانم وەك سەرۆکی یەکێتیی خوێندکارانی کورد لەئەورووپا و سەرنووسەری دەنگی کوردستان، سەرەنجام کاتی پێویستم بۆ رەخسا بۆ بایەخدان بەخوێندنەکەم و ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەکەم، بەڵام بێ ئەوەی ببێتە ڕێگر لە قسەکردن لەبەرژەوەندیی کورد و دژی چەوسێنەرانی.

هەمیشە باوەڕم وابوو کە لێدوان لەبارەی کوردەوە بوونیان ئەسەلمێنێ لەچاوی کوێراند و زیانی بۆ مەسەلەکەیان نییە، هەربۆیە ساڵێك پێش هەڵوەشاندنەوەی یەکێتییەکەمان وەڵامی ئەرێنیی بانگێشتێکی فێستیڤاڵ و کۆنگرەی لاوانی دیمۆکراتی جیهانم دابووەوە کە لەبۆدابست ئەبەسترا.

بەپێی لێکدانەوەی خۆم پێشبینیی ئەوەم کردبوو بوارێکی گونجاو بدۆزینەوە بۆ باسکردنی کێشەی کورد و بەدەستهێنانی هاوسۆزییان، بەڵام نوێنەرانی وەفدەکان و پارتە کۆمۆنیستەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست کارێکیان کردبوو ئێمە پەراوێز بخرێین و ئامادەییمان نەبێت لەم خۆپیشاندانەدا، سەرەڕای ئەوەش توانیم ئامادەیی کورد بسەپێنم بەوەی بەرگی کوردیم لەبەرکرد و لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری هەڤاڵاندا توانیمان چاو و سەرنجی فۆتۆگرافەرانی میدیا بەلای خۆماندا رابکێشین. بەشداریمان تەنیا لەلایەنی کەلتوورییدا قەتیس نەبوو، بەڵکو لەرۆژی تایبەت بەدژایەتیی ئیمپریالیزم و لەبەردەم جەماوەرێکی پێنج هەزار کەسیدا، شیعرێکم خوێندەوە کە بۆ مستەفا بارزانیم نووسیبوو و رۆژی دواتر

لەرۆژنامەکانی مەجەرِدا بڵاوکرایەوە. ئەوەی بەتایبەت هەستی بزواندم، ئەوبایەخە تایبەتە بوو کە سەرۆکی لاوانی دیمۆکراتی جیهان، (گی بواسۆن) ی فەرەنسی پێیدابین، کە هیچ شتێکیشی لەبارەی کوردەوە نەئەزانی.

پێشوبەرمیەکی توند دروست بوو لەنێوان ئێمە و رێکخراوە چەپەکاندا کەدوای ماوەیەك وەك کەسێکی بێزراو و بەکرێگیراوێکی تێکدەر تەماشایان ئەکردم، لەگەڵ ئەوەشدا بەپشتیوانی پارتە چەپەکانی ئەمێریکای لاتین توانیم بەشداری کۆنگرەکە بکەم. هەرچەندە نوێنەری شاندی سوریا هەوڵیدا رێگریی بکات لەپێشکەشکردنی راپۆرتەکەم، بەڵام من هەر سووربووم، وێرای ئەو سازشەی رێکخراوەکانی خۆرهەڵاتی ناوەرِاست سەپاندیان بەسەرماندا کە پێویستە بەناوی (کورد)ەوە قسە بکەین.

ئاشکرا بوو گەر بەناوی (کوردستان)ەوە قسەم بکردایە، ئەوا حکومەتەکانی وڵاتانی خۆرهەڵاتی ناوەرِاست سەرەکۆنەیەکی توندی پارتە چەپەکانی خۆیانیان ئەکرد.

دوای چەند رۆژێك لەوە، بەخت زیاتریش یاوەرم بوو، کە پێش نوێنەرانی سوریاو ئێران و عێراق و ئەوانی تر گەیشتمە بارەگەی ئەنجومەنی جیهانیی خوێندکاران لەسۆفیا، و توانیم قایلیان بکەم بەوەی خۆم وەك نوێنەری کوردستان پێشکەش بکەم. چ سەرکەوتنێکە! چەند شادمان بووم کاتێك رێی گەرِانەوەم بەرەو سویسرا گرتەبەر!

مانگی شوباتی ساڵی ١٩٥٠ و دوای ئەوەی تریستان تزارا کۆمیتەی ئەورووپای دروست کرد لەپێناو ئازادکردنی نازم حیکمەتی بەسێدارە حوکمدراو، کە ١٣ ساڵ بوو لەکونجی زینداندا بوو، تیمی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتیی زانکۆی لۆزان کەخۆشم یەکێك بووم لەئەندامەکانی، رایسپاردم وتارێك بخوێنمەوە لەو کۆرِە پشتیوانییەدا کە بۆ ئەو شاعیرە گەورەیەی تورك رێك ئەخرێت. دیارە خۆشم زۆرم پێخۆش بوو قسە بکەم لەسەر ئەو شاعیرە خۆشەویستەم و خوێندنەوەی هەندێك لەشیعرەکانی و هاوکات لەقاودانی رژێمی دیکتاتۆریی تورکیا لەو بۆنەیەدا.

بانگەوازی کۆڕەکەی سەبارەت بە نازم حیکمەت لە کۆلێژ و خوێندنگە و زانکۆکان هەڵواسرا و بڵاوکرایەوە، بەڵام خوێندکارانی تورکی شەیدای ئایدۆلۆژیای ئەتاتورك کەژمارەیەکی زۆریان لە لۆزان بوون کەوتنە خۆ بۆتێکدانی کۆڕەکە، و بەرپرسی خوێندکارانی تورك -کەدواتر ئەبێتە راگری کۆلێژی مافەکان لەئەستەنبوڵ- پێش ئەوەی سەرەی قسەکردنم بێت هەستا و نارەزایی دەربڕی لە دەستێوەردانی من. رووی دەمی کردە ئامادەبووان:

-نورەدین بۆی نییە هێرش بکاتە سەر تورکیا.

بەڵام (فۆدوا)کە سەرۆکایەتیی کۆڕەکەی ئەکرد دەمکوتی کرد:

-نورەدین زازا ئەم ئێوارەیە لەسەر داوای ئێمە قسەئەکات و دوای تەواوبوونی وتارەکەی گفتوگۆ ئەکرێت. ئەگەر پرسیار یا تێبینیت هەبوو ئەو کاتە ئەتوانیت پێشکەشی بکەیت.

بەرپرسەکەی خوێندکارانی تورك بێدەنگ بوو. کاتێك ویستم بەرەو تریبۆنەکە بڕۆم ژمارەیەك خوێندکاری تورکم بینی کە شووشەی بەتاڵی کۆکاکۆلا بەدەستەوە لێم نزیك ئەبنەوە. بەڵام خوێندکارە ئەمێریکییەکانی سەرپەرشتیاری هۆڵەکە ناچاریان کردن لێم دوورکەونەوە. و وازیان هێنا بەئاشتیانە وتەکەم پێشکەش بکەم. بەڵام دواتر کردیان بەهەراو هۆریا لای خوێندکارە جوولەکەکان، کاتێك بەخوێندکارێکی جوولەکەدا هەڵشاخان کەلەبارەی ڤێتنامەوە قسەی ئەکرد:

-دەمت داخە! تۆی جوولەکە بۆت نییە لێرەدا قسە بکەیت.

لێرەدا بەرپرسی خوێندکارانی تورك رووگیربوو لەبەردەم کاردانەوەی ئامادەبووانا بەتایبەت ئیسرائیلییەکان:

-هاوڕێکانم ببوورن، خۆتان ئەزانن وڵاتەکەمان پەیوەندیی گەرمی هەیە لەگەڵ ئیسرائیل، و جوولەکەش لەتورکیا بەهاووڵاتیی تەواو دائەنرێن.

لیفی، خوێندکار- سەربازی پەیکەر سەربازیی وەڵامی دایەوە:

-بەڵێ، بەڵێ، بەڵێ ئەزانین. بەڵام لەئێستا بەدواوە کەرێتیی وانەکەن!

دوای ئەو رووداوە چاوەڕێی ئەوەبووین خوێندکارانی تورك خێرا هۆڵەکە بەجێبێڵن، بەڵام دیار بوو هێشتا وازیان نەهێناوە، بۆیە سەرۆکی دانیشتنەکە ناچار بوو زووتر کۆڕەکە تەواو بکات.

نزیکەی مانگێك دوای ئەو کۆڕە پۆلیسی فیدراڵ کە بەتایبەت بۆ ئەم مەسەلەیە هاتبوون بۆ لۆزان بانگیان کردم و لێکۆڵینەوەیەکی درێژ و توندیان لەگەڵ کردم.

بەسەرسوورمانەوە لەپۆلیسەکانم پرسی:

-بۆ ئەم هەموو پرسیارەم لێ ئەکەن؟!

-ئێمە لەسەرداوای باڵیۆزی تورکیا لێکۆڵینەوەت لەگەڵ ئەکەین، چونکە هەڕەشەی کردووە، گەرتۆ لەسویسرا بمێنیتەوە،هەموو خوێندکارە تورکەکانی لۆزان ئەکێشنەوە.

دوای چەند مانگێك پۆلیسی سویسرا فەرمانێکیان دامێ کەلەماوەی ١٥ رۆژدا سویسرا بەجێبهێڵم، سەرەڕای رێنەدان بەگەڕانەوەم پێش تێپەڕبوونی دووساڵ. لەگەڵ ئەوەشدا بەهەوڵی دۆستیکی پارێزەری بەوەفا، قایلبوون بە درێژکردنەوەی وەرزانەی مانەوەم تاکۆتایی خوێندن و هەموو جارێك ئەبوو چاوەڕێی رەزامەندیی بێرن بکەم لەکاتێکدا تا رووداوی کۆڕەکەی سەبارەت بەنازم حیکمەت، هەرێمی فۆد مۆڵەتی مانەوەی ساڵانەی ئەدامێ.

لێکۆڵینەوەکەم لەشالێ یەکی بچووکدا تەواو کرد لەناوچەی دیابلرێ، و لێیەوە رۆژانە ئەو چیایانەم ئەبینی کە کوردستانیان بیرئەخستمەوە. هەر لەوێش ئاشنای بەرهەمە گەورەو جوانەکەی نووسەری چیکیی (فۆجیك) بووم:(نووسراو لەژێر سێدارەدا) یاداشتیی تایبەتیی، کەلەوانەشە ئیلهام بەخشم بووبێت. لەوێوە وام هاتە بەرچاو، کە زۆر دواکەوتووم لەوەی کارێك بکەم بەسوودی کورد و کاتی ئەوە هاتووە بگەڕێمەوە سوریا. هەرواشم کرد.

لەیەکێك لەرۆژانی کۆتایی مانگی حوزەیرانی ١٩٥٦ دا سویسرام بەجێهێشت و کەشتییەك لە(باری)یەوە بردمی بۆ(بەیروت)، و دوای ساڵانێکی دوور و درێژی دووریی بەدیداری کاکم و ئەو هەڤاڵە کوردە وەفادارانەم شاد بوومەوە کە لەقامیشلی یەوە هاتبوونە پێشوازیم، لەبەرئەوەی بڕوانامەی دکتۆرام بەدەست هێنابوو لەزانستی پەروەردەییدا لەزانکۆی لۆزان،ئەبوو هەڵگری ئەم نازناوە زانکۆییە کاربکات بۆ گۆڕینی دۆخی کورد لەسوریا و رزگارکردنیان لەمەینەتیی و تەنگانە و بێبەشییەکانیان و یارمەتیدانیان بۆ بەدیهێنانی ئاواتە بەرزەکانیان.

هەر لەگەڵ دابەزینم لەکەشتییەکە، تێگەیشتم لەوەی کوردانی سوریا چاوەڕوانییەکی زۆر و بێگومان زۆر زۆریان لەمن هەیە.

ئاخۆ ئەتوانم، لەخۆرهەڵات، و لەماوەی مانگەکان و ساڵانی داهاتوودا کارێك بکەم کە نائومێدیان نەکەم؟

ئایا دۆخەکە بوارم ئەداتێ ئەو بیرۆکانەم جێبەجێ بکەم کە تێکەڵاوبوونم لەگەڵ سیستەمی دیمۆکراسیی سویسرا لای درووست کردووم؟

# سوریا لەسەردەمی عەبدولناسردا

- کورد بەرامبەر بەعسی و کۆمۆنیستەکان

- دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کورد لەسوریا

- گیران

- زیندان و ئەشکەنجە لە حەڵەب و دیمەشق

- سوودی کۆنترۆڵ کردنی دەمارەکان

- داواکاریی سەربازیی داوای سزای لەسێدارەدان ئەکات

که دوایی ئەکرێت بەساڵێك زیندان

- بەهۆی داوا جیهانییەکانەوە

لەماوەی نێوان بەجێهێشتنی وڵاتەکەم بۆ ئەوروپا و گەڕانەوەمدا، گۆڕانکاریی گرنگ لەهەموو بوارەکاندا لەسوریا روویاندابوو.

ساڵی ١٩٥٤ و دوای زنجیرەیەك کودەتای سەربازیی یەك لەدوای یەك کە (حوسنی زەعیم) لەساڵی ١٩٤٩ دا سەرەتاکەی کردبووەوە، بۆرژوازیی لەگەڵ سوپا ئاشت بوو بووەوە بۆ ژیاندنەوەی سەرلەنوێی دیمۆکراسیی پەرلەمانیی بەهەموو جۆرەکانییەوە و جێبەجێکردنی بەڵێنەکانی لەدابینکردنی(ئازادی)دا.

ماوەیەکی زۆری پێنەچوو کۆمپانیا بەشدارە هاوبەشەکان کەنەرمییان ئەنواند بەرامبەر چینی هەژار،قەوارەیەکی چاوەڕوان نەکراویان وەرگرت، فراوان بوونی مەزن و بێوێنەی کشتوکاڵی پەموو،بووە پاڵنەری پێشکەوتنی پیشەسازیی رستن،هەروەك بڵاوبوونەوەی کشتی چەوەندەر بەرهەمهێنانی شەکری بەدوای خۆیدا هێنا و لەماوەی چەند ساڵێکدا سوریا بووە وڵاتێکی گەورەی ناردنە دەرەوەی گەنم و جۆ و لۆکە. وردە وردەش خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی و زانکۆ وای لێهات هەموو چینەکانی کۆمەڵ بگرێتەوە.

لەبواری دابونەریتەکانیشدا گۆڕانەکان بەرچاو بوون، بۆنموونە لەساڵی ١٩٤٧دا جگە لەگەنجان زۆرینەی هەرەزۆری بۆرژوازیی شارەکان کەشخەیان بەلەسەرکردنی (تەربوش)ەوە ئەکرد، کەچی لەساڵی ١٩٥٦ دا ئەم کڵاوە، بێزراو و مایە گاڵتەجاریی بوو و خەڵك راهاتبوون سەر رووت بێنەدەرەوە. (قەمباز)یش ئەو پۆشاکەی پێشەکەی کراوەبوو و لەسەر ناوقەد بەقایشێکی پان ئەبەسترا و بەزۆریی خاوەن کۆگە و پیشەوەرانی گەڕەکە کۆنەکان ئەیانپۆشیی، بووبووە شتێکی نایاب. گۆڕانەکە بەشێوەیەکی قووڵتر بواری پۆشاکی ژنانی گرتبووەوە، چونکە کاتێ من کۆچم کرد ٩٩٪ی ژنانی موسڵمانی شارەکان بەچارشێوەوە ئەهاتنە دەرەوە، کەچی دوای نۆ ساڵ بەدەگمەن ژنێکی بەچارشێوت ئەبینی.

هاوشانی ئەم گۆڕانکارییانە، سوپا کە زیاتر لە ٥٠٪ی بودجەی نیشتمانیی لوش ئەدا، زەبەلاح بوو بوو و لەسوپایەکی بچووکی پێکهاتوو لەو بەکرێگیراوانەی فرەنسییەکان دوای خۆیان جێیان هێشتبوو، بووبووە سوپایەکی نیشتمانیی بەفەرماندەیی کادرانی هەڵقەڵاو لەبۆرژوازیی بچووکی دێهات کەبەگشتیی سیاسێنرابوون و کاریان ئەکرد لەبەرژەوەندیی ئەوپارتانەی بانگەشەی یەکێتی عەرەبیان ئەکردو کەوتبوونە کەلکەڵەی یاخیبوون و سەرکێشیی (دۆن کیخۆت)ییانە. بۆیە ساڵی ١٩٥٨ (عەبدولناسر) ئەم هەستەیانی قۆستەوە و وەك دیارییەك لەسەر سینییەکی زێڕین وەریگرت.

لەلایەنی کۆمەڵایەتییەوە، پێئەچوو گەورەترین گۆڕانکاریی لە(جەزیرە) روویدابێت، چونکە بەهۆی پشتبەستنی دەرەبەگەکانی کورد و عەرەب، کەخاوەنی زۆربەی زەوییەکان بوون، بەهەرچی زیاترو زیاتری میکانیکی کردنی کشتوکاڵ، بەشێکی زۆری جووتیار و کرێکارە کشتوکاڵییەکانیان، کەهەموویان کورد بوون، ناچار بووبوون بەرەو شارەکان کۆچ بکەن و هەندێکیان بووبوونە کۆڵهەڵگر و هەندێکیان کرێکاری خانووسازیی و هەندێکیش خۆیان فێری فیتەریی کردبوو، یا بەختی خۆیان لەبواری بازرگانیی و کاسپی تردا تاقی کردبووەوە. بیری نەتەوەیی کورد لەنێو ئەو جووتیارە یاخی و دوورخراوانەدا، ناوەندێکی نمونەیی بۆ بڵاوبوونەوە دۆزیبووەوە.

پارتی کۆمۆنیست،کەدوای جەنگ خەباتی کردبوو دژی حکومەتەکانی بۆرژوازیی نزیك لەئەمێریکا، و پاشان دژی رژێمە سەربازییەکانی جێگرەوەیان کەهەمان ئاڕاستەیان گرتبوو، لەوکاتەدا لوتکەی سەروەریی و گەشەکردنی خۆی بەسەرئەبرد، بەجۆرێك، سکرتێرەکەی، خالید بەگداشی، ستالینیی کەلەرەق، کەخاوەن کەسایەتییەکی بەهێز و وتاربێژێکی ئازا و بەهرەدار بوو و ئەیزانی چۆن جادووییانە سەرنجی جەماوەر بەلای خۆیدا راکێشێت،لەهەڵبژاردنەکانی١٩٥٤دابەئەندامی پەرلەمانی سوریا هەڵبژێردرابوو و توانیبووی کاریکاتە سەر سەرەك وەزیرانی ئەودەمە، خالید ئەلعەزەمی بۆرژوازیی لیبراڵ،

بەرادەیەك کەهانی دابوو بۆ پەیڕەوکردنی سیاسەتی دۆستایەتیی و هاوکاریی لەگەڵ یەکێتیی سۆڤییەت، کەچەندین ڕێکەوتنی ڕووناکبیریی و ئابووریی لێکەوتەوە و سەرەنجام فراوانتر بوو و هاوکاریی تەکنیکیی و سەربازیشی گرتەوە. ساڵی ١٩٥٦ ئەفسەرانی سۆڤییەت بەبەشداریی ئەفسەرانی سوریا دەستیانکرد بەڕێکخستنەوەی سوپای سوریا تاگەیشتە ئەوەی بڕێکی زۆری چەکی سۆڤییەتی ڕژایە سوریاوە.

لەودەمەدا پارتێکی سیاسیی هەوڵی ئەدا ڕووبەڕووی جەماوەرێتیی پارتی کۆمۆنیست بێتەوە، ئەویش پارتی بەعسی عەرەبیی سۆشیالیست بوو، دامەزرێنەرەکەی کە ڕووناکبیری کریستیان (میشێل عەفلەق) بوو،بەوەناسرابوو کەساڵانی ١٩٣٩- ١٩٤٥ پێش جەنگ و دوای جەنگ بانگەشەی بۆنازییەکان ئەکرد.

ئەوکاتە باوەڕی بەعسایەتی، پێشوازیی نەئەکراو قبووڵ نەبوو، جگە لەناوەندی خوێندکارانی دواناوەندیی و خوێندکارانی سەر بەچینی بۆرژوازیی دێهاتیی بچووك و ئەفسەرانی سەر بەهەمان ناوەندی کۆمەڵایەتیی،و بێجگە لەهەندێك کادری باوەڕدار بەبیری بەعس، ئەوا چینی کرێکار بێزاریی و قێزی خۆی لەم پارتە دەرئەبڕی. چونکە وێڕای ئەوەی بەهەموو توانای خەبات و جەختی کردبوو بۆئەنجامدانی هەڵبژاردنی شارەوانییەکان لەکاتی دیاریکراوی خۆیدا لەساڵی ١٩٥٧ دا و بەشێوازێکی تەواو شەرعیی، کەچی کاتێك باوەڕی بەوە هێنا کەبەختی لەبردنەوەدا مسۆگەر نییە، هەموو شتێکی کرد لەپێناوی دواخستنیدا و ئینجا کەوتە کارکردن بۆ ئەوەی سوریا بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی سەرکوتکەری ناسرەوە.

بەڵام پێش ئەوەی سەرۆك قایل بێت بەسەرۆکایەتیی میسر و سوریای یەکگرتوو لە(کۆماری یەکگرتووی عەرەب)دا،چەند مەرجێکی مەحاڵی دانا،لەوانە هەڵوەشاندنی هەموو پارتە سیاسییەکان. بەعسییەکان خێرا قایل بوون بەمەرجەکان، لەبەرامبەردا پارتی کۆمۆنیست بەتەواویی کۆنترۆڵی میسری لەسەر سوریا ڕەتکردەوە و کاتێك پەرلەمان بانگ

کرا بۆدەنگدان لەسەر پرۆژەی سوری-میسری، تەنیا دوو ئەندام پەسەندیان نەکرد: خالید بەگداشی کۆمۆنیست( کەدوای ئەوە بەماوەیەکی کورت چوو بۆ مۆسکۆ) و خالید ئەلعەزەمی سەرەك وەزیران، کە بەمانەوەی لەسوریا خۆی خستە بەر هەرەشە و سوکایەتیی ئەو(فەرماندارە نازییانە)ی ناسر سەپاندنی.

لەو دەمەدا کۆمۆنیستەکان بەرۆژانێکی رەش و قێزەوندا تێپەڕین و ژمارەیەکی زۆریان گیران و خرانە ژێرئەشکەنجەی سەدەکانی ناوەڕاست ئاساوە کەبووە هۆی مردنی هەندێکیان و ئەوانەشی دواتر لەزینداں ئازاد بوون پاشماوەی ژیانیان بە کەفتەکاریی بەسەر برد.

کوردەکانی سوریاش،لەلایەکەوە کەوتنە بەردەم هەڕەشە و دژایەتیی و ئەو ململانێیەی نەتەوەپەرستیی پارتی بەعس سەپاندبووی بەسەریاندا و لەولاشەوە بینیان پارتی کۆمۆنیستی بەقسە (نێونەتەوەیی)، لەراستیدا رۆڵی پارێزەری نەتەوەی عەرەب ئەبینێت. لەناوەندی کوردەکاندا بەرگریی لەبنەمای هاوولاتیی بوونی جیهانیی ئەکرد و ئەوکوردەی ببوایەتە ئەندامی پارتی کۆمۆنیستی سوریا، ئەبوو بڵاوکراوەکانی بەزمانی عەرەبی بخوێنێتەوە. هۆشیاریان ئەکردەوە لەمەترسییەکانی ئیمپریالیزم کەهەرەشەیە بۆسەر جیهان و داوای کۆمەکیان لێئەکرد بۆگەلی جەزائیر کەلەگەڵ فەرەنسا لەجەنگدا بوو و پێشنیازیان بۆ ئەکرد ژیانی خۆی بخاتە مەترسییەوە یا خۆی بەکوشت بدات لەسەر سنووری سوریا-ئیسرائیل، لەبەرامبەردا نابێت داوای هیچ شتێك بۆگەلەکەی خۆی بکات! لەبری ئەوەی سڕینەوەی کەلتووریی پەیڕەو کراو دژی کوردی قوربانیی راگرێت، چ لەسوریا یا لەتورکیا و عێراق و ئێران، کەچی گەر تەنیا پرسیارێکی لەوجۆرەت بکردایە راستەوخۆ وتوند تۆمەتی(شۆڤێنیستیی نەتەوەیی) و (لادانی ئایدۆلۆژیی)یان ئەخستە پاڵت.

لەبەرئەوەی هیچ پارتێکی سیاسیی لەسوریا نەبوو بەنیاز بێت بوونی کوردی بەردەوام چەوساوە رەچاوبکات،بیرمکردەوە کاتی ئەوەهاتووە رێکخراوێك پێکبهێنرێت کەرێیان بدات ناسنامەی خۆیان بپارێزن و گەشەی پێبدەن، بەرەو زەمینە خۆشکردن بەرەو

ئازادبوونیان لەچوارچێوەی وڵاتی سوریادا. خوێندکارانی ئامادەیی و خوێندکارانی دیمەشق و تیکۆشەرانی دێرین و مەلاکان و دەرەبەگ و جوتیارانی سادەی دێهاتی ناوچەکوردییەکەی سوریا جەختیان لێکردم بۆبەجێگەیاندنی ئەوپرۆژەیە. بۆیە وێڕای پابەندییەکانم وەك ئوستادی پەروەردە و کۆمەڵایەتیی لەزانکۆی دیمەشق، دەستمکردە بەجێهێنانی ئەو ئەرکەبۆ ئەمەش (جەلال تاڵەبانی) یارمەتی دام، کە یەکێك بوو لەدیارترین بەپرسەکانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق، و ئەوەدەمە پەنابەری سیاسیی بوو لەسوریا. پێکەوە کەوتینە لێکۆڵینەوەی پەیڕەوی ناوخۆی پارتەکەی و ئینجا بەراوردمان کرد لەگەڵ دۆخی کورد لەسوریا و سەرەنجام لەکۆتایی ساڵی ١٩٥٧ دا(خەونەکە)هاتەدی و(پارتی دیموکراتی کورد لەسوریا)بوو بەراستیی،کەئامانجەکانی بریتیی بوو لەبەرگریکردن لەناسنامەی نەتەوەیی کوردی سوریا و داواکردنی مافە کەلتووریی و ئیدارییەکانیان (لەچوارچێوەی سیستەمێکی دیموکراسیی بۆ هەموو وڵاتەکە).

ئەندامانی دامەزرێنەری پارتی دیموکراتی کورد لەگەڵ ئامادەبوونی دەقە قانونییەکان، کۆمیتەیەکی بەڕێوەبەری کاتییان هەڵبژارد وەك دەستەی باڵا کەبەرپرسیارێتیی پارتی لەئەستۆبگرێت تا بەستنی کۆنگرە و منیش هەڵبژێردرام بەسەرۆکی پارتی دیموکراتی کورد. دەستەی بەڕێوەبردن هەڵبژێردراو کەوتە وەرگرتنی ئەندام.لەماوەیەکی کورتدا و سەرەڕای لەبێژنگ دانێکی توند لەوەرگرتندا،ژمارەیەکی زۆر هاتنە ریزەکانییەوە،ئینجا بەنهێنیی دەستماندایە چاپکردنی بڵاوکراوە بەزمانی کوردی، هاوکات بەزمانی عەرەبیش بۆهۆشیارکردنەوەی کورد و ئاگاکردنیان لەدۆخی کورد بەگشتیی، بەتایبەت لەناوچە کوردییەکانی سوریا، وێڕای دۆخی وڵاتانی عەرەب و جیهان بەگشتیی.

ئێمە دژی یەکگرتنی سوریا بووین لەگەڵ میسر بەوشێوازەی ناسر سەپاندبووی و کەوتینە لەقاودانی لەبڵاوکراوە و بەیانەکانماندا و ئەو لێکۆڵینەوە ئابوورییەی لەبارەی سوریاوە پێشکەشم کرد دوای کۆنترۆڵی سوریا لەلایەن میسرەوە، بووە مایەی ئەوەی ئەندامانی پارتەکەمان بەرووونیی هۆکارەکانی لکاندنی سوریا لەلایەن میسرەوە ببینن.

وردموردە دەسەڵاتی میسر بەشێوەیەکی زەق دەرکەوت و نارەزایی سەریهەڵدا.

لەئەنجامی کارەساتی ئابووریی و پەنابردنی (عەبدولحەمید سەراج) بۆ ئەو دەسەڵاتە توندوتیژەی بەسەر سوریادا سەپێنرابوو و سەرتاسەری وڵاتی گرتبووەوە، میسریی و هاوکارەکانیان زۆڵانە بەدوای قۆچێکی قوربانیدا ئەگەڕان بۆ جلەوکردنی گیانی یاخیبوونی روو لەگەشەو ئەمەشیان لەگەڵی کورددا دۆزییەوە،بەتایبەت پارتی دیمۆکراتی کورد و کەوتنە تۆمەتبارکردنی بە (خۆفرۆشی) و (تێکدەران لەبەرژەوەندیی بێگانە) و (جودایی خوازان کەهەوڵئەدەن بەشێك لەخاکی سوریا دابڕن وبیلکێنن بەوڵاتێکی بێگانەوە).پێشتر پێیانئەوتن خەڵکانێکی میللیی کە بەعەرەبکردن قایل نین،ئێستا تۆمەتی(بەکرێگیراوانی هێزە بیانییەکانی دوژمنی عەرەبایەتی)یان دانە پاڵ.

کاتێك هەواڵی ئەوە گەیشتە دەزگای لێکۆڵینەوە(مباحث)، کەکوردی سوریا دژی سیاسەتەکانی ناسرن و لەبارەی چالاکییەکانی پارتەکەمانەوە زانیارییان پێگەیشت، سەرەنجام دوای ماوەیەکی کەم توانییان دەستبگرن بەسەرهەندێك لەبڵاوکراوەکانمان و ئاشکراکردنی ناوی هەندێك لەئەندامانمان، تەنانەت دیاریکردنی ناسنامەی بەرپرسانی کۆمیتەی بەڕێوەبەریی حەڵەب و پاش چاودێرییەکی چەند مانگە، لە١٥ ی ئابی ١٩٦٠ دا دەستگیریان کردن و راپێچیان کردنە ژێرزەمینەکانی ئەشکەنجەدان لەگەرەکی جەمیلیەی حەڵەب و سێ شەو و سێ رۆژ ئەشکەنجەیان دان بەفەلاقە.

یاساوڵەکان هێندە گوریسەکانیان توندئەکرد تانەچەقییە گۆشتی قاچییانەوە و قامچییەکانیش پێیانی کردبوو بەتۆپێکی بەشێوەیەکی ناماقووڵ هەڵتۆقیو ،جگە لە شەقی پۆستاڵەکانیان کەبەردەوام شلکوتی سەر وسك وئەندامەکانی زاووزێی هەڤاڵانمانیان ئەکرد، بەخێرایی شەکەتیان کردن و گیانی بەرگریی هەندێکیانیان تێکشکاند و پەیوەست بوونیان بەپارتی دیمۆکراتی کوردی سوریا و ناوی هەندێك لەهەڤاڵەکانیان درکاندبوو.

دەزگای لێکۆڵینەوە شاگەشکە بووبوو بەدۆزینەوەی (قۆچە ونبووەکە)، کەهۆکاری هەموو مەینەتییەکانی وڵات بوو! و کەوتە دواکەوتنمان و لەچەند رۆژێکدا زیاتر لە پێنج

هەزار کەسیان لەسەرتاسەری سوریادا دەستگیر کرد، کەمنالّی تەمەن ١٢ تا ١٥ سالّیشیان تێدابوو. ناویان تۆمارکردن و ئەشکەنجەیان دان و پاشان زۆربەیانیان ئازاد کرد.

سەبارەت بەخۆم ، لە ٨ی ئابی ١٩٦٠ دا دەستگیریان کردم.

من لەئەنجامی ئەو ڕێوشوێنە ڕەگەزپەرستییەی بەرامبەر بەکەسانی ناعەرەب لەزانکۆ پەیڕەو ئەکرا، وازم کارەکەم هێنابوو لەکۆلێژی پەروەردە و کۆمپانیایەکی بازرگانیی دەرمانم دامەزراندبوو بەبەشداری نوێنەرانی نزیکەی ١٠ شاری سەرتاسەری وڵات.

بەیانی ڕۆژی ٨ ی ئاب، وەك هەموو ڕۆژێك سەعات ٨ چووم بۆ ئۆفیسەکەم، و نزیکەی سەعات ١٠، کاتێك بەتەلەفۆن قسەم لەگەڵ پزیشکێك ئەکرد، سێ پیاوی کەتە بەبەرگی سڤیلەوە خۆیانکرد بەئۆفیسەکەمدا. یەکێکیان کەلەسەرۆکیان ئەچوو بەکەشوفشێکەوە لێی پرسیم:

-تۆ دکتۆر نورەدین زازایت؟

-بەڵێ.....بەهێمنی وەڵامم دایەوە، بەڵام هەستم بە تەزوویەك و لەرزەیەکی هەراسانکەر کرد لەپشتمدا.

وتی:

-ئێمە دەزگای لێکۆڵینەوەین....تەلەفۆنەکەت دابنێ و وەرە لەگەڵمان.

پێموت:

-ئەتوانم بەڵگەنامەکانتان ببینم؟

-ئێستا کاتی ئەوەمان نییە و بەزووترین کات ئەیبینیت. ئۆتۆمبیلەکەمان چاوەڕێتە.

بەڵام چونکە من جەختم کردەوە کەدڵنیابم سەربە هەواڵگرین، یەکێکیان کەتەمەنی ٣٠ ساڵێك ئەبوو و پێستێکی ئەسمەر و دەموچاوێکی ئاوساوی پێوەبوو، ناسنامەکەی دەرهێنا، ئیتر ناچارم بووم دوایان کەوم، لەگەڵ ئەوەشدا داوام لێکردن بوارم بدەن هەندێك ڕێنمایی بدەمە هاوبەشەکەم و چەند تەلەفۆنێکیش بکەم.

-چەند خولەکێکت ئەدەمێ تا هەندێك پارە بێنیت و هیچی تر.

لەرێی ئەو هەڤاڵانەمەوە کەپێشتر گیرابوون و ئازادی کرابوون، ئەمزانی باشتر وایە کەللەرەقی لەگەڵ ئەو پیاوانە نەکەم، کەبەتایبەت هەڵبژێردراون بەهۆی بەهێزیی و کورت بینیی و درِندەییانەوە،بۆیە چەندسەد لیرەیەکی سوریم هەلگرت و دوایانکەوتم.

ئۆتۆمبیلێکی(فۆکس واگن)م بینی لەبەردەرگەی تەلارەکەمان، کەشۆفێرەکەی ئێمەی بینی بەپەلە دەرگەکانی کردەوە. کاتێك ئۆتۆمبیلەکە لای راستی گرت، دڵنیابووم راستەوخۆ راپێچی زیندانی سەربازیی(مەزە)م ئەکەن.ئەو زیندانەسەربازییە ترسناکەی بە (باستیلی سوریا) ناسرابوو. ئۆتۆمبیلەکە بەبەردەم ئامادەیی لۆجستیدا تێپەرِبوو وپێچی کردەوە بۆلای چەپ و رێگەی دیمەشق-بەیروتی گرتە بەر، کەهەر ئەیبردینەوە بۆ(مەزە). بەڵام کەئاراستەی ناوەندی شاری گرتەبەر هەستم بەدڵنیایی و هاوکات نیگەرانی کرد و لەخۆم پرسیی ئاخۆ بۆ کوێم ئەبەن؟! بۆ کۆشکی دادوەریی لای دادوەریی لێکۆڵینەوە، یا بۆ بەندیخانەی ناوەندیی، قەڵا کۆنەکەی سەڵاحەدین، یا بۆ ئۆفیسەکەی عەبدولحەمید سەرِاج؟

کە لەپردی ڤیکتۆریا پەرِینەوە ئەگەری دوایی زیاتر پێشبینیی کراوبوو، بەڵام هەرکە لەئۆتۆمبیلەکە دابەزین دەرکەوت من هەڵەم و لەجیاتی ئەوەی رووبکەینە سەرا، بردیانە بەرِێوەبەرێتیی گشتیی پۆلیس، بەرەو نوسینگەکانی و زیندانی راگرتنەکەی کەدیوارەکانی بەردین و ئەستوور بوون و شیشەکانی زەبەلاح. لەوێش دایانمە دەست دووخەتدار(عەریف)ێکی پۆلیس و زەرفێکی زەردیان دایە دەستی ولەدۆسیەیەکی بچووکدا ئیمزایان پێکرد. کاتێك پاسەوانە(فریشتەییەکانم) جێیان هێشتم، پۆلیسەکە، بەبەرگیی فەرمییەوە و نزیك لەپایزی تەمەن،بەزەردەخەنەیەکی بەسۆزەوە تەماشایەکی کردم:

-بەدەموچاوتدا لەترسناك ناچیت بۆیە ناتپشکنم، بەڵام زۆر بەداخەوە ناچارم بەندت بکەم.

دوای بێدەنگ بوونێکی کورت بە تۆنێکی باوکانەوە وتی:

-گوێ مەدەرێ، زۆر لێرە نامێنیتەوە....

پاشان دەستی برد بۆ هێشوویەکی گەورەی کلیل کەبە قایشەکەیدا هەڵواسرابوو و کەمێك دەرگە قورسەکەی زیندانی کردەوە، و خۆم لەرێرەوێکی تەسکدا بینییەوە کەئەیروانی بەسەرقاوشەکاندا. ئەوژوورەی بۆمنیان دانابوو دووجێخەو ویەنجەرەیەکی پچکۆلەی بەرزی تیابوو. عەریفەکە کەسمێڵێکی زلی پێوەبوو، پێش داخستنی دەرگاکەبەزاراوەیەکی دیمەشقیی نایاب پێیوتم کە ئەگەر ویستم نان بخۆم، ئامادەیە حەزم لەچی بێت لەچێشتخانەیەکی نزیکی گرتووخانەکە بۆم بهێنێت، بەڵام وەڵامم دایەوە کە برسیم نییە....ئەویش کلیلە زلەکەی لە قفڵەکەدا بادا و لەژوورەکەدا بەجێیهێشتم،کەسەرەڕای خۆری گەشی سەر شووشەی پەنجەرەکە بەئەستەم رووناکیی تیابوو.

هەستمکرد بەگرژبوونی گەردنم وتاڵیی لەقورگمدا وئازار لەگورچیلە و بڕبڕەی پشتمدا، وەك ئەوەی گیرەیەکی زەبەلاح لەنێوان ددانەکانیدا بمگوشێت و بیەوێت ناوقەدم بپلیشێنەتەوە. تۆبڵێیت ئەم هەستە، ترسی زۆرم بێت لەتاریکیی ژووری زیندانەکە یا هەست کردنە بەرووداوی کارەساتێکی گەورە؟ تۆبڵێیت هی ئەوە بێت کەبیرنەکەمەوە ئەمجارە لەم قۆرتە رزگارم نابێت، یاهەست کردنە بە نەنگیی؟

بیری زۆر هاتن بەمێشکمدا و بوونە هۆی گرژبوونی ماسولکە و دەمارەکانی جەستەم، بێگومان دڵنیا بووم گیرانەکەم پەیوەندیی پتەوی هەیە بەپارتی دیموکراتی کوردی سوریاوە، بەڵام هیچم نەئەزانی سەبارەت بەچارەنووسی هەڤاڵان و نیگەرانیان بووم، هەرچەندە هاتنی هەواڵیان زۆری نەخایاند.

پاشنیوەڕۆ لەدرزی دەرگەی هۆڵێکی گەورەوە کەپڕبوو لەبەندیی، سەری (عوسمان سەبری)م بینی، ئەو تێکۆشەرەی لەشەستەکانی تەمەنیدا بوو و بەشداری دامەزراندنی

پارتی دیموکراتی کوردی سوریا و ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەریی کاتیی بوو. ئەوەم لاگەڵاڵە بوو،ی دەزگای لێکۆڵینەوە هەڵمەتێکی پشکنینی ئەنجامداوە و گەلێك لەهەڤاڵانمانی دەستگیر کردووە.

نزیکی سەعات ۹ی شەوی یەکەم رۆژی گیرانەکەم، پۆلیسەکانی بەیانی هاتن بەدوامدا و بردیانم بۆئاپارتمانەکەم و کەوتنە پشکنینی، هەرچەند بەتووڕەییەوە زۆرگەڕان بەڵام هیچیان نەدۆزییەوە ببێتە مایەی تێوەگلانم، بۆیە دیسان بەهەڵچوونەوە خستمیانەوە ناوفۆکس واگنەکە وبردیانم بۆئۆفیسی سەرەکیی هەواڵگریی لەبناری شاخی(قاسیون) و یەکێك لەفەرماندە گەورەکانیان پێشوازیی کردم و دوای چەند خولەکێکی کەم فەرمانی دا بمبەن بۆ ئۆفیسەکەی خۆم.

لەوێش هەمووکاغەز و کتێب وبەڵگەنامەکانیان دابەسەریەکدا، ئەیانویست بەڵگەیەکی تێوەگلانم بدۆزنەوە، تەنانەت ناو مقەبا و قتووی دەرمانەکانیش گەڕان، بەڵام بێسوود بوو، لەبەرئەوەی شتێکیان بۆ نەدۆزرایەوە تووشم کات، سەرۆکەکەیان ئاوڕی دایەوە بۆ دەستوپێوەندەکانی و بەتۆنێکی دەستکردی مانادارەوە وتی:

-پێم نەوتن هەر بەوشێوەیە ئەبێت کە دیومانە؟ ناتوانین هیچ بەڵگەیەکی تێوەگلان لای سەرکردەی رێکخستنە نهێنییەکان بدۆزینەوە و ئەبێت لای دەستوپێوەندەکانیان و سەرکردەکانی خوارەوە بۆی بگەڕێین، وەك ئەوەی لەحەڵەب کردمان.

ئەم وشانە هێنامییە سەرهێڵ(خەت) و ئەومەتەڵەی بۆ ئاشکرا کردم کەلەبەیانییەوە سەرسامی کردبووم،دیارە هەندێك لەوهەڤاڵانەمان کەدەستگیرکراون، دەمرەشیی (ئیعتراف)یان کردووە....

نزیکی سەعات ۱۱ی شەو بردیانمەوە بۆ بەندەکەم و سێ شەوی لێمامەوە لەسەر جێگەیەکی تەختەی بێ راخەر و پێخەو، رۆژی چوارەم لەگەڵ عوسمان سەبری گوێزرایەنەوە بۆ حەڵەب.

سەرنجمدا ژێرزەمینەکەی موخابەرات لەوێ لەبیر قووڵ ترەو هەستم کرد ٥٠ پلیکانەیەك چوومە خوارەوە. لەناوەوە پێکهاتبوو لەنێو دەرزەن قاوشی جەنجاڵ. ئەندامانی پارتیمان کەزۆربەیان گەنج بوون،هەوڵیانئەدا بەرووەمدا بخەنن و هەندێکیشیان شادمانیی راستەقینەی خۆیان دەربڕی وەك ئەوەی گەیشتنی من مزگێنی بەهاناوەچوونیان بێت لەم دۆزەخە،هەندێکیشیان بەتوندی سەریان بادەداو دەستیان کردبووەوە بەرەو بنمیچەکە، وەك ئەوەی بڵێن:

-بۆ تووڕتان داینە ئەم قۆرتەوە؟!

نەمتوانی کەسیان بدوێنم چونکە لەراڕەوەکەوە راستەوخۆ چوومە ئۆفیسی ئەفسەری لێکۆڵینەوەوە.

ئەفسەرێکی گەنج بەربەرگی فەرمییەوە، کەبەکەشخەییەوە دوو ئەستێرە بریقەدارەکەی سەرشانی پیشان ئەدا، هاواری کرد:

-ئاه...ئەوە دکتۆر خۆیەتی! سەرنجام کەوتە بەردەستمان!

پێنج یاساوڵی قامچی بەدەست وەڵامیان دایەوە:

-بەڵێ، کاتێك نەتەوەی عەرەب خەبات ئەکات لەپێناوی یەکێتیی مەزنی خۆیدا و لەچەندین بەرە لەجەنگدایە، کەچی ئێوە پیلانەکانی ئیمپریالیزم و زایۆنیی ئەنجام ئەدەن و لەپشتەوە خەنجەرمان لێئەدەن و لەرێکخراوێکدا یەکئەگرن کەهەوڵ ئەدات بۆ دابڕینی بەشێکی خاکی کۆماری یەکگرتووی عەرەب بۆئەوەی بیلکێنن بەوڵاتێکی کوردی، وڵاتێکی بێگانەوە!

وەڵامم دایەوە:

-بەڵام ببوورە ئەفسەری بەرێز، تۆمەتەکانتان لەراستیدا هیچ بنەمایەکی نییە و هەموو ئەوەی ئێمەئەیکەین کاردنەوەیە بەرامبەر سیاسەتی شۆڤێنیی بەعسانەتان بەرامبەر گەلی کورد لەسوریا و نەتەوەی کورد بەگشتیی. سەرۆك ناسر رۆژانە عێراق و

ئێران و تورکیا تۆمەتبار ئەکات بەدژایەتیی کۆماری یەکگرتووی عەرەب، بەڵام هاوکات بەردەوامە لەچەوساندنەوەی کورد. گەر سەرۆك ناسر بەڕاستیی ئەیەوێت وەك ئەڵێت، رووبەرووی سیاسەتی(دژەعەرەب) بێتەوە بەتایبەت سەبارەت بەتورکیا و ئێران، ئەوا ئەبێت لەگەڵ کورد هاوپەیمانیی بکات و ئاڵای برایەتی کورد و عەرەب بەرز بکاتەوە و بەهیچ شێوەیەك دژایەتی کورد نەکات.

ئەفسەرەکە روویکردە پیاوەکانی و وتی:

-نا ؟! بینیتان دکتۆر لەچ سووچێکەوە قسەمان لەگەڵ ئەکات؟! باشە لەوبارەیەوە لەگەڵ بەرپرسەکانم قسەئەکەم و تائەوکاتەش بیبەنە ژوورێکی چەپەك و پێویستییەکانی نووسینی بدەنێ و فەرمانی پێبکەن راپۆرتێك لەسەر پارتی دیمۆکراتی کورد لەسوریا بنووسێت و تیایدا ناونیشانی هەموو ئەندامەکانی دیاری بکات.

پێم وت:

-تەنیا بۆتان روون ئەکەمەوە پارتی دیمۆکراتی کوردی سوریا چییە و بۆ دامەزراندووە، بەڵام ئەندامەکانی، بەهیچ شێوەیەك هیچیان لەبارەوە نازانم.

لەبری ئەوەی ملکەچی فەرمانەکانیان بم، گوێمدایە دەنگەدەنگی ناو گرتووخانەکە، و گوێم لێبوو یاساوڵەکان لەگەڵ ئەشکەنجەتێکۆشەرەکانمان ئەخورن تا دانپیانانی تەواو بنووسن و بیدرکێنن کەلەرێزی پارتی دیمۆکراتی کوردی سوریادان و لایەنگری هێڵی سیاسیی ئەو پارتەن و ناوی هەڤاڵ و لایەنگرەکانیان ئاشکرا بکەن. لەنەرەنەر و هەڵچوون و جنێودان و هەڕەشەی یاساوڵەکانەوە لەوەگەیشتم، کەبڕوا بەقسەکانیان ناکەن:

-هیچ شتێکمان لێ مەشارنەوە،ئەگینا ئێسکتان ئەهاڕین و واتان لێئەکەین لەژێر زەمینەکانی (مەزە)دا بۆگەن بکەن!

دوای ئەوەی زانیان قیژەقیژەکەیان کاریگەر نییە،دەستیاندایە ئەشکەنجەی جەستەیی، گوێم لەدەنگی بێکۆتایی زللە و قامچییەکانیان بوو، کاتێك لەوەش نائومێد بوون

یاریدەدەری سەرۆکی ژێرزەمینەکە بەیاساوڵەکانی وت بڕۆن فەلاقە بهێنن، ئەم ئامرازە دڕندانە و کۆنەی ئەشکەنجە، گیراوەکانی هێنایە گریان و هاوار لەئازارەکانیان، بەڵام نەیتوانی قسەیەکی تریان لێدەربهێنێت:

-ئێمە ئەندامی پارتی دیمۆکراتی کوردی سوریاین و لایەنگریی سیاسەتەکانین، بەڵام داوای هیچی ترمان لێمەکەن و دەستدرێژیی مەکەنە سەرمان.

-ناو....ناو...ناو...یاریدەدەرەکە بەهەڵچوون و لووتبەرزیی و بەدخولقییەوە ئەیقیژاند بەسەریاندا.

-ئاە؟ ناو؟باشە پێتان ئەڵێین.... ئەشکەنجەدراوەکان ئەیانوت.

دوای چەند خولەك گوێم لێبوو یاساوڵەکان لەتووڕەییدا ئەتەقینەوە:

-بەڵام ئەمە ناوی ئەوانەیە کە پێشتر دەستگیرمان کردوون و لەبەردەستماندان! ناوی هاوکارەکانتان بڵێن کەلەدەرەوەی زیندانن، بە ڕیشمان مەخەنن سەگبابانە!

گیراوەکان وەڵام ئەدەنەوە:

-ئێ ئێمە ناوتان ئەدەینێ و ئێوە هەر جنێومان پێئەدەن! بەڕاستی نازانین لەسەر کام قاچ هەڵپەڕین!

یاریدەدەرەکە پێش ئەوەی لەپیاوەکانی بخوڕێت تائەم گەنجە کەللەرەقانە بەرنەوە بۆ قاوشەکانیان، ڕوویکردە گیراوەکان و پێی وتن:

-ئەم ئێوارەیە فێری سەماتان ئەکەم!

ئەم هەڕەشەیە نیگەرانی کردم و دڵمی گوشی،ولەخۆم ئەپرسی، ئاخۆ ئەو ئەشکەنجەیە چیبێت کەپەنای بۆبەرن تابەندەکان ناچاربکەن ناوی ئەندامانی پارتیمان ئاشکرابکەن؟

کاتێك پاسەوانەکان دەنگانێکی پاشنیوەڕۆ، لێیان پرسیم داخۆ پارەم پێیە و حەزم لێیە خواردنم بۆ بێنن، لەخۆوە وەڵامم دانەوە:

-نا، نا....

سەعات ٩ی هەمان شەو لیوتینانت(ملازم) یەکەمەکە، لەگەڵ پیاوێکی بچکۆلەی لاوازی پەنجاساڵەی دەموچاو داقوپاوی روومەت چرچی قژ ڕووتاوە، گەڕایەوە. ئەو ترسەی بەرووخسارییەوە دیاربوو و جلە شیتاڵکراوەکانی و دەموچاوی ئاوساوی، نیشانەی ئەوەبوو ئەشکەنجەدراوە.

دوای ئەویش بەماوەیەکی کەم (کەنعان عەگید) هات ژوورەوە، ئەو گەنجە کوردە چوارشانەیەی خەڵکی قامیشلی، بەمشتی نوقاوەوە بۆم خەنییەوە، هەرچەندە سیمای ماندوو و شوێنەواری لێدان بەئاشکرا بەجەستەیەوە دیاربوو.

ئەفسەرەکە قیژاندی:

-کەنعان! ئەم بەیانییە دڵنیابووین کەجەستەت بەرگە ئەگرێت و نە قامچی و نەفەلاقە ناتوانن ناچاری دەملێدان(ئیعتراف)ت بکەن. بەڵام ئێستا بەوهێزەی خۆت یارمەتیمان ئەدەیت بۆناچارکردنی ئەم دوژمنە نەگبەتەی لەبەردەمدا هەڵئەلەرزێ. کوڕە پانزە ساڵەکەی هەڵاتووە بۆ فەلەستینی داگیرکراو. ئێمە ئەو هەواڵەمان بیستووە، بەڵام ئامادە نییە ئەو تۆڕەمان بۆ ئاشکرا بکات کەیارمەتی داوە لەدەربازکردنی کوڕەکەی لەحەڵەب و لەم وڵاتە. گەر توانیت بەهێزی بازووەکانت ئەو نهێنییەی پێ بدرکێنی، ئەوا داوای هیچی ترت لێناکەین و وازت لێدێنین بچیتەوە ناو کەسوکارت. یاڵڵا دەی! خۆت بدە بەسەریدا و دەست لەهیچ شوێنێکی مەپارێزە، تا ئەو ڕێگە و ئامڕازانە ئەدرکێنێ کە هاوکارییان کردووە بۆ دەربازکردنی کوڕەکەی بۆ لای زایۆنییەکان.

کەنعان لەجێی خۆی نەجوڵا،بەڵکو بەبەزەییەوە تەماشای رووخساری ئەوپیاوە هەژارەی ئەکرد کە پەلەقاژەی ئەوەی بوو دەموچاوی لەناو شان و قۆڵیدا بشارێتەوە، بۆ پاراستنی لەو زەبرانەی پێی وابوو کەنعان تێی ئەسرەوێنێ.

ئەفسەرەکە بەتووڕەییەوە نەڕاندی بەسەر کەنعاندا:

-ئەوە چییە کەنعان؟! چاوەڕێی چیت تا دەست پێبکەیت؟ گوێت لێم نییە ؟!

کەنعان بەهێمنیی وەڵامی دایەوە:

-باش گوێم لێت بوو، بەڵام هیچ هۆیەك نابینم بۆئەوەی خۆم بەم بەسەر پیاوێکدا لەتەمەنی باوکمدا کە هیچ ئازارێکی نەداوم. پیاوێك کەخۆی خەریکە لار ئەبێتەوە.

-من فەرمانت ئەدەمێ کە هێزی بازووت بخەیتە گەڕ تا ئەم نیشتمان فرۆشە، ئەم زایۆنییە چەپەڵە، کوڕی قەحبەیە بهێنێتە قسە.

لاوە کوردەکە وەڵامی دایەوە:

-گەر حکومەتەکانی یەك لەدوای یەك، مرۆڤانە لەگەڵ جولەکەکانی سوریا رەفتاریان بکردایە، ئەودەم هەستیان ئەکرد هاونیشتمانیی راستەقینەن و بیریان لەوە نەئەکردەوە ژیانیان بخەنە مەترسییەوە تا لەم وڵاتە هەڵێن.

ئەفسەرەکە لێی راپەڕیی و نەڕاندی:

-چۆن ئەوێریت بەرگریی لە زایۆنییەکان بکەیت و وانەی سیاسیمان فێربکەیت؟! بەم قسە زلانەت ئامانجە راستەقینەکانی خۆت و پارتی دیموکراتی کوردی سوریامان بۆ ئاشکرا ئەکەیت. ئێوە ئەتانەوێت پارچەیەکی خاکی سوریا دابڕن و بیلکێننە ئەو وڵاتەی ئاواتتانە درووستی بکەن. کەواتە ئێمە راست ئەکەین کە کورد بە(ئیسرائیلی دووەم) ئەشوبهێنین و رێوشوێنی پێویست ئەگرین بۆ فلیقاندنەوەی هەوڵەکانتان، کەهێشتا گەرایە.

دوای کەمێك نەڕاندی بەسەرماندا:

-ئێوەش، ئەبینن چۆن ئەتوانین دەمی ئەم دووبەرازە زایۆنییە بکەینەوە، ئەم کوردە و ئەو جولەکەیەش.

دووان لەپیاوانی ئەفسەرەکە هەریەکەیان لەسەرێکی ڕاڕەوەکە وەستا،ئەفسەرەکە فەرمانی دا بەکوردەکەو جولەکەکە کەبەئاراستەیەکی جیاواز بەرەو لای برۆن، ئەوانیش ملکەچی فەرمانەکەی بوون، لەوێدا لۆزەنەرەکان قامچییەکانیان بەرزکردەوە و کەوتنە لێدانی سەر و دەموچاو و گەردن و مل و سنگ و قۆڵیان. ئەشکەنجەدراوەکان تەنیا یەك

ڕێگەیان لەبەر بوو بۆ خۆ دەربازکردن، ئەویش ڕاکردن بوو بەرەو ئەوبەر کە لۆزەنەرێکی تر چاوەڕێی ئەکردن و قامچییەکان توندتر جستەیانی ئەگەست.

ئەم دیمەنە زیاتر لە بیست خولەکی خایاند و سەرەنجام جولەکەکە لچی قاش بوو و خوێن فوارەی بەست و تێکەڵاو لەگەڵ خوێنی لووتی بە ڕیشیدا ئەهاتە خوارەوە و کراسە شیتاڵ و پانتۆڵەکەی خوێناوی کرد و زەوی ڕاڕەوەکەی سوور کرد. ئەو پیاوە پیرە تەواو کەنەفت بوو و بەناستەم ئەیتوانی بجووڵێ، ناوچاوانی قاش بوو و هەموو دەمووچاوی تێك شکا و پێستی لاملی داماڵرا.

پاشان کاتێك ئەفسەرەکە باوەڕی هێنا کەئەم لێدانە گرێی زمانی ئەکاتەوە، دیمەنی ئەشکەنجەکەی ڕاگرت و لەجولەکەکەی پرسی:

-ها، ئیلیاهۆ، چاوەڕێی ڕوونکردنەوەی تۆم لەسەر چۆنییەتی ڕاکردنی کوڕەکەت. پێنج خولەکت ئەدەمێ تا بیربکەیتەوە و دوای ئەوە شێوازی توندتر بەکاردێنم تا قسەبکەیت.

ئیلیاهۆ وەڵامی نەدایەوە، بەڵکو بەساردییەکەوە سەیری خوێنەکەی خۆی ئەکرد کە زەوییەکەی سوور کردبوو. پێنج خولەك تێپەڕی و ئەفسەرەکە چاودێریی کاتژمێرەکەی ئەکرد، بەتووڕەیی و دان جیڕکردنەوە پێی وت:

-هیچوپوچ گاڵتەت بەو دواهەلە هات کە پێم بەخشیت. تۆ مردنت پێ باشترە، باوابێت ئەوا سزات ئەدەین بە مردن!

دوو لۆزەنەر کەتا ئەو ساتە لەسایەدا بوون، ئیلیاهۆیان پاڵخست و وەك کیسە لمێك بەزەوییەکەدا پانیان کردەوە و بە پێلەقە کەوتنە لێدانی سەر و سنگ و سێبەندە و سکی ئەو نەگبەتە، کە بەبێدەنگی و خەمساردییەکی مەزنەوە خۆی لەبەردەم زەبری پۆستاڵەکاندا ڕاگرتبوو. لێدانەکە ڕاگیرا و ئەفسەرەکە لە ئیلیاهۆ نزیك بووە و لێدانی دڵی پێوا و پێڵووە داخراوەکانی هەڵبڕی.

ورتەیەکی لەگەڵ یاریدەدەرەکەی کرد:

-هەر ئێستا تەلەفۆن بکە بۆ بنکە و پێیان بڵێ یەکسەر برینپێچێك بنێرن.

فەرمانی بەپیاوەکانی دا بمانبەنەوە بۆ ژووری زیندان و تەنیا کەنعان کە خوێنی لێ ئەڕۆی و ئیلیاهۆی لەهۆش خۆچوو لەدەرەوە بێڵنەوە.

بەدرێژایی شەو چاوم لێك نەنا، بۆ ڕۆژی دوایی زانیمان کەنعان و ئیلیاهۆ، کە دۆخی تەندروستیی،موخابەراتی نیگەران کردبوو، براون بۆ نەخۆشخانەی سەربازیی حەڵەب.

-ها، ئەی ڕاپۆرتەکەی تۆ دکتۆر؟

لەراپۆرتەکەدا نووسیبووم:

(( پارتی دیمۆکراتی کوردمان لەسوریا دامەزراند، چونکە لەساڵی ١٩٤٩ وە حکومەتە سەربازییە یەك لەدوای یەکەکان دیمۆکراسییان لەسوریا ژێرپێ ناوە و وردە وردە مافەکانی کوردیان سڕیوەتەوە، لەساڵی ١٩٥٥ بەدواوە کاربەدەستانی وابەستە بە شۆڤێنیزمی بەعسەوە کەوتنە شکاندنی(کاسێتەکانی) مۆزیکی کوردی لەچایخانە و چێشتخانەکانی ناوچە کوردنشینەکەدا و ئەو کوردانەشی تاوانبار کرد کەکتێبی کوردییان پێ نەگیرا، و ئەیخستنە زیندانەوە. یەکێتیی میسر لەگەڵ سوریاش نەك ڕێگریی نەکرد لەم قەڵاچۆ کەلتوورییە، بەڵکو مامەڵەی فاشییانە و سەرکوتکەرانەی زیاتر چەسپاند. ئەمڕۆکە یەك ئەفسەری کورد لەسوپادا نەماوە و یەك کارمەندی دیاریش لەبەڕێوەبردندا نییە، نەمامۆستا و نەپۆلیسی کورد لەناوچە کوردییەکاندا نەماون. ئێستا ئیتر ناوێرین بەزمانی خۆمان بدوێین و ئایندەی تاریکمان هانی یەکگرتنمان ئەدات. ئەم هۆیانە هاندەربوون تا پارتی دیمۆکراتی کوردیی لەسوریا درووست بکەین)).

دوای خوێندنەوەی(داپیانانەکەم)ئەفسەرەکە سەری لەقاند و هەراسانیی پێوە دیاربوو.

-جگە لە هەڵبستن و تۆمەتی درۆ هیچت نەنووسیوە. ئەمانەوێت لایەنی تێکدەرانە و دژە عەرەبی چالاکییەکانت بدرکێنیت. ئەمانەوێت دەم بدەی لەوانەی هاوکارتن و تاوانەکەت بسەلمێنیت. وا نەبێت دادگەکانمان ناتوانن بتبوورن.

بەجەختەوە پێم وت:

-یەك وشە لەراپۆرتەكەم ناگۆڕم و هیچیشی ناخەمەسەر.

لەكاتێكدا ئەیویست بەخێسە بمترسێنێ، وەڵامی دامەوە:

-ئەیبینین!

فەرمانی كرد بمبەنەوە بۆ ئەو ژێرزەمینە بۆگەن و چەپەك و پڕ سیسركەی پێی ئەڵێن ژووری زیندان.

درەنگانێكی هەمان ڕۆژ ئەفسەرەكە دووبارە بانگی كردم و بەڵگەنامەیەكی بەدەستەوە بوو كەبەرۆنیۆ چاپ كرابوو و پرسیاری ئەوەی كرد كەئایا من نووسیومە. چاوێكم پیاخشاند و بینیم تەرجەمەی كوردیی بەشێكی كتێبكی ئینگلیزییە بەناونیشانی (Kurdistan dividid Country).

بەرەقی پێی وتم:

-ئێمە دڵنیاین كەتۆ ئەم دەقەت نووسیوە، لەبەر ئەوە نكۆڵیی لەم ڕاستییە مەكە.

-ئەزانم بابەتەكە چییە و بەهیچ شێوەیەك مەبەستم نییە لەوبارەیەوە چەلەحانێ بكەم، بەڵام لەڕاستیدا نازانم هۆی ئەم بایەخەتان بەو دەقە چییە؟

- ئەم نووسینە ئامانجەكانت ڕكوڕاست ڕوون ئەكاتەوە. ئەمڕۆ تەنیا داوای هەندێك مافی كەلتووریی و ئازادیی دیمۆكراسیی ئەكەیت. ئەمەش تەنیا قۆناغێكی ستراتیژەكەتە و لەگەڵ بەدیهاتنی ئەوئامانجە،ئەوا لەهەموو ئەووڵاتانەی بەقسەی ئێوە گوایە(كوردستان)یان لەبن دەستدایە، هەوڵ ئەدەن بۆ بڕینی قۆناغی دووەم و بەدیهێنانی خەونەكەتان و دروستكردنی كوردستان. بۆ گەیشتنە ئەم ئامانجەش بەشێك لەسوریا یاباشتر بڵێم لەكۆماری یەكگرتووی عەرەب دائەبڕن، بۆ لكاندنی بەو وڵاتەی بەنیازی دروستكردنین. بابزانیت هەڵگرتنی ئەم بیرانە و هاندانی خەڵك بۆ بەدیهێنانی، لێپرسینەوەی قانونیی هەیە و لەوانەیە بەوهۆیەوە توندترین سزا بدرێیت.

-جەنابی ئەفسەر، مەسەلەکە لەوە سادەترە. چونکە یەکەم ئەو دەقەی وەك تاوان سەیری ئەکەیت تەنیا تەرجەمەیە و ئامادەم ئەو کتێبەت بۆ بهێنم کە لێوەی وەرگیراوە، پاشان ئەم دەقە بەفراوانیی بلاّوئەکراوەتەوە. بێگومان یەك کۆپی زیاترتان بۆنادۆزرێتەوە، ئەویش لای (رامز حۆزۆ)، بەرپرسی حەڵەبمان، یەکەم کەس کەلەلایەن فەرمانگەکەتانەوە دەستگیرکرا و ئەشکەنجە درا. ئەم دەقە بەهیچ شێوەیەك ناشێت ببێتە تۆمەتێك دژمان و من خۆم هەموو ئەنجامەکانی لەئەستۆ ئەگرم.

ئەفسەرەکەبەبێزارییەوە وتی:

-حوکمەکە پەیوەستە بەدادگەوە، سەبارەت بەمنیش گونجانێکی تەواو ئەبینم لەنێوان ئامانجەکانتان بۆ درووستکردنی ولاّتێکی گەورەی کورد و رەفتاری پارتەکەتان، ئەگەرنا پێم نالّێیت چۆن سەرباز و پۆلیس لەرێکخراوەکەتاندان؟

وەلاّمم دایەوە:

-وەك خۆم، وەرگرتنی ئەندام ئەرکی من نییە، گەرنا بێ هیچ دوودلّییەك سەربازم وەرئەگرت وەك ئەندامی پارتی دیمۆکراتی کوردی سوریا، لەبەر هۆیەکی سادە، ئەویش‌هەموو پارتە سیاسییەکان ئەوەیان کردووە و ئەیکەن. ئێ سەربازانی کوردیش کاتێك ئەبینن هاوکارەکانیان ئەچنە ریزی ئەوپارتانەی بانگەشەی شۆڤینیزمی عەرەبی ئەکەن،لەخۆرِا یابەهاندان،بەدوای رێکخراوێکی کوردیدائەگەرِێن کەتوانای رووبەرِوو بوونەوەی فاشیزمی عەرەبی هەبێت.

ئەفسەرەکە بەسەرسامییەوە قیژاندی:

-تۆ ئاگات لەدەمتە چی ئەلّێیت؟ نەتەوەپەرستیی عەرەب بەهیچ شێوەیەك پەیوەندیی بەفاشیزمەوە نییە.

-نەتەوەپەرستیی، بەدرووشمی یەکێتیی عەرەب کەبەعس بانگەشەی بۆ ئەکات و ناسر ئەمرِۆ جێبەجێی ئەکات، چ نییە جگە لەفاشیزمێکی رووت، چونکە هەولّئەدات بۆ

تواندنەوەی ئیتنیك و میللەتە بچووکەکانی تر کە لەجیهانی (بەناو عەرەبی) دا ئەژین، نەگەرنا، ئەی بۆکورد،بەتایبەت،خراوەتە ژێرسیاسەتی تواندنەوەی نەتەوەیی زۆرەملێ وجیاکاریی. خۆشتان ئەزانن کەکوردێك هەرهێندەی بڵێت کوردم و بانگەشەی ئەوە بکات کەگەلی کورد مێژوو و کەلتووری خۆی هەیە، لەسوریا بەتاوان دائەنرێت.

ئەفسەرەکە وتی:

-ئەی بەڵێ، گەر بانگەشەی ئەوەتان کرد کەسەر بەمیلەتێکی تایبەتن، ئەکەونە بەر لێپرسینەوەی قانون کەبەتوندیی جیاکاریی رەگەزیی سزا ئەدات، لەکاتێکدا سوریا وڵاتێکە کە تەنیا عەرەبی تیا ئەژی.

-ئەی ئەمەرەوایی دان نییە بەقەڵاچۆکردنی رەگەزیی،بەواتا فراوانەکەی دەستەواژەکە؟

-ئەوە لەدادگە روون بکەرەوە. کاری من ئەوەیە لەئامانج و چالاکییەکانی تۆ ئاگاداریان بکەم.

لێکۆڵینەوە لەگەڵ بەندییەکانی تر بەردەوام بوو، سەرەڕای ئەشکەنجە و سوکایەتیی و هەڕەشە هیچیان لێ هەڵنەکرێنرا. کاتێك دەزگای لێکۆڵینەوە هیچ بەڵگەیەکی تاوانباریی دەستنەکەوت،بڕیاری ئازادکردنی بەشێکی هەڤاڵانیاندا کەهەندێکیان گەنجی تەمەن بیست ساڵ کەمتر بوون و تەنیا ٣٢ بەندییان هێشتەوە.

رۆژی شەشەم رێیاندام لەژوورەکەم بێمەدەرەوە و تێکەڵاوی بەندییەکانی تر ببم.

زۆربەی تێکۆشەرەکانمان لاو بوون، رەشید حۆرۆ، بەرپرسی پارتی لەحەڵەب، پێکانی ئاوسا بوون و هەردووقاچی پێچرابوون و بەئاستەم ئەیتوانی سەرپێکەوێ، دەموچاوی زۆربەشیان ئاوساو و شین بووبووەوە، لەنێوانیشیاندا کەنعان، برۆی دووڕابووەوە و دووپەنجەی لەگەڵدا بوون. بەقسەی ئەو برینپێچانەی سەروکاری ئیلیاهۆیان کردبوو، ئەونەگبەتە هێشتا بێهۆش بوو.

دوای ئەوە بەپانزە رۆژ گوێزراینەوە بۆ زیندانی سەربازگەی حەڵەب کەدیواری بەرز دەوری دابوو و بەسەر شارەکەدا ئەیڕوانی، ئەو زیندانە لەقەڵایەکدا بوو و خزاندیانینە

چەندژوورێکی تاریك وشێدار وبۆگەنەوە و هەر چوارپێنجێکیان فڕێدانیە ژوورێکەوە. خۆشبەختانە ڕۆژانە،بەیانیان وپاشنیوەڕۆ ڕێیانئەدایین بچینە حەوشەکە،بەمەش بواری هەناسەدانێکمان هەبوو.

پاش چەند ڕۆژێکی کەم سواری چەند ئۆتۆمبیلێکی سەربازییان کردین و ڕاپێچی شاریان کردین بۆبەردەم فەرمانداری لێکۆڵینەوەی سەربازیی و من یەکەم کەس بووم برامە بەردەمی.فەرماندار هەمان ئەوشتانەی دایەوە بەڕوومدا کەپێشتر ئەفسەرەکە پێی وتبووم،بەتایبەت جەختی زۆری کرد لەناوەڕۆکی بەشی یەکەمی کتێبی(کوردستان، وڵاتێکی پارچەکراو- **Kurdistan،divided country**).

بەخۆشی و شادییەکەوە ڕووی تێکرم:

-کەواتە ئاوا! ئەتانەوێت پارچەیەك لەسوریا دابڕن بۆ پێکهێنانی کوردستانی گەورە؟ ئەیدرکێنیت کە تۆ نووسەری ئەم دەقەیت؟

بۆم ڕاست کردەوە:

-نا، تەنیا تەرجەمەم کردووە، بەڵام سەبارەت بەپێکهێنانی وڵاتێکی کوردی، ئەوا لەخەونێك زیاترنییە و هەر خواش خۆی ئەزانێ کەی و چۆن دێتەدی. ئەشێت و لەقوڵایی دڵمانەوە ئەخوازین، هەموو خۆرهەڵاتی ناوەڕاست فیدراڵییەك بێت و کوردستانیش بەشێکی بێت،هەرچەندە ئەم قسەیە ئاواتێکی ئایندەیە و لەچاوەڕوانیی بەدیهاتنیدا، داوائەکەین لەکۆماری یەکگرتووی عەرەبدا وەك کورد ڕێزمان بگیرێت و ڕێمان بدرێت بۆ گەشەپێدانی کەلتوورەکەمان و لەو بوارەدا پشتیوانیی بکرێین و ئەو مافانەمان پێ ڕەوابببینرێت کە هەموو هاووڵاتیانی تر هەیانە.

لێپرسینەوەیان لەهەموو هەڤاڵەکانی ترمان کرد و لێکۆڵینەوەکان سێ ڕۆژیان خایاند. ڕۆژی هەشتی ئەیلول دوودوو بەیەکەوە کەلەبچەیان کردین و بە ئۆتۆبۆس و بەپاسەوانیی سەرجەنتێك و دووخەتدار و دوانزە پۆلیسی سەربازیی چەکدار بەکلاشینکۆف، بردیانین

بەرەو دیمەشق. سەعات نۆی شەو ئۆتۆبۆسەکە لەحەوشەی بارەگەی پۆلیسی سەربازیدا وەستاو دوای ئەوەی پاسەوانەکان قایش و قەیتانەکانیان لێسەندین بردیانینە ژێرزەمینێکەوە کەوەك زیندان بەکارئەهێنراو هەموومانیان ئاخنییە دوو ژووری بچووکەوە کەدیوارەکانیان سوور هەڵگەڕابوون،بەخوێنی ئەو سیسرکانەی بەندییەکانی پێش ئێمە پلیشاندبوونیانەوە.

ئەوشەوەم لەبەر رووناکی گڵۆپێکدا بەپلیشاندنەوەی سیسرك بەسەربرد و بەیانیی رۆژی دوایی راپێچی دادگەی باڵای سەربازییان کردین و بەرێنمایی داواکاری سەربازیی حەڵەب بڕیاریاندا لە زیندانی(ئەلمزە) بەندمان بکەن. ئەو لێپرسینەوەیەی لەحەڵەب دەستیان پێکردبوو هێشتا کۆتایی نەهاتبوو.

رەچاوکردنی ئەوەی لە(ئەلمزە)دا دائەبرێین مایەی نیگەرانیمان بوو، ئەشمانزانی ئەشکەنجەدان لێرە هەر لەیەکەم ساتی پێشوازیکردنەوە دەستپێئەکات و شێوازی ناماقوڵ ئەگرێتەخۆ. هەر بیرکردنەوە لەمە، ئەیخستینە هەناسەبڕکێ.

ئەم مۆتەکەیە پاشنیوەڕۆ بووە راست،وپاسێکی بچووك(مینیبۆس)، لەبەردەم تەلارێکی زەبەلاح و دڵگردا رایگرتین کەبەسەرشار و دەوروبەریدا ئەیڕوانی و دووپۆلیسی چەکدار پاسەوانی بوون. دەرگەکە کرایەوە و چووینە شوێنێکەوە کە لەڕاڕەوێکی سەربەتاڵ ئەچوو وئەمبەرەوبەری دووبنکە و دووپۆلیسی پاسەوانی لێبوو.سەرنجماندا لە راست و چەپمان پەنجا پۆلیسی کەتە کەپانتۆڵی سەربازیی و کراسی سیمداریان لەبەردابوو،ریزیان بەستبوو،هەندێکیان قامچی بەدەستبوون. ئەمانە سەربازی بەندیی بوون و بۆ ئەم بۆنەیە تەیاریان کردبوون. بەڕێوەبەری زیندانەکە،کەورگنێکی لچ شۆڕی رووخسار رەقی چل ساڵە ئەبوو، لێی پرسین:

-ئێوە بۆچی لێرەن؟

ئێمە رێكەوتبووین كە كەس وەڵامی نەداتەوە، بۆیە پرسیارەكەی دووبارەكردەوە و وەڵامی دەستنەكەوت. لەجاری سێیەمدا گەنجێكی هەژدە ساڵ خۆی پێنەگیرا:

-ئێمە لەپێناوی نەتەوەی كورد دا لیرمین.

بەرێوەبەرەكە نەڕاندی:

-خۆفرۆشانی چەپەڵی دژەعەرەب، كەواتە ئەتانەوێت وڵاتێكی كوردی لەناوەڕاستی جیهانی عەرەبدا درووستبكەن؟ ئەم بیرۆكە نزمە لەمێشكتان دەرئەهێنین و ئەشبینن چۆن!

دوای ئەوقسانە ئاماژەی دایە یاساوڵەكەنی بۆدەستپێكردنی پرۆسەی(مێشك شتنەوە) كە و ئیتر بە قامچی و بۆكس و پۆستاڵ داباریینە سەرمان.

یەكێكمان هاواری كرد:

-هەوڵی بەرگری مەدەن ئەوناسیاوانەمان كەپێشتر بەودۆخەدا تێپەڕبوون،ئامۆژگارییان كردووین كەبەرگەبگرین، ئەگینا بیانوویەكی باشیان ئەبێت بۆلێدانمان تا مردن.

بۆیە هەوڵی بەرگریمان نەدا و هەڤاڵەكانم كەوتنە هەڵاتن بەهەر چوار دەوردا بۆ دەربازبوون لەزەبرەكان كەچی من لەجێی خۆمدا وشك بووم.دیار بوو بەرێوەبەرەكە ئەم هەڵوێستەمی بەدڵ نەبوو بۆیە بە دانەجیڕەوە لێی پرسیم:

-تۆكێیت تاروبەڕووی ئەوچارەنوسە دۆزەخییە ببیتەوە كەبۆمان تەرخان كردوویت؟

خۆگرانە وەڵامم دایەوە:

-زۆر بەسادەیی من كوردم.

-ناوت چییە؟ من پرسیاری ناوت ئەكەم.

-نورەدین زازا.

شادمانانە و وەك ئەوەی نهێنیی ژیانی دۆزیبێتەوە پرسییەوە:

-چۆن؟! نورەدین زازا؟ كەواتە سەرۆكی پارتی خۆتی؟! چارت ئەكەم لەباتی ئەو چاكەیەی بەرامبەر عەرەبایەتی كردووتە!

بەبۆکس کەوتە لێدانی سەر و ڕووخسارم،ئینجا بەقامچییەکەی دەستی تێمکەوت، کەهیچ کاردانەوەم نەبوو، ڕاپێچی کردم بۆ یەکێ لەژوورەکانی بەڕێوەبەرێتیی و خۆم بینییەوە لەبەردەم(ئەبوعەبد)دا،ئەوپۆلیسەسەربازییە زەبەلاح وبەهێزەی لەسەرتاسەری سوریا ناسراوە و پار بەندییەکی بەیەك بۆکس کوشتبوو.لەژوورەکەدا ئەمسەر وئەوسەری ئەکرد.

بەدەم شەپازلەیەکەوە بۆ دەموچاوم پێی وتم:

-گەورەت کردین و ئەم ناوەت ڕووناك کردەوە، دکتۆر، ئەی سەرۆکی مەزنی کوردان!

پزیسکێك لەچاوی ڕاستم هەستا و هەستم کرد زەوی لەژێر پێمدا ئەخولێتەوە. لەبەرئەوەی هێشتا بەپێوەبووم بۆکسێکی تری وەشاندە ڕوومەتی چەپم و بەری ئەو دیوارەی لێگرتم کەبەهەمموو تواناەوە خۆم پێوەگرتبوو و چاوەڕێی ئەوەبووم بەزەبری سێیەم تەختم بکات و دەستم ئەجولاند بۆ پاراستنی دەموچاوم. بەلآم نەمزانی بۆ زەبری سێیەمی لە سەرم نەوەشاند، تۆبلێی ئەو لۆزەنەرە بەزەیی پیامدا هاتبێتەوە یا بەڕێوەبەر ڕایگرت؟

کاتێك هاتمەوە سەرخۆ، ڕاپێچیان کردم بەرەو ڕاڕەوێکی درێژ و بینیم هەڤاڵەکانم خراونەتە بەر فەنتازیای چەند سەرتاشێکی سەرپێی کەبەئامێری سەرتاشینی بەندیی سەربازی لەسەری هەندێکیاندا وێنەی خاچ و لەسەری هەندێکی تردا تاجەگوڵینە و تەنانەت وێنەی سۆفی چینیان کێشاوە. من خۆشبەخت بووم و کەوتمە بەردەستی سەرتاشێکی زیاتر شارەزا و بەئەزموون و کەمتر چوختی و بەفیشاڵ، و قژی ڕێك و گونجاو بۆ بڕیم. دوای ئەم سەرتاشینە، پاسەوانەکان و یاریدەدەرەکانیان بێ بەزەییانە تێمان کەوتنەوە و سەری زۆر کەسیان کێشا بەدیوارەکاندا. دوای ئەوە و بەو قژە هەڵپاچراوەوە ڕاپێچیان کردین بۆ قاوشەکانمان. سەرەتا بردیانین بۆ قاتی یەکەمی تەرخان بۆکۆمۆنیستەکان. هێشتا پێنج پێنج و شەش شەش تەواو نەیان ئاخنیبووینە ژوورەتاریکەکانەوە،فەرمانیانکرد دابەزینە قاتی خوارەوە، بەپەیژەیەکی ئاسنینی درێژدا

کەپەنجا پلە نەبوو و لەملاولای هەر پلیکانەیەك پۆلیس وەستابوون کەنازانین لەکوێوە پەیدابوون و ئامادەی بۆکس هاویشتن بوون. دەنگی کڵاوخودە و زلە و جنێو پێکەوە تێکەڵاو بوون تا دواکەسمان گەیشتە قاتی خوارەوە. ئینجا بەزۆر بەسەر ئەو قاوشانەدا دابەشیان کردین کە بۆسەربازە بەندییەکان تەرخان بوون، پێش ئەوەی یاساوڵەکە دەرگەکە داخات بەهەندێك زلەی ئەملاولا پاداشتیان کردین، هێشتا تەواو نەهاتبووینەوە سەرخۆ کەبەرپرسی قاوشەکە گەیشتە سەرمان بۆ لێپرسینەوەمان و دوای تەواوکردنی ئەرکەکەی ئاماژەی داینێ کەهەریەکەمان بچێتە ئەو شوێنەی بۆی دیاریی کراوە. میوانە نوێکان ئەبوو لەقوڵایی قاوشەکەدا و نزیك ئاودەستەکان جێگیر بن، چونکە کۆنی و تازەیی بەندییەکە، نزیکی و دووریی ئەوی لەئاودەستەکانەوە دیاریی ئەکرد.

هەرکەسەمان سێ پێخەوی وەرگرت، یەکێك بۆراخستن و یەکێك بۆسەرین و یەکێکیش بۆ بەخۆدادان.ئەشبوو جوان قەدیان بکەین بەپێی دیسپلینی سەربازیی پەیڕەوکراو لەو شوێنەدا. لەبەرئەوەی نەشارەزابووین، سەربازە بەندییەکان لێمان نزیکبوونەوە بۆیارمەتی دانمان. یەکێکیان کەگەنجێکی خەڵکی (دێرزۆر)بوو، بەپێکەنینەوە پێی وتین:

-لەسەردزییەکی سادە سێ مانگ حوکم دراوم،چارە چییە؟ ئەبێت بژین. سوپا خواردن و شوێنی بۆ دابین کردووین بەڵام موچەکەمان بەش ناکات و کاتێك کەسوکار قایل نابن هیچمان بۆبنێرن ئەبێت خۆمان خەمی خۆمان بخۆین.

رۆژانی سەرەتامان لە(ئەلمزە)زۆرسەخت بوون چونکە یاساوڵەکان هەموو رێگەیەکیان ئەگرتەبەر بۆتۆقاندن و ئەشکەنجە و سوکایەتی پێ کردنمان. هەر لەیەکەم رۆژی گەیشتنمان نزیکەی سەعات چواری سەرلەبەیان زەنگی (کۆبوونەوە) لێدرا و هەموومانیان ناچارکرد یەکی سەتڵێك بەدەستەوە، بەریز لەراڕەوەکەدا بوەستین و ناچاربووین بچین بۆپڕکردنی لەوتانکەرەی تازە گەیشتبووە بەردەم بەندیخانەکە.

بەرپرسانی زیندان ئەو ماوەیەیان قۆستەوە بۆزیاتر پەشۆکاندنمان و لەبەرئەوەی لاوێکی تاقمەکەمان نەیئەتوانی سەتڵەکەی هەڵگرێت یەك قامچییان لێدا کەناوچەوانی شەق کرد و ناچاربوون بیگوێزنەوە بۆ نەخۆشخانە. منیش کاتێك بەسەتڵەکەوە چوومەخوارەوە بەرەو تانکەرەکە، سەرجەنت زەینلعابدین کە دە یاساوڵی لەدەوربوو بەردەمی گرتم و بەپەنجەی دۆشاومژەی ئاماژەی دامێ:

-وەرە بۆئێرە.

چوومە بەردەمی.

-ئێ، راستە تۆ کوردیت؟

وەڵامم دایەوە:

-بەڵێ، بۆ کسەیرە؟

-بەڵام چۆن ئەبێت، تۆ کە دکتۆری،نازانم لەچیدا، هێندە ئاستت نزم بێتەوە کە خۆت بەکورد دابنێیت؟

وەڵامم دایەوە:

-بۆ ئەبێت بەئاست نزمیی دابنێیت؟

-وادیارە تۆ چیرۆکی کەرەکەت نەبیستووە کەپێیان وت کوردیت؟ هێندەی هەست بەشەرمەزاریی کرد سێ رۆژ مانی لەخواردن گرت.

ئەمتوانی وەڵامی بدەمەوە و بڵێم ئاخر کەرەکە کە زیز بوو، لەبەرئەوەبوو کەهەستی بەحەوانەوە ئەکرد لەناو پێستە عەرەبییەکەیدا،بەڵام هەر هێندەم وت:

-یەکێك لەهۆکارەکانی پێکهێنانی پارتەکەمان هەر رێك ئەو جیاکارییە رەگەزییەیە کەلەناوەندیی کارمەندیدا هەیە و قوربانییەکان تیایدا کوردن. تۆش کەبەو شێوەیە قسەئەکەیت ئەوا بەڵگەنەویستانە ئەیسەلمێنیت ئەو جیاکارییە هەیە.

سەرجەنتەکە پەشۆکا و زمانی تەتەڵەی کرد:

-نابێت قسەکەم بەجدی وەرگریت. من تەنیا بۆ پێکەنین ئەو قسەیەم کرد.

وەڵامم دایەوە:

-قەشمەریکردن بەهاوولاتییەك کەهاونەتەوەت نییە،لەوانەیە ئەنجامی خراپی هەبێت.

کاتێك یاساوڵەکان هەستیان کرد لەبەرامبەر قسەکانمدا سەغڵەت بووە، تووڕە بوون و یەکێکیان بەهەڕەشەوە لێم راپەڕی:

-تۆکێیت تابوێریت خۆت بەسەرجەنت بەراورد بکەیت و ڕێ بەخۆت بدەیت دەمەدەمی لەگەڵ بکەیت؟ ئێستا تەمێت ئەکەم.

ویستی بۆکسێك بکێشت بەسەرمدا بەڵام سەرجەنتەکە رێگریی کرد:

-وازی لێبێنە بچێت سەتڵەکەی پڕکات لەئاو، ئێوارە چاری ئەکەین. بڕۆ دکتۆر!

بەنیگەرانییەوە چاوەڕێی هاتنی ئێوارە بووم. سەعات نۆی شەو کەزەینلعابدین هات بۆ پشکنینی ئاسایی تەنیا نیگایەکی تیژی تێگرتم.

قاوشەکەمان وەك ژوورێك وابوو درێژیی پانزە مەتر و پانیی پێنج مەتر بوو، بەدرێژایی دیوارەکان بەچیمەنتۆ کورسییان درووست کردبوو بەبەرزیی حەفتا سانتیمەتر. خەوتن و زۆربەی کاتەکانمان لەسەرئەو کورسیانە بەسەرئەبرد. بەرۆژ ئەمانتوانی لەسەر کورسییەکان راکشێین بەڵام نەئەبوو قاچ راکێشین و ئەوهێڵە ببەزێنین کەبەرەنگی سپی کێشرابوو و پاساوانەکە لەو دووکونەوە کەلەملاولای دەرگاکەدا بوون، چاودێریی باری بەندییەکانی ئەکرد و هێندەی بەس بوو تێبینی بکات پەنجەی کەسێك لەهێڵەکە تێپەڕیوە تا بەنەڕەوە خۆی بکات بەهۆڵەکەدا:

-هەمووتان کڕنووش!

ئەبوو ئێمەش خێرا دابەزینە ناوەڕاستی هۆڵەکەو لەسەر چیمەنتۆکە کڕنوش بەرین.

ئەمەش بۆ یەکەمجار پاشنیوەڕۆی رۆژی دووەممان لە زیندانی مەزە روویدا.پاسەوانی چاودێری شەش قاوشەکەی قاتی ئێمە،(ئەبو زەتور)ناسراو بە(پیاوی گیوتن-مەقسەلە) بوو،

کەدرِندەیەکی بەدناوبوو و خێرا قامچییەکەی ئەختەکار و گاڵتە و سوکایەتیی بەبەندییەکان ئەکرد. هەرهێندەی تاوانی بەزانندنی هێڵە سپییەکە لەلایەن سەربازێکی خەواڵووە ئەبینیٖ، خۆی ئەکات بەقاوشەکەماندا و قامچی بەدەست ئەقیژێنیٖ:

-هەمووتان کرِنووش!

هەموو بەندییەکان لەکورسییەکان دێنە خوارەوە و بەپەلە لەسەر چیمەنتۆکە کرِنووش ئەبەن، من کەهێشتا سەراسیمەی پێشوازییەکەی ئێوارەی رابردوو بووم، بۆیە وەك گیسکەکەی رۆمانی(رابلیٖ)دوای ئەوان کەوتم، بەڵام کاتێك دۆخەکە درێژەی کێشا، کەوتمە دانەجیرە و یاخی بوون لەو سزا بێهودەیە.

لەدڵی خۆمدا وتم:

((وەك ئەوەی زیندان بەس نەبێت و ئەبێت ملکەچی هەموو شێوەکانی سزابین لەقامچی کاریی،کاری پرِوکێنەر و جنێو و سوکایەتیی،ئەم کرِنووش بردنەشی بێتە سەر. ئەمرِۆ ملکەچی بووم، بەڵام لێرە بەدوا رەتی ئەکەمەوە)).

بەیانی رۆژی دواتر، پاسەوانەکە بەهەراوهۆریاوە دەرگاکەی کردەو و قامچییەکەی بەرزکردەوە و نەراندی:

-یەڵا هەمووتان بۆ بێگاریی.

هەموو بەندییەکان هورۆژمیان بردە دەرەوە چونکە ئەیانزانی ئەوەی دواکەوێت قامچی کاریی ئەکرێت.تەنیا من لەسەرکورسییەکەم نەجوڵام. کەپاسەوانەکە بینی فەرمانەکەیم پشتگوێ خست، بەلەسانە لێم نزیك بووەوە:

-گوێت لەفەرمانی چوون بۆ بێگاریی نەبوو؟

-با بێگومان.

-ئەی بۆ لەشوێنی خۆت ناجوڵێیت و وەك ئەوانی تر برِۆیت؟

بەدەنگی بەرز وەڵامم دایەوە:

-نە سەربازم و نەتاوانباری مافی گشتیی. من و هەڤاڵەکانم گیراوی سیاسین و ئەبێت لەو روانگەیەوە مامەڵەمان لەگەڵ بکەیت.

پاسەوانەکە قیژاندی:

-تۆ لەبەندیخانەیەکی سەربازیدایت و وەك هەموو ئەوانی تر ئەبێت ملکەچی سیستەم و رێنماییەکانی بیت.

-باشە، کەواتە ملکەچ نابم. رێنماییەکان رێی چیت پێئەدەن بیکە!

ئەبو زەتور بەتوورەیی و دوژمنانە چاوی تێبڕیم و رووخساری وەك تەماتە سوور هەڵگەڕا، کەچی لەبری ئەوەی ناچارم کات ملکەچی بم سەیرێکی دەرگاکەی کرد و وتی:

-ئێستا پەلەمە بەڵام دوایی تێت ئەگەێنم چ مەعدەنێکم!

لەجیاتی سزادانم، ئێوارەهات و پێی راگەیاندم کەلەمەودوا من لە بێگاریی بەخشراوم، بەڵام بیری نەچوو دووپاتی بکاتەوە کەئەوە( تەنیا من ئەگرێتەوە). لەگەڵ سوپاس کردنیدا کەوتمە بیری هەڤاڵەکانم و دۆزینەوەی رێگەیەك بۆ ئەوەی ئەم رێزلێنانە هەموویان بگرێتەوە.

راستیی یاخی بوونم لەبێگاریی و سەرخستنی قسەکەم، وەك سەرکەوتنێك بوو بەسەر کەڵەگایی ئەم زیندانەدا و بەلامەوە باشتر بوو کە ئەوکڕنووشە بەکۆمەڵە بەتەواوی لەزیندانەکەدا نەمێنێت، بەڵام چۆن؟

رۆژێك، دوای ئەوە ئەبو زەتور وەك رۆکێت خۆی کرد بەقاوشەکەماندا و بەبیانووی دەنگەدەنگ لەقاوشەکەدا، خۆی ئاسا نەڕاندی:

-هەمووتان کڕنووش!

هەر کەگوێیان لێبوو، هەموو هەڤاڵەکانم لەکورسییەکان خزین و نەژنۆیان خستە سەرچیمەنتۆکە بۆ کڕنووش بردن، بەڵام من لەجێی خۆم نەجوڵام.

ئەبو زەتور قیژاندی بەسەرمدا:

-ها...ئەی تۆ بۆ کڕنووش نابەیت؟

چاوم تێبڕی و یاخییانە پێموت:

-بۆ ئەبێت کڕنووش بەرم؟

-چونکە من فەرمانم پێکردن هەمووتان کڕنووش بەرن.

بێخود و بەتوندیی قیژاندم بەسەریدا:

-ئاخر شتێکم نەکردووە شایانی ئەو سزایە بێت.

رووخساری پاسەوانەکە نەرم بوو و تووڕەیی تیانەما، پاشان بۆ چەند ساتێك بەقووڵیی چاوی تێبڕیم و بەڕووی هەموو بەندییەکاندا خەنییەوە:

-باشە دەی، بگەڕێنەوە سەر کورسییەکانتان!

دوای ئەوە ئەبو زەتور، بەخۆشییەکی دیارەوە قاوشەکەی جێهێشت و لەورۆژە بەدوا پاسەوانەکان داوای کڕنووشیان لێنەئەکردین، مەگەر بەدەگمەن.

بێگومان ژیان لە زیندانی مەزە، بێ بێگاریی و کڕنووش بردن پەسەندتر بوو، بەڵام حەوانەوەی تیانەمابوو چونکە قاوشێکی تەرخانکراو بۆ ۲۵ بەندی، جاری وا هەبوو زیاتر لە ٤٥ کەسی تێ ئەخزێنرا و بەسەریەکدا کەڵەکەئەبووین و شەوانە هەندێکمان ناچار ئەبووین جێگەکەمان بەرینە ناوەڕاستی قاوشەکە، هەرچەندە ئەمە پێچەوانەی سیستەم و رێنماییەکان بوو. لەبەرئەوەی دەرگاو پەنجەرەکانیش دائەخران قاوشەکە هێندە بۆگەن بوو، بەرۆژ پاسەوانەکان کەدەرگایان ئەکردەوە ناچاربوون لوتیان بگرن.

ئەبوو هەموو رۆژێك سەعات پێنجی بەیانی بێداربین و چایەکی ناخۆش بخۆینەوە کەلەمەنجەڵی گەورەدا لێئەنرا. هەرچەندە بەکەڵکی خواردنەوە نەئەهات بەڵام ئەماخواردەوە چونکە چارێکی ترمان نەبوو. سەعات هەشت هەموو قاوشەکانی قاتی ئێمە ئەهاتنە دەرەوە بۆ پشوودان لەحەوشە گەورەکەی زیندانەکەدا، لەژێرچاودێریی

پاسەوانەکاندا کەسەردیوار و بانەکانیان لێنەگرتین. پشووەکە دوو سەعاتی نەخایاند و لەوماوەیەدا ناچاربووین پیاسەبکەین، مەگەر یەکێك پەککەوتە بوایە.

ئەمباری پۆشاك و پێخەوی سەربازیی لەنێوان حەوشە و قاوشەکاندا بوو و ژوورێکیان کردبووە فرۆشگەیەکی بچووك کەجگەرە و خۆراکی قوتوو و چا و سابوون و خاوێنکەر و هەویری ددان و کاغەز و پێنووسی تیا ئەفرۆشرا.

هەر قاوشێك پەرەمێزێکی تیا بوو و بەندییەکان ئەیتوانی بەسەرە بەکاری بهێنن بۆچا یاچێشت لێنان. ئەو خۆراکەی ئەدرایە بەندییەکان لەهی سوپا جیاواز نەبوو وبڕێکی باش بوو، بەڵام جۆرەکەی زۆر خراپ بوو. لەبەر ئەوەش کەدادگە لەمانگی یەکەمی بەندیمان لەزیندانی مەزە، هەموو سەردانێکی لێ یاساغ کردبووین، ناچاربووین شت لەفرۆشگەی زیندان بکڕین، کاتێکیش هەڤاڵان و کەسوکارمان مۆڵەتیان لەدادگەی سەربازیی وەرئەگرت، سەوزەی تەڕوتازە و میوە و شیرینییان بۆ ئەناردین.

ڕۆژانی سەردان هێندەمان شت بۆئەهات کەبەشێکیمان دابەش ئەکرد بەسەر ئەو سەربازە بەندییانەی خێزانەکانیان لەناوچە دوورەکان نیشتەجێ بوون، یانەدار بوون و نەیان نەئەتوانی بگەنە مەزە.

لەکاتی سەرداندا، بەندییەکان بۆیان نەبوو بەئازادیی لەگەڵ سەردانکەران قسەبکەن و بەربەستێك لەنێواندا بوو کەپێکهاتبوو لەدوودەرگەی شیشی دوومەتر لەیەکەوە دوور و دوو پۆلیس لەنێوان دەرگەکاندا ئەوەستان و دیارییەکانیان وەرئەگرت و ئەیاندایە بەندییەکە، ڕێیان بەگفتوگۆی ڕاستەوخۆ نەئەدا، لەگەڵ ئەوەش هەڤاڵانمان نەیانتوانی هەواڵی دەرەوەمان بدەنێ، چ ناوخۆیی، چ جیهانیی و تەنانەت دزەپێکردنی بڵاوکراوە و نامە، بەشاردنەوەیان لەناو زەرفی میوە و سەوزەدا.

هەموو هەفتەیەك پێشهاتێك هەموو زیندانەکەی تەیار ئەکرد جگە لەکۆمۆنیستەکان، نوێژی هەینی کەجارێ ئەکردین. چونکە نزیکەی سەعات دەی بەیانی ئەو ڕۆژە، ئەبوو

هەموو بەندییەکان لەهەموو قاوشەکان پێخەوەکانیان بێننە دەرەوە و لەسەر زەوی قیرتاوی حەوشەکە رایخەن. سەعات یانزە هەموو بەندییە ناکۆمۆنیستەکان بەجیاوازیی باوەڕیانەوە لەرارەوەکەدا ریز ئەبوون و روویان ئەکردە حەوشەکە بۆ کڕنووش بردن و نوێژی هەینی کردن لەسەر پێخەوەکان. پێشنوێژێك کە کاربەدەستان دایاننابوو، بەبەرگی جەنگییەوە ئەهات و وتاری هەینی ئەوتەوە کەیەك وشەش ناوەڕۆکەکەی نەئەگۆڕا و هەمیشە باسی جەنگی میللی بوو بۆ رزگارکردنی فەلەستین. دوای وتارەکە بانگدەرێك بانگی ئەدا و پێشنوێژەکە لەبەردەماندا ئەوەستا و پێشڕەویی نوێژەکەی ئەکرد، ئەوانەشی بەشدارنەبوون لەگۆشەیەکدا دائەنیشتن.

رۆژێکیان پێشهاتێك بووە مایەی خۆشیی بەندییەکان کەژمارەیەکی زۆر(دورزیی)یان تیابوو و تۆمەتبارکرابوون بەسیخوڕیی بۆئیسرائیل. ئەمانە هەندێکیان سەربازی پیشەیی سوری بوون و ئەوانی تر هاوولاتیی سڤیلی سادەی لوبنانی. لەناویاندا (ئەبوسەلیم) کەلەئەنجامی دادگەیەکی دووردرێژ بەقورسترین سزا حوکمدرابوو و تکاکارییەکی دابوو بە سەرۆك تالیبی ببوورن. ئەبوسەلیم گەرچی دورزی بوو بەلام بڕوای وابوو گەرخۆی وەك موسڵمان پیشان بدات بەختی زیاتر ئەبێت بۆوەرگرتنی وەلامێکی باشی تکاکەی. رۆژێکی هەینی لەکاتێکدا چاوەڕێی کەسێکی سونە بووین بانگ بدات، بەسەرسامییەوە سەیرئەکەین ئەبوسەلیم بانگی داو دەنگەبەرزەکەی لەرزەی هاوسۆزیی و موچوڕکی تەنانەت لای ناموسڵمانەکانیش درووستکرد. تۆبلێیت ئەم رەفتارەی ژێی هەستیاری ناسری پێکابێت؟

بەلام بێگومان ئەبوسەلیم پێی وابوو کەقورسترین سزاکەی گۆڕاوە بۆ زیندانی هەتاهەتایی و لەورۆژەوە لەخۆشیدا سمێلی بەشانازیی وکەشخەییەوە بۆسەرەوە لوول ئەکرد و قایل و خۆشنود دیاربوو بەچارەنووسی خۆی.

لەمانگەکانی سەرەتای بەندیمان لە مەزە، من وهەڤاڵەکانم لەپارتی دیمۆکراتی کوردی سوریا هیچ شتێکمان لەبارەی ئەوچارەنووسەوە نەئەزانی کەچاوەڕێمانە و لەقۆناغێکی نائومێدیدا بووین، کاتێك سەردانی داواکاری دادگەی باڵای سەربازیی ڕاگەێنرا، بەوبۆنەیەوە هەموو قاوشەکانیان تەیارکرد بۆپاکردنەوەی سەرتاسەری زیندانەکە و قژیان بۆتاشین. بەرپرسانی مەزە ئامۆژگارییان کردین هیچ سکاڵایەك نەکەین سەبارەت بەباری ژیانمان لەزینداندا.

سەرجەنتەکە ئاگاداری کردینەوە:

-ئەگینا پەشیمان ئەبنەوە.

بەبەرگی خاوێنەوە ریزمان بەست بۆ پێشوازیی کەتمیەکی زەبەلاح بەپلەی کۆلۆنێل و کاتێك لێی پرسین، ئایا هیچ داوایەکمان هەیە کەس فزەی لێنەهات. کە لەمن نزیك بووەوە خۆم پێنەگیرا و وتم:

-مەسەلەکەی ئێمە گەیشتە کوێ؟

بەفیزێك و هاوکات سەرساماییەوە، وەڵامی دامەوە:

-کام مەسەلە؟

-مەسەلەی کورد!

-ئاھ! باشە،ئەزانم لێکۆڵینەوە لەمەسەلەیەکی وەك ئەوەی ئێوە کاتێکی زۆر ئەخاێنێت، بەڵام کارەکەمان تەواوکردووە و بەمزوانە حوکمەکەتان دەرئەچێت. ئەتوانن لەئێستاوە پارێزەر راسپێرن،مەگەر ئەوەی بەلاتانەوە باش بێت کەئێمە راستەوخۆ دەستنیشانیان بکەین بۆتان.

وەڵامم دایەوە:

-سوپاس، خۆمان پارێزەر بۆخۆمان هەڵئەبژێرین.

بەخەندەوە وتی:

-بەئارەزووی خۆتان، من بەرهەڵستیم نییە لەوبارەیەوە.

دوای چەند رۆژێك سەرجەنتی بەرپرسی هاوئاهەنگیی نێوان دادگە و زیندان هات و لەراڕەوەکەدا هاواری کرد:

-زازا و تاقمەکەی سەبارەت بەدادگە. سبەینێ سەعات ٦:٣٠ لەبەردەم نوسینگەی بەڕێوەبەرێتیدا!

چەند پارێزەرێکمان پەیدا کردبوو لەناوە گەورەکانی دادگەکانی دیمەشق، و داوای پارەیەکی زۆریان ئەکرد، لەبەرامبەردا سێ پارێزەری کورد و پارێزەرێکی عەرەبی لاوی حەڵەب خۆبەخشانە هاتنە پێشەوە تابێ بەرامبەر بەرگریمان لێبکەن. تۆمەتەکانمان ترسناك بوون و ئەبوو پارێزەرەکە لەئاستیاندا بێت.

رۆژی دوایی سەرحاڵ و ریش تاشراو لەبەردەم نوسینگەی بەڕێوەبەرێتیدا ریزبووین. سەرجەنتی بەرپرس بانگی کردین وبەووردیی کەوتە پشکنینمان بەوهیوایەی نامەیەکی ناڕاستەکراو بۆ دادوەر یاجەماوەر بدۆزێتەوە، پاشان سواری ئەو مینیبۆسەیان کردین کەهێنابووینی بۆ مەزە. لەحەوشەی دادگەدا خستینیانە تەلبەندێکەوە کەبۆ ئەو مەبەستە ئامادە کرابوو. ئەو رۆژە لەبەرئەوەی دادگە دانەنیشت، تەنیا نووسەری دادگە لەناسنامەکانمانی کۆڵییەوە، بەڵام سەرۆك منی بانگ کرد بۆ سەرلەنوێ لێکۆڵینەوە سەبارەت بەوبەشە وەرگێردراوەی کتێبی (divided country ،Kurdista) ئەو دەقە کە پیتی لاتینیی کرابوو بەکوردی، بەلای جەنابی دادوەری سەربازیی رووناکبیرەوە کەئەیانوت لەفەرەنسا قانونی خوێندووە، دۆزینەوەیەکی گرنگ بوو. پرسی:

-ئەمە چییە؟ پێم بڵێ ئەمەچییە؟

وەڵامم دایەوە:

-ئەوە کوردییە

-کوردی ئاوا ئەنوسرێت؟!

-بەڵێ. چل ساڵ زیاترە کوردی سوریا و تورکیا پیتی لاتینی بەکاردێنن کەگونجاوە لەگەڵ دەنگە زمانەوانییەکانی کوردیدا.

سەرسوڕمانی خۆی دەربڕی و سەرسام بوو بەم دۆزینەوەیە:

-بەڵام زۆر جوانە، بەڕاستی جوانە. ئەی تۆ خۆت کوردی بەباشی ئەنوسیت؟

-بەڵێ، پێم وایە.

بەهاوسۆزییەکی شاراوە لەگەڵ من و لەوانەیە لەگەڵ هەموو کوردە بەندییەکان، وتی:

-ئەها! بەڵێ!

دوای ئەم دیدارە بەمینیبۆسەکە دووبارە راپێچی زیندانیان کردینەوە. لەپەنجەرە تەلبەندەکەوە خەڵکم ئەبینی پیاسەیان ئەکرد و سەرگەرمی کاری خۆیان بوون. بەدڵەخوریەوە لەخۆم پرسی تۆبڵێیت ئەورۆژە بێت کەسەرلەنوێ بەئازادی بسوڕێمەوە؟

لەزیندان دووبارە پشکنراینەوە و قەیتان و بۆینباخەکانیان لێ سەندین و لەراڕەوەکە بەندییە سەربازییەکان بەجۆش بوون تابزانن لەدادگە چیمان بەسەرهاتووە و دادوەر چۆن رەفتاری لەگەڵ کردووین. لەکاتێکدا بەوردیی گوێیان گرتبوو، هانیان ئەداین و دڵیان ئەداینەوە:

-ناوی دادگەی سەربازیی تۆقێنەرە، بەڵام لەراستیدا لەدادگەی سڤیل کەمتر گیرە و ئەشبینن کەبەکەمترین زیان لێی دەرئەچن!

بەقسە باشەکانیان ختوکەی هەستی خۆمان ئەدا.

لە ١٥ی کانوونی یەکەمی ١٩٦٠ەوە تا ٢٠ی شوباتی ساڵی ١٩٦١(رۆژی دادگەیی کردنمان) هەموو رۆژێکی شەممە،جگە لەپشووەکان، راپێچی دادگەیان ئەکردین.

دانیشتنی دووەمی دادگە بەتەواوی ئەندامانییەوە دەستی پێکرد. سەرۆکەکەی پلەی کۆلۆنێل بوو،ودووئەندام،بریکاری داواکاریی گشتیی وسکرتێرێکی سڤیل یاریدەدەری بوون. لەپشت پارێزەرەکانەوە ٢٠ کورسییان دانابوو، پێنجی پێشەوە بۆئێمە و ئەوانی تریش بۆ

جەماوەر. لەکاتی لێپرسینەوەی مندا رێیان نەدا جەماوەر بێتە ژووری و لەرۆژنامەگەریش تەنیا رێی ئەوانەیان دابوو کەتەواو لەژێردەستی حکومەتدا بوون.

سەرۆکی دادگە، جەختی‌لەو پێکهاتە سەرەکییەی تۆمەتەکان کردەوە کە دادوەری لێکۆڵینەوەی سەربازیی حەڵەب گەڵاڵەی کردبوو: ئێمە رێکخراوێکی ناقانونیمان دامەزراندووە بەئامانجی سیاسی و کاری تێکدەرانەمان کردووە بەئامانجی هەڵوەشاندنی یەکێتیی ئیتنیکی و سیاسیی وڵات و.....هتد.

سەرۆك لێمی پرسی:

-تۆ دەستپێشخەر بوویت بۆ پێکهێنانی پارتی دیموکراتی کوردی سوریا، وانییە؟

-بەڵێ راستە من دەست پێشخەربووم.

-بۆ دەستپێشخەریت کرد بۆ دامەزراندنی ئەو پرۆژەیە؟

-بۆ بەرگریی کردن لەخۆمان بەرامبەر شۆڤینیزمی دژی نەتەوەی عەرەب.

-ئەوبەڵگانەی لای ئەندامەکانتان دۆزراونەتەوە، مەبەستەکانی پارتەکەتان ئاشکرا ئەکات بەدابڕینی پارچەیەك لەسوریا بۆلکاندنی بەوڵاتێکی بێگانەوە. ئایا ئەمە خۆفرۆشیی مەزن(الخیانة العظمی) نییە؟

-ئێوە پشت ئەبەستن بەبەڵگەیەك کەلەکتێبێکی ئینگلیزییەوە وەرگێڕدراوە. گەر بەڵێنم بدەیتێ دەست لەوکەسە نادەن کەئەو کتێبەم بەدیاریی داوەتێ، ناونیشانیتان پێ ئەڵێم، بەوەش ئەتوانن لەراستیی قسەکەم دڵنیابن.

بەبەڵێنی سەرۆك ئاماژەم بۆ ناونیشانی هاورێکەم کرد و وتم:

-ئەو بەشەی ئەو کتێبە کەوەك تاوان سەیری ئەکرێت من بەتەنیا وەرمگێڕاوە و بڵاویش نەکراوەتەوە.

سەرۆك وەڵامی دامەوە:

-ئەیبینین، تا ئەوکاتەش راستیی بەڵگەدارم بەرێ بەسەبارەت بەو تۆمەتەی، کورد قوربانیی جیاکارین لەکۆماری سوریای عەرەبیدا.

خێرا دەستم کرد بەگێڕانەوە، کاتێك سەرۆك سەیری کرد ئەم کارە زۆر ئەخایەنێت، پێشنیازی کرد هەموو ئەمانەی لەدانیشتنی داهاتووی دادگەدا بەنووسراو بدەمێ.

ئەو رۆژە کات نەما بۆ لێپرسینەوەی تۆمەتبارەکانی تر و لەنێوەڕۆدا دانیشتنەکەی کۆتایی پێهێنا و پۆلیسەکان خێرا بردیانینەوە بۆ مەزە.

لەماوەی هەفتەیەکدا و بەیارمەتی هەڤاڵەکانم راپۆرتێکی چڕوپڕم ئامادە کرد سەبارەت بەو جیاکارییەی دژی کوردی سوریا ئەکرێت و تیایدا باسی نیازی مکوڕی دەسەلاتم کرد بۆ سڕینەوەی کەلتووری کورد(لەرێی نەبوونی خوێندنگە و کتێب و رۆژنامەی کوردی) و نەبەخشینی رەگەزنامەی سووری بەژمارەیەکی زۆری کوردانی بۆ چەندین نەوە نیشتەجێی سوریا و ئاماژەمدا بەنیازی دەسەلاتداران بۆ بەعەرەباندنی ناوچە کوردییەکان بەکۆچپێکردنی کورد لەگوندەکانیان و هاوردنی عەرەب لەجێیان.

لەراپۆرتەکەدا ئەوەشم تۆمارکرد کەجیاکاریی کارمەندان ئەکرێ و کادرە سەربازیی و سڤیلەکانی کورد لەکارلائەبرێن و دەرگەی ئەکادیمیاکانی سوپاو پۆلیس بەڕووی لاوانی کورد دا داخراوە ئەگەرچی مەرجی پێویستیشیان تیایە.

لەدانیشتنی داهاتوودا راپۆرتەکەم دایە سەرۆك، کە تاکۆتایی داواکەش چاوێکی پێدا نەخشاند.

دوای تێپەڕبوونی چەند هەفتەیەك، بەپشت بەستن بەبڕگەکانی قانونی سزادان، چ سڤیل و چ سەربازیی، وبەکاریگەریی دەسەلات سیاسیی ولات، بریکاری داواکاریی گشتیی داوای کرد سزای مەرگ بەسەر سێ کەسماندا بدرێت: عوسمان سەبری و رەشید حەمۆ و من، و سزای زیندانیش لە دووساڵەوە تا ١٠ ساڵ بۆ هەڤالانی ترمان.

پارێزەرەکانمان دوو هەفتەیان لەبەردەمدابوو بۆ ئامادەکردنی بەرگرینامەکەیان. دوای چەند رۆژێك رادیۆ، کە ئیتر جگە لەمارشی سەربازیی هیچی تری بلاونەئەکردەوە رایگەیاندسەرۆك کۆمیتەیەکی راسپاردووە بۆ لێکۆڵینەوەی دەستوورێکی نوێ

(دیموکراسی)و بانگی گەل ئەکاتبەشداری گەلاڵەکردنی بکەن و هەرکەسێك پێشنیاز و بۆچوونی هەیە سەبارەت بەودەستووره بینێرێت بۆخودی ناسر یا بۆکۆمیتەی ناوبراو.

کاتێك هەواڵەکەم بیست بەپەلە بروسکەیەکم نووسی و دامە بەڕێوەبەرێتی زیندان تابینێرێت بۆ ناوبراو و روونیشم کردەوە، کەخەرجەکەی خۆم ئەیدەم. دە رۆژ تێپەڕی و لەڕۆژی یانزەهەمدا کاتێك راکشابووم و خەریك بوو ئەنووستم سەربازێك بەهەڵلاوە دەرگەی راڕەوەکەی کردەوە و لەقاچەوە رایکێشام و داوای کرد یەکسەر لەگەڵی بڕۆم. سەربازەکە کردمی بەژوورێکدا کەبەحاڵ رووناکی تیابوو. سەرنجمدا بەڕێوەبەر بەناوچەوانی تێك ترشاوەوە لەپشت مێزێکی گەورەوە دانیشتووە و کاغەزێکی بەدەستەوەیە کە نووسینەکەیم بۆ روون نەبوو و بەدەوریدا و بەدرێژایی دیوارەکە پۆلیسی سەربازیی پلەجیاواز و سەربازی سادە وەستابوون. وەڵامی سڵاوەکەیان نەدامەوە بەڵکو بەسەرکۆنە و دوژمنانە لێیان ئەڕوانیم. چەند خولەکێك تێپەڕی و کەشێکی بێدەنگ و نیگەرانکەر باڵی بەسەر شوێنەکەدا کێشا.

لەدڵی خۆمدا بەسەرسامییەوە پرسیم:(ئاخۆ ئەم هەموو ئامادەبووەی ئەم ژووره چییان بوێت لەم درەنگ وەختەی شەودا ؟!))

دوای کەمێك بەڕێوەبەر سەری بەرەولای من هەڵبڕی و بەقێزێکەوە چاوی تێبڕیم و وتی:

-کێ ئەم کاغەزەی نووسیوە؟

-کام کاغەز؟

-ئەم بروسکەیە کە ئاڕاستەی سەرۆك کراوە.

هەناسەیەکی ئاسودەیم هەڵکێشا کاتێك زانیم مەسەلەکە لەوە زیاتر نییەوە و وەڵامم دایەوە:

-من نووسیومە.

درێژەی پێدا:

-بۆ ویستت ئەم بروسکەیە بنێریت؟

-چونکە نەدزیم کردووە و نەکەسم کوشتووە، هەولّمدا و گرفتار بووم تا درێژە بەخوێندنەکەم بدەم بۆئەوەی قووڵتر لەجیهان تێبگەم و هەوڵی یارمەتیدانی گەلەکەم و مرۆڤایەتی بەگشتیی بدەم، کەچی وائەمڕۆ تەنیا لەبەرئەوەی کوردم خۆم لەزینداندا ئەبینمەوە. ئەم بروسکەیەم نارد وەك هیوایەك بەئاینده کەچیدی کوردی تر تووشی ئەم چارەنووسە نەبن.

بەڕێوەبەر پیامدا هەڵشاخا و لالغاوەی کەفچڕی ئەکرد و چاوی ئاگری لێئەباری:

-ئاخر هیچوپوچ ئێستا کاتی ناردنی بروسکەیە ؟!

وەڵامم دایەوە:

-بۆ هیچوپوچم؟! بۆ بروسکە نەنێرم بۆ سەرۆکی وڵاتەکەم؟! وا ڕەفتار ئەکەیت وەك ئەوەی ناردبێتم بۆ سەرۆکی وڵاتێکی بێگانەی دوژمنی وڵاتەکەم!

وەڵامی دامەوە:

-تۆ تێناگەیت کە سەرۆك ئێستا سەرقاڵی کاری گرنگترە ؟!

-ئاخر چی لەوە مەزنتر کەگەڵاڵەی دەستوورێکی نوێ بکرێت بۆ وڵات، بەتایبەت ئەگەر هەڵقوڵاوی ئیرادەی هەموو میللەت بێت؟

بەڕێوەبەر نەڕاندی:

-بەندییەکان مافییان نییە رای خۆیان لەوبارەیەوە دەربڕن.

-گەر وایە ئەی بۆچی بڵندگۆکانی زیندان بەئاخر دەنگ کرابوونەوە بۆئەوەی هەواڵەکە بدەن بە گوێماندا ؟!

کەبینیان وەڵامی بەڕێوەبەر نەخەمە مشتییەوە، سەرجەنت زەینلعابدین خێرا دەستی لێ بەرزکردەوە:

-هێی تۆ پێمبڵێ! پێنەچێت ئەو پێنج مانگەی زیندان بەس نەبووە بۆ عەرەباندنت. تۆ شایانی سزایەکی نموونەییت!

دوای قسەکەی ویستی زەبرێك لەسەرم بدات بەڵام بەرێوەبەر نەیهێشت.

-نا، ئەجارە ئەتبوورین لەلێدان بەڵام جارێکی تر ئەزانین چۆن ئێسکت وردئەکەین.

ئینجا رووی تێکردم و وتی:

-ئێستا بۆ دەرەوە، سەگی گەڕ! خوام لەو خوایەی جارێکی تر کەرێتی وا بکەیت!

بەرلەوەی فریای وەڵامدانەوەی بکەوم،دوو پۆلیس پڕیان پیاکردم و بەپاڵ بردیانمەوە بۆ قاوشەکە، کەهەر هەموویان بێداربوون تابزانن چیم بەسەردێ.

پێموتن:

-شتێکی وا نەبوو. بێخەم بنوون و بەیانی بۆتان باس ئەکەم.

سەریان بردە ژێر پێخەوەکانەوە و باش کەمێك پرخە لەهەموو لایەکەوە بەرز بووەوە. بەڵام من بەدرێژایی شەو پێڵووم لێك نەنا، چونکە ئەو پێشهاتە نیگەرانی کردبووم. نەك تەنیا وەك هاوولاتییەك مافەکانیان پێشێل کردبووم بەڵکو جنێویشیان پێمدا و هەڕەشەی توندترین سزاشیان لێکردم بەهۆی ئەوکارەمەوە.

هۆی مامەڵەی دەسەڵاتداران لەگەڵم بەوشێوەیە تەنیا ئەوەیە کەسەر بەمیلەتێکی ترم، باشتر نەبوو ئەم جیاکارییە رەگەزپەرستانەیە لای دادوەری دادگە باس بکەم؟ بەدرێژایی شەو لەوبیرەدا بووم. رۆژی دواتر هەموو بەسەرهاتەکەم لەسەر کاغەزێك تۆمارکرد و نامەیەکیشم نووسی بۆ سەرۆکی دادگە و داواشم لێکرد ئەم پێشهاتە بخاتە سەر راپۆرتەکەی پێشتر دابوومێ.

دوای دوو رۆژ و کاتێك پاسەوانەکان ئامادەی راپێچ کردنمان بوون بۆ دادگە، دوو بەڵگەنامەکەم لەگیرفانم دەرهێنا و درێژم کرد بۆ سەرجەنت زەینلعابدین پێش ئەوەی بکەوێتە پشکنینمان. ئەویش کەلەناوەڕۆکەکەی تۆقیبوو نیگایەکی توندی تێگرتم و هەڵات بۆلای بەرێوەبەر تا پێی راگەێنێت( چ پیلانێك دژیان چنراوە).

بەرێوەبەر بەپەلە هات و بەدەم داخستنی قۆپچەی چاکەتەکەیەوە بەدەنگێکی گیراوەوە وتی:

-تۆ بەڕاستی هەوڵ ئەدەیت سەرئێشەمان بۆ دروست بکەیت، وانییە؟ بڕوام پێبکە ئەوە زۆر گران لەسەرت ئەکەوێت!

بەهێمنیی وەڵامم دایەوە:

-بەهەموو توانامەوە دژی هەموو جۆرەکانی چەوساندنەوە خەبات ئەکەم.

-پاداشتەکەت دوای گەڕانەوەت لەدادگە وەرئەگریت. دڵنیابە.

دادگە دانیشتنەکەی تەرخانکرد بۆ بەرگرینامەی یەکێك لەپارێزەرەکانمان،لەبەر ئەوەی دادوەر لەبارەی سکاڵاکەمەوە هیچی نەوت، من پرسیم کە ئایا ئەوراپۆرتەی نووسیومە، لەبەڕێوەبەرێتیی زیندانی وەرگرتووە، بەجوڵاندنی سەری و بەشێوەیەکی تەمومژاویی وەڵامی ئەرێی دامەوە.

-تکات لێئەکەم خێرا بیخوێنیتەوە و بمخەیتە ژێربالی خۆتەوە چونکە کە گەڕامەوە بۆ زیندان بەڕێوەبەر و دارودەستەکەی شلکوتم ئەکەن لەبەرئەوەی باسی ئەو پێشهاتەم بۆ کردوویت.

وەڵامی دامەوە:

-نا هەرگیز، شتی وا ڕوونادات.

بەپەلە جانتاکەی داخست و شوێنەکەی بەجێهێشت.

سەرجەنت زەینلعابدین لەبەردەم ئۆفیسی زینداندا و کەڵبەدەربەڕیو وەك سەگی پاسەوان چاوەڕێی ئەکردین. پڕ بەدەنگ قیژاندی:

-لەمەبەدوا، هەمووتان ئەچن بۆ بێگاریی و کەسیش لەمە نەبەخشراوە.

دوای ئەوە زۆر توند و دڕندانە کەوتە پشکنینمان و ڕاوی نایین بۆ قاوشەکانمان، و تەنیا بیست خولەك دەرفەتی نانخواردنی داینێ.

قیژاندی بەسەرماندا:

-هەمووتان بۆ بێگاریی!

هەموو بەندییەکان،بەوانەی قاوشەکەی ئێمەشەوە،بەراکردن چوونە دەرەوەو بەدرێژایی ڕاڕەوەکە ڕیز بوون. تێگەیشتم بەڕێوەبەرێتیی ئەیەوێت بەوجۆرە تۆڵەی ئەو (خراپەیە) بکاتەوە کەبەرامبەری کراوە و لەبەر ئەوەی من نەچوومە دەرەوە و سووربووم لەسەر نیازەکەم، سەرجەنت لێم نزیك بووەوە:

-بۆ وەك ئەوانی تر نەچوویت بۆ بێگاریی؟

وەڵامم دایەوە:

-ڕاستییەکەی من بۆ کاری لەوجۆرە لێرە نیم.

سەرجەنت قیژاندی:

-تۆ لێرە لەزیندانێکی سەربازیدایت و ئەبێت ملکەچی فەرمانەکان بیت. هەرئێستا ئەچیتە دەرەوە یا لەگەڵ من تووشی کێشە ئەبیت. یا ئەچیتەدەرەوە یا بەقامچییەکەم سەروچاوت ئەکوتم.

بەهێمنی و بەتۆنێکی یەکلاکەرەوە، وتم:

-ناتوانیت بەقامچییەکت بمخەیتە ژێر ڕکێفی خۆتەوە.

سەرجەنت دەستی داگرت و نیگایەکی ڕەشی تێکرتم.

-ئەبینیت لێرە قسە قسەی کێیە!

-ئەبینم.

سەرجەنت شەش ڕۆژ لەسەر یەك ئەم مەشقەی چەندبارە کردەوە و هەر جارە دەنگی زیاتر و زیاتر بەرزئەکردەوە و زیندانەکەی خستە ئاڵۆزییەکی پڕوکێنەوە. بەردەوام بووم لەگوێنەدانە ئاگاداریی و هەڕەشە و جنێو ونەڕەنەڕ وهەڵچوونی پاسەوانەکان و زەمینلەعابدین. قنج لەسەر پێخەوە خورییەکەم دائەنیشتم و کاتێك لە ڕووخساری یاساوڵەکان وردئەبوومەوە، دانم جیڕ ئەکردەوە. ئەو کۆششە دەماریی و جەستەییەی ئەم بەرگرییە پێویستی بوو، تووشی ئازاری بەردەوامی پشت و بەتایبەت گورچیلەی کردم و دوای

ماوەیەك بووە هۆی لەرزینی سەرتاپای جەستەم، بەڵام بۆ رۆژی دوایی سەرلەنوێ كەوتمەوە رووبەڕووبوونەوەی سەرجەنت و پاسەوانەكان. رۆژی حەوتەم بڕیارمدا كۆتایی بەبەرگریی بێنم و زەینلعابدنیش لەپڕ ویستی خۆی پیشاندا بۆ خاوێنكردنەوەی سەرتاسەری زیندانەكە و فەرمانی دایە هەموو سەربازە بەندییەكان كەگسك و سەتڵ هەڵگرن و خۆشی بەو بۆنەیەوە بەرگی سەربازیی جەنگی پۆشی و وەك فەرماندەیەكی سەربازیی لەكاتی جەنگدا هەڵسوكەوتی ئەكرد بەدەنگێكی زل و فەرمانی توندەوە. دوای رێكخستنی ئەو دیمەنە پاسەوانێكی نارد بۆ قاوشەكەمان و پێی وتم لەبەڕێوەبەرێتیی داوایان كردووم. بەناو ریزی سەربازە بەندییەكاندا تێپەڕیم و گەیشتمە ئەو دەرگا زەبەلاحەی بەڕێوەبەرێتیی لەبەشی بەندییەكان جیائەكردەوە. زەینلعابدینم بینی بەسیما سەركەوتووانەكەیەوە، كەرووەكردە بەڕێوەبەرێتیی رێی پێگرتم.

-ئێستا یەكێك لەگسكانە هەڵئەگریت و ئەچیتە لای ئەو كۆمەڵە و لەگەڵیان گسك ئەدەیت و حەوشە گەورەكە خاوێن ئەكەنەوە.

پێم وت:

-نا، ناچم.

نەڕاندی:

-با ئەچیت..

و بۆكسێكی كێشا بە دەموچاومدا.

لەدڵی خۆمدا وتم: ((گەر ئەمجارە لێیان دام منیش دەست ئەكەمەوە))، بەڵام لەوساتەدا كەخۆم ئامادەی وەڵامدانەوە كرد، بەڕێوەبەرم بینی لەژوورەكەی خۆی لەسایەیەكدا و ئەبوعەبدە زلە و تاقمێك پۆلیسی بەدەورەوە بوو، بۆیە رێم بەخۆم نەدا دەست لەگەورەترین بەرپرسی مەزە بەرزكەمەوە و هەوڵمدا ماسولكەكانم خاویكەمەوە و بێدەنگ بەرگەی زەبرەكانی سەرجەنت بگرم.

بەدەم بۆکس وەشاندنەوە پێی وتم:

-ئەچیت بۆخاوێن کردنەوەی گۆڕەپانەکە!

منیش هەر ئەموت:

-نا، هەرگیز.

گەر بەڕێوەبەر نەهاتایە، بێگومان سەرجەنت لەدەست وەشاندن ماندوو بووبوو. ساکارانە لەسەرجەنتی پرسی:

-ها، ئەوە چییە؟

-جەنابی قایل نییە بچێت بۆ بێگاریی.

-بەڵێ، بەراستتە؟ وازی لێبێنە بۆخۆم، خۆم چاری ئەکەم و وای لێئەکەم پەشیمان بێتەوە لەو چاو نەترسییەی.

دوای قسەکانی پەلی گرتم و رایکێشامە پەنا دەرگای ئۆفیسەکەیەوە. لەهەموو لایەکەوە نزیکەی دە پاسەوان دەوریان دام. ئەبو عەبدە زلە لای راستی لێگرتم و ئامادەی پیاکێشان بوو. بەڕێوەبەر بۆ ئەم بۆنەیە پانزە کەسی لەو بەندییە پلەدارانەش تەیارکردبوو کەسزای زیندانی قورس درابوون وکاری هەمەجۆری کارگوزاریی و ئەمبارەکانی ئازووقەیان پێئەکردن.

پاشان بەڕێوەبەر بەبەرچاوی برسی و بزی ئامادەبووان و پەنجا بەندیی ترەوە، بەقامچییەکەی توند و دڕندانە کەوتە گیانم و هەرچی بەدەمیدا ئەهات لەجنێوی فۆلکلۆری عەرەب دریخی نەکرد و بەخۆم و باوك و دایك و خوشك و باوباپیرم و میلەت و نەتەوەکەمدا هاتەخوارەوە. عەلی عیسا بەتووڕەیی و بەلەسەبوونێکی ناماقووڵەوە لێیئەدام و بێ ڕاوەستان ١٠٠ قامچیی لێدام. بەوەش کە لەقامچیی سەدهەمدا هێشتا بەپێوە بووم،و لەسەر قاچ رەپ راوەستابووم و نە جوڵام،نەیەك وشەم وت،نە پاڕامەوە، بەڕێوەبەر

قامچییەکەی وەلانا و مشتی راستی نوقاند و بۆکسێکی سرەواندە چەناگەم. بۆکسەکەی هێندە بەهێز بوو هەستم کرد زەوی لەژێر پێمدا خزا و لەگەڵ خۆی رایکێشام.

کاتێك هۆشم هاتەوە سەیرەکەم لەکلینکی زیندانم و ئەبوعەبدە زلە بەزۆر گیراوەیەکی تاڵم دەرخوارد ئەدات کەبۆنێکی توندی ئەلکهولی لێئەهات و گوێم لێبوو پێم ئەڵێت:

-بیخۆرەوە، دەی خێرا هەموو پەرداخەکە بخۆرەوە، هێزت ئەداتەوەبەر، ئاخ لەئێوەی کورد، چاکتان ئەناسم. کەوتتان (نا) واتە نا و ئیتر مەحاڵە پەشیمان بکرێنەوە و قایلبکرێن بڵێن بەڵێ!

سەری بەراستوچەپدا رانەوەشاند وەك نیشانەی دەستەوەستانیی بەرامبەر کەللەرەقی و خۆڕاگریی کورد.

ئەو لێدانەی خواردبووم خستبوومیە دۆخێکەوە کەمرۆڤ بەزەیی پێمدا بێتەوە. ددانێکیان شکاندبووم و دەمم پربووبوو لەخوێن و لای چەپی چەناگەم وا ئاوسابوو کەدەمم دائەخست ئازاری ئەهات، جگەلەوەش پشتم ئەسوتایەوە و هەناسەی ئەبڕیم وەك ئەوەی کێوێکیان خستبێتە سەرسنگم. سەرجەنتی برینپێچ لەهێمنی و نەرمیدا کەسێکی جیاواز بوو لەسەرجەم کادرە سەربازییەکان و هەموو توانای خستبووە گەڕ بۆ چارەکردنم. بەشلەیەکی خستکەرەوە غەرغەرەی پێکردم و دەموچاوی پێچام و کەپسولی دژە تای دامێ و جەستەمی بە بۆیەی یۆد سوی. هەرهێندەی توانیم لەسەرپێی خۆم بوەستم یارمەتی دام بۆ گەڕانەوە بۆ شوێنەکەی خۆم. ئەو لێدانەی بەڕێوەبەری زیندان بۆی کردمە پاداشت هەموو بەندییەکانی مەزەی بەشێوەیەك وروژاندبوو، کەلەکاتی تێپەڕبوونمدا، سەرەڕای هاوار و هەڕەشەی پاسەوانەکان هورووژمیان هێنایە بەرپەنجەرەکان بۆ بینینم و دەربڕینی هاوسۆزیی. خەمۆکی بەسیمای بەندییەکانی راڕەوەکەمانەوە دیاربوو وەك ئەوەی خۆیان لێدانیان خواردبێ و چاوم لێبوو هەندێکیان فرمێسکی گەرمیان ئەڕشت و هەندێکی تر سنگیان ئەکوتا و نەفرینی یاساوڵەکانیان ئەکرد.

-چۆن وێرایان وات بەسەربێنن، ئەو دڕندە پۆخڵانە!

عەدنان وادی، ئەو لاوە کوردەی سزای ٣ ساڵ زیندان درابوو چونکە هەوڵی دابوو بەر بە کۆمەڵێك سەرباز بگرێت کە ویستبوویان دەستدرێژیی بکەنە سەر ژنێك لەشەقامە چۆڵەکانی دیمەشقدا، بینیم وەك منالێکی بچکۆلە ئەگری و نینۆکی ئەخوات:

-گەر وەك ئەو هیچوپوچانە کلاشینکۆفێکم پێئەبوو هەرهەموویانم ئەکوشت!

عەدنان ماوەیەکی ویست تاهێور بووەوە، تەنانەت بەدەم خەویشەوە ئاخوئۆفی بوو و جنێوی ئەدا بە ناسر و عەبدولحەمید سەراج و هەواڵگریی تایبەت و دادوەرەکان و بەڕێوەبەری زیندان و دەستوپێوەندەکەی.

دوای داخرانی دەرگەکان بەماوەیەکی کەم تام لێهات و دانەچۆقەم پێکەوت و کەوتمە وڕێنەکردن، تا هاوسێکەم بەپاسەوانەکەی وت. دەرەنگانێکی شەو سەرجەنتی برینپێچ هات و دەرزییەکی لێدام و کەپسولی خەوی دامێ.

ڕۆژی دواتر بەناستەم توانیم هەستم و ئازاری پشت و شانوملم هێندە پڕوکێن بوو کەنەمئەتوانی بەشی سەرەوەی لەشم ببزوێنم، بۆیە داوامکرد بمبەن بۆنەخۆشخانە، بەڵام لەترسی ئەوەی پزیشکی چارەسەرکەر ڕاپۆرتێك بنوسێت سەبارەت بەدۆخەکەم، بەڕێوەبەرێتیی داواکەمی ڕەتکردەوە بەبیانووی ئەوەی برینپێچەکە ئەتوانێت ئەوئەرکە ئەنجام بدات و سەرۆکاریی پێویستم بکات.

ڕۆژی شەممە هێشتا دیمەنی رووخسارم ترسناك بوو، پشتم لەپارچەیەکی برژاوی سوتاو ئەچوو. نەیانبردین بۆ دادگە. سەرجەنتە برینپێچەکە دڵسۆزانە و ماندوویی نەناسانە پێمەوە خەریك بوو و ئەوەی لەدەستی هات کردی تاشوێنەواری ئەوکارە دڕندانەیەی بوویووم بەقوربانیی بسڕێتەوە. لەماوەی دەرۆژدا ئاوساوییەکەی دەموچاوم و نەما بەڵام شان و پشتم ڕەش داگەڕابوون و دوومانگی پێچوو تائاسایی بوونەوە.

تانەمرۆش بەدەست شوێنەواری ئەو سەد قامچییەوە لەسەر شانم ئەنالێنم و جاری واهەیە خەون بە زیندانی مەزەوە ئەبینم و دیمەنی یاساوڵەکانی پۆلیسی سەربازیی دێتە بەرچاوم کەقامچی زەبەلاحیان بەدەستەوەیە و دان جیڕ ئەکەنەوە و وەك مۆتەیەك لەخەوم رائەپەڕێنێت.

شەمەی دووەمی دوای رووداوەکە کاربەدەستان کۆیان کردینەوە، من و هەڤاڵەکانم، بۆ راپێچ کردنمان بۆ دادگە، لەوێ باسی ئەو رەفتارە خراپەم کرد کەلەگەڵم کراوە و کراسەکەم هەڵدایەوە و پشتمم پیشانی سەرۆك دا، کەدیاربوو دیمەنەکە کاری تێکرد، بەڵام بەساردییەکەوە وەك رۆبۆت وتی:

-بەڵێ لەراستیدا ئەو بەسەرهاتەم بیستووە. ئێستا ئەوە کۆن بووە و زیندوو کردنەوەی لەژێر خۆڵەمێشەکەیدا بێسوودە.

ئامادەبووان کەزۆربە کورد بوون، ویستیان نارەزایی دەربڕن بەڵام کاربەدەستان بەزۆر لەهۆڵەکە کردنیانە دەرەوە. پاش کەمێك ئێمەشیان بردەوە بۆ زیندان. کاتێك زەینلعابدین بیستی لەدادگە چۆن رەفتارمان کردووە، هەمدیسان سواری کەری شەیتان بووەوە بۆ تۆڵەسەندن بەڵام لەدواساتدا تەلەفۆنێکی بۆکرا لەلایەن بەڕێوەبەری پۆلیسی سەربازیی زیندانی مەزە وە و لەنیازەکەی پەشیمانی کردەوە.

سەرەنجام کاتی بەرگرینامەکانمان هات و پارێزەرەکانمان لەکورد و عەرەب، ئازایەنە کەوتنە رسواکردنی بێهودەیی و زیادەڕەویی ئەو تۆمەتانەی ئاراستەمان کراوە، بەپێشکەشکردنی بەڵگە و بیانووی پشتیوانەدار.

-چییان کردووە تا بکەونە ژێر لێپرسینەوەی قانونەوە؟ ئایا بەکرێگیراوی وڵاتێکی دوژمن بوون؟ ئایا خۆفرۆشیی مەزنیان ئەنجامداوە و پەیوەندییان کردووە بەدوژمنەوە و نهێنیی وڵاتیان بەپارە فرۆشتووە؟ نەخێر، هیچ شتێکی لەوجۆرە نییە.

پارێزەرە عەرەبەکە پرسی:

-جەنابی سەرۆك، بەرێزان ئەندامانی دادگە،ئەوانەی لەبەردەمتاندا ئەیانبینن، کەسانێکی بەئابڕوون، پیاوانێکی پاك و نمونەیی کەبەرێزەوە بانگەشە ئەکەن بۆ گەشەپێدانی زمان و روناکبیریی و کەلتووری گەلی کورد. ئەمە هەمووبابەتەکەیە. ئەم گەلە قارەمان و وەفادار و سوارچاکە بوو، ئێمەی عەرەبیان، لەهەزار و یەك بۆنەدا لەتیاچوونی مسۆگەر رزگارکرد. باسەرلەنوێ مێژووی سەلاحەدینی مەزن بخوێنینەوە تا لەو راستییە دڵنیا بین.

پاشان نۆرەی پارێزەرێکی کوردی حەڵەب هات:

-پێش زیاتر لەهەشت سەدە، کورد هاتنە سوریا، نەك وەکو پەنابەرانێك بەدوای لانەیەکی ئارامدا بگەڕێن، بەڵکو وەك رزگارکەر. خۆرهەڵاتی ناوەڕاست بە میسر و فەلەستین و لوبنانیشەوە، سێ بەش زیاتری داگیرکرابوو لەلایەن فرەنسیی و ئەنگلۆ-ساکسۆنەوە. چۆن ولاتێك کەئەمڕۆ میسر و سوریا پێکەوە کۆنەکاتەوە رێ بەخۆی ئەدات رۆڵەکانی گەلێك بچەوسێنێتەوە کەخوێنێکی زۆری بەخشی بۆ رزگارکردن و پاراستنی عەرەب لەکارەساتبارترین ساتەکانی مێژوویاندا؟ ملکەچ پێکردنی کورد بۆ سیاسەتی عەرەباندنی زۆرەملێ، واتە ململانێ لەگەڵ مێژوو و دادپەروەریی و ئابڕوو و هاوکات رووبەڕووبوونەوەی نەریتە دیمۆکراسییە دێرینەکانی گەلی عەرەب، هەروەك واتای رێخۆشکردنیشە بۆ شۆڤینیزم و جیاکاریی زۆرەملێ و سەرەڕۆیی فاشییانە. بەرێزانی دادوەر، بیر لەهەموو ئەمانە بکەنەوە، پێش ئەوەی حوکمەکەتان بدەن و بڕیارەکانتان دەربکەن!

دوای هەفتەیەك لەپێشکەشکردنی بەرگرینامەی پارێزەرەکان، دادگە بواری دام لەبەردەمیاندا رای خۆم دەربڕم.

منیش باسی چالاکییەکانی دژەئیمپریالیزمم کرد لەسەرەتای لاوێتیمەوە و لەوکاتەوەی خوێندکاری ئامادەیی فەرەنسی بووم. پاشان نیشتەجێ بوونم لەسویسرا و دەستپێشکەریی

بۆدامەزراندنی کۆمەڵەی خوێندکارانی عەرەب. ئینجا باسی دیمۆکراسیی سویسرام کرد و یەکێتیی ئەو وڵاتە لەفرەیی و پێکەوەژیانی ئاشتیانەی چەندین میلەت و زمان و کەلتوور و ئاینزای جیاواز، جەختم کردە سەر رەسەنایەتی و هێز و دینامیکیی سویسرا و ئەو قازانجەی سوریا بەدەستی دێنێت ئەگەر بێت و رێزبگرێت لەتایبەتمەندیی زمان و کەلتووری میلەتە جیاوازەکان و کارکردن بۆ گەشەپێدان و رەخساندنی بوار بۆیان تاتێکەڵی کەلتووری عەرەب بن و دەوڵەمەندتری بکەن، لەجیاتی دژایەتیی کردنیان بەشێوازێکی شۆڤینیی وشك و کەللەرەقانەی تەسکبین و گۆشەگیر.

بەهانەکانم و لۆژیکی قسەکردنم، پۆزەتیڤانە کاری کردە داوەرەکان و نوقمی بیرکردنەوەیەکی قووڵی کردن، سەرەڕای هەڵسوکەوتە دژەکانی داواکار و رەفتارەکانی. لەلایەکی ترەوە هاورێیانمان لەدەرەوە لەهەوڵەکانیاندا بۆنەرم کردنی هەڵوێستی دەسەڵاتدارانی میسر-سوریا بەرامبەرمان، توانییان هەڵمەتێکی فراوانی نارەزایی رێکبخەن. کوردانی عێراقیش کەپەیوەندیی باشیان لەگەڵ قاسم درووست کردبوو، کەوتنە پەلاماردانی ئاشکرای ناسر و رژێمەکەی و چەندین شاند و بۆچەندین رۆژی لەدوای یەك، چوونە بەردەم باڵیۆزخانەی کۆماری یەکگرتووی عەرەبی لەبەغدا و دوای ئازادکردنی ئێمەیان نەکرد، کوردانی لوبنانیش هەمان هەوڵیان خستەگەڕ لەمیدیای دیمۆکراسیی لوبناندا و لای باڵیۆزخانەی کۆماری یەکگرتووی عەرەبی لەبەیروت. هاورێ سویسرییە هاوسۆزەکانیشمان، تکانامەیەکیان ئاراستەی دەسەڵاتدارانی میسر-سوریاکرد، بەئیمزای سەدان کەسی بواری ئەدەب و هونەر و زانست. یەکێك لەوەفادارترین هاورێکانیشم، گیلبرت بایشتۆلد، پارێزەرو راوێژکاریی نیشتمانی سویسری، بڕیاریدا لەگەڵ کۆمەڵێك هاورێی تردا ئامادەبن بۆ بەرگریی لێکردنمان لەبەردەم دادگەی سەربازیی دیمەشق. کوردانی نیشتەجێی فەرەنساو ئەڵمانیا و سوید و بەلژیکا و ئینگلتەرە و ئیتالیا و هاورێکانیان لەو وڵاتانە پشتیوانییان بۆدەربڕین و داوایان کرد لەنوێنەرایەتی کۆماری یەکگرتووی عەرەب لەو وڵاتانە کەئازادمان بکەن.

هەموو ئەودەستێوەردان و تکاکارییانە رۆڵێکی گەورەیان هەبوو لەخاوکردنەوەی رادەی شێتگیریی دەسەڵاتی سیاسی بەرامبەرمان،بەهۆیانەشەوە سزاکانی هەتاهەتایی گۆڕدرا بۆ ساڵ و ساڵ و نیو و سزاکانی ٧-١٥ ساڵ گۆڕدرا بۆ ساڵ و حەوت مانگ زیندان. بەهیمەتی ئیمزای کەسانی ناسیاو و نەناسیاو لە سێدارە دەربازبووم.

دوای بەسەربردنی شەش مانگ لەزیندانی سەربازیی مەزە، ئەبوو من و هەڤاڵانی پارتی دیمۆکراتی کوردی سوریا، بگوێزرێنەوە بۆ بەندیخانەی ناوەندیی دیمەشق، ئەو قەڵا سەختەی سەلاحەدینی دروستی کردبوو.

رۆژی ٥ ی ئازاری ساڵی ١٩٦١ دادگە حوکمەکەی دەرکرد و بەڕێوەبەرێتیی مەزە ئاگاداری کردین خۆئامادە بکەین بۆ رۆشتن. بیرۆکەی جێهێشتنی زیندانێکی دەرەوەی شار، لەسەربەرزاییەکانی دیمەشق،کەبەپێی رێنمایی سەربازیی بەڕێوەئەبرا و پابەندی هەواوهەوەسی پۆلیس و یاساوڵەکان بوو، و چوونە بەندیخانەیەکی سڤیلی ژێر دەسەڵاتی پۆلیسی ئیداریی ناسراو بەنەرمیی و خۆشەویستیی خزمایەتیی و لەناوەڕاستی شاردا، هەموومانی شادمان کرد. بۆیە خێرا کەوتینە خۆکۆکردنەوە و دابەشکردنی کەلوپەلەکانمان بەسەر سەربازە بەندییەکاندا، رۆشتنمان بووە خەفەت بۆ هەندێك لەوەنەدارانەی رۆژانە شتێك پارەی کەمیان ئەدانێ بەرامبەر هەندێك خزمەتی بچووك. ئەوانی تریش پیرۆزباییان لێکردین و ئیرەییان ئەبرد بە رزگاربووغان لەدڕندەیی و (سادیست)ی عەلی عیسا و زەینلعابدین و ئەبو زەتور. بەڵام عەدنان وادی، هاوڕێ گەنجەکەمان کەدانیشتووی گەڕەکێکی کوردنشین بوو، خەمباری ئەوەبوو کەئەویش بەهۆیانەی ئێمەوە نەگیراوە و نەگریا:

-لەناوچوونی ئەم رێژیمە زۆر ناخایەنێت و هەموو ئەوانە ئازاد ئەبن کە بەناهەق حوکم دراون و رێزیان پێئەدرێتەوە.

ئێمەش بۆ دڵدانەوەی پێمان ئەوت:

-لەدەرەوەی زیندان بەئازادیی یەك ئەبینین، و پێكەوە ئەكەوینە خزمەتی میلەتەكەمان و مرۆڤایەتیی بۆ بەدیهێنانی پرۆژە مەزنەكان. تا ئەوكاتەش پێویستە سوود لەژیانی زیندان وەرگریت بۆ درێژەدان بەخوێندن و ئەنجامدانی تاقیكردنەوە.

دوای دابینكردنی رێوشوێنی تایبەت بەگواستنەوە وچوونەدەرەوەمان، بەڕێوەبەرێتیی مەزە ترنجاندینیانە(لۆرییەكی سەوزەوە)و بەپاسەوانییەكی توندەوە بەرەو ناوشار راپێچیان كردین. لەپەنجەرە بچووك و شیشبەندەكانەوە سەیرمان ئەكرد وەك خەون ببینین بەوخێوانەوە كە لەشەقام و گۆڕەپانە گشتییەكانی شاردا هاموشۆیان ئەكرد.

دوای تێپەڕین لەبازاڕی خواجە، یەكێك لەكەنارە هەر شلۆقەكانی دیمەشق و جەنجاڵ بەبازرگان و دەستفرۆش و فرۆشیار و كڕیاری هەمەجۆر، بەهۆی شوتەكەیەوە، ئۆتۆمبیلەكە توانی بگاتە بەردەم دەروازە زەبەلاحەكەی قەلآی سەلآحەدین.

پۆلیسەكان كەبێگومان ئاگاداركرابوون لەگەیشتنمان، رێیاندایین بچینە حەوشەی دەرەوە و لەوێوە راپێچیان كردینە ژوورەوە. كارمەندێكی سڤیل، لەسەر زەوییەكە لەپشت تەپڵەكێكی گەورە دانیشتبوو كەتەنیا سەرە زلە رووتاوەكەی بەدەرەوەبوو و ئینجاهەردوو قۆڵ و باسكە تووكنەكەی، لەئۆفیسێكی بچووكی سیخناخ لە دۆسییە و بەڵگەنامەدا یەك لەدوای یەك پێشوازیكردین بۆ بەرێكردنی رێوشوێنی تۆماركردن، پاشان دابەشیان كردین بەسەر خەوگەی ئەو(میوانانە)ی حوكمی ئەوپەڕی دووساڵ درابوون.

من و ٣ هاوخەباتی ترمیان بردە خەوگەیەكەوە كەرێك بەرامبەر نووسینگەكانی بەڕێوەبەرێتیی بوو. كۆلۆنێل (وەجیە بەرازی)، كوردی خەڵكی حەڵەب بەڕێوەبەری زیندانەكە بوو، كەلەئەفسەرێكی سوپاوە گوێزرابووەوە بۆ ریزی پۆلیس، بەوهۆیەی ساڵی ١٩٥٨ لەپەلامارێكدا بۆسەر هێزێكی ئیسرائیل لەسنووری جۆلان، گولەیەك سكی پێكاپوو. ئەویش هیچ هەلێكی لەدەست نەئەدا، بۆ پیشاندانی ورگە برینداره‌كەی بەوكەسانەی بەگومان بوون لەئازایەتیی و دڵسۆزیی ئەو بۆ نیشتمان. پارێز و وریایی

پێوەدیاربوو بەرامبەرمان،بێگومان لەترسی بایەخدانی زۆر بەداواکانمان وگوێگرتن لەرێنمایی هاورێ دەرەکەکییەکانمان کەلەنزیکەوە ئەیانناسی.

هەندێك جاریش ئازایەتیی و چالاکیی خۆی سەلماندبوو، بۆنمونە: لەبەشی تایبەت بەحوکمدراوە گەورەکان توانیبووی شێوازی فێرکردنی نوێ بەکاربهێنێت، ئەویش بەرێکخستنی پۆلەکان لەچەند ئاستێکدا کەپرۆگرامی فەرمیی تیا پەیرەوئەکرێت، و هەولێشی دابوو بەپێی توانا مامۆستا لەنێو بەندییەکاندا هەلبژێرێت.

هەرخێرا من و هەندێك لەهەڤاڵە بروانامەدارەکانم خۆمان کاندید کرد بۆ وانەبێژیی لەزینداندا، کەچی رەتیانکردینەوە: (لەبەرئەوەی بەهۆکاری سیاسییەوە حوکم دراون).

بەندییەکان بەدەستپێشکەریی کۆلۆنێل بەرازی تیمی باسکە و بالەیان درووست کرد، کەلەو بوارەشدا و بەهەمان هۆکار داوایەکی منیان رەتکردەوە.

ئەمانە تەنیا جیاکاریی نەبوون بەرامبەرمان کەخەمگینیان ئەکردین، بەلکو جێخەوەکانمان بەتەنیشت ئاودەستەکانەوە بوو کەدەرگەیان پێوەنەبوو و بۆگەنیان لێئەهات و کاتێك تکامان لەبەرێوەبەرێتیی کرد جێگۆرکێمان پێ بکەن یارێمان بدەن بگوێزینەوە ئەو جێخەوانەی بەرامبەر دەرگای ئاسنینی قاوشەکەن، وەلامیان داینەوە هەموو قاوشەکان سیخناخن و ئەبێت چاوەرێ بین تا سەرەمان دێت و وردەوردە لەدەرگەکە نزیك ئەبینەوە. هەرجارێکیش بەندییەك ماوەی زیندانییەکەی تەواو ئەکرد، جێخەوەکەی چۆل ئەبوو،چەندین بەندیی هوروژمیان ئەبرد بۆجێگرتنەوەی و ئەبووە و شەر و لێکدانی راستیی لەنێوانیاندا. ناچار بووین دوومانگ چاوەرێ بکەین و زۆرمان ئۆقرەگرت، ئەشبوو پشی پشی بۆ پاسەوانەکان بکەین و بەرتیلیان بدەینێ تابتوانین لەدەرگەکە نزیك ببینەوە و هەوایەکی خاوێن هەلمژین!

بەلام بەراورد بە مەزە، ئەم زیندانە گەلێك باشەی هەبوو، دەرگەکان لەسەعات هەشتی بەیانیی تا نیوەرۆ و لەسەعات دووی پاشنیوەرۆ تا شەشی ئێوارە ئەکرانەوە و ئەمانتوانی

هەموو جۆرەکەسێك و لەهەمووجێیەکی سوریاوە لەناوبەندییەکاندا ببینین. باسی ئەوتاوان و کارانەی خۆیان بۆ ئەکردین کە بەهۆیەوە کەوتبوونە زیندانەوە. تێبینیمان کرد زۆربەیان قوربانیی بارودۆخی سەخت و ساویلکەیی، یا قوربانیی ژینگەی خێزانیی و کۆمەڵایەتین. زۆر نمونەی وەك ئەو نەگبەتەی گەڕەکی کوردانی دیمەشق(حی الاکراد)م بینی کەحەوت ساڵ زیندانی بۆ بڕابووەوە لەبەرئەوەی براکەی خۆی بەقەزاوقەدەر کوشتبوو، وئەشبوو بچێتە ژێرباری دەرەنجامە کۆمەڵایەتیی و مرۆییە کارەساتبارەکانی، کەچی سەیرنەکەیت کارمەندێکی بێ ئابڕوو تەنیا دووساڵ زیندانی بەسەردا دراوە چونکە پارەی وڵاتی دزیوە، کە بەرامبەری نزیکەی ٢٠٠ هەزار فرەنکی سویسرییە. ئەم زەلامە جگە لەوەی پارەکەی قایم کردبوو و پێی نەگیرابوو، لێرەش وەك کارمەند هەڵسوکەوتی ئەکرد و پارەیەکی باشی دەستەکەوت لەکاری عەرزەوحاڵچێتی لەحەوشەی زیندانەکەدا. لەسەر کورسیەك لەپشت مێزێکی بچووکی سەفەرییەوە دائەنیشت وئەرزەوحاڵ یا نامەی بۆ ئەوبەندییانە ئەنوسی کەنەخوێندەوار بوون یا توانیان نەبوو نامە ئاڕاستەی لایەنە فەرمییەکان بکەن.

لەناو بەندییەکاندا ژمارەیەکی زۆری لەوانە تیابوو کەوەك پێیان ئەوترا(ئابڕووی خێزانەکانیان کڕیبووەوە)، بۆنمونە باوکانێك کە کچەکانی خۆیان کوشتبوو یا برا خوشکی خۆیان خنکاندبوو بەبیانووی ئەوەی (تاوانیان ئەنجامداوە) و ئابڕووی نەریتە باوەکانیان پێشێل کردووە.

زۆربەی بەندییەکان کاتەکانی خۆیان بەدروستکردنی جزدان و جانتای ژنانە لەمتومورووو بەسەرئەبرد و ژمارەیەکی زۆری بەندییەکانیش گوزەرانی خۆیان لەفرۆشی متوموروو و دەرزیودەزوو یافرۆشتنی بەرهەمەکانیان دابین ئەکرد.

هەندێك لەهەڤاڵەکانیشمان لەبواری ئەم پیشەیەدا بوونە پسپۆڕ و بەرهەمی(یادەوەریی زیندان)یان بۆئەو بەندییانە درووست ئەکرد کە لەکاری دەستیدا کۆڵ بوون.

پێنج مانگی دوایی حوکمەکەمان بێ گرفت تێپەڕی و ئیتر ڕووبەڕووی بێگاریی و سوکایەتی پێکردن و ئەشکەنجە نەئەبووینەوە.

لەڕۆژانی کۆتایی زیندانماندا، کۆلۆنێل بەرازی کەهێشتا ٤٠ ساڵی تەمەنی تێنەپەڕاندبوو، وەك زۆر لەئەفسەرە کوردەکان خانەنشین کرا، سەرەڕای دڵسۆزیی بۆ ڕژێم و ملکەچیی بۆ لۆزەنەرەکانی ناسر و بەهرە و تواناکانی وەك بەڕێوەبەر و پەروەردەکار. جێگرەکەی کەیاریدەدەرێکی سادەبوو، بەڕێوەبەرێتیی زیندانەکەی پێسپێردرا، لەناو ژاوەژاوی زیاتر لە ٣ هەزار بەندیدا. هەر ئەویش لە ٨ ی ئابی ١٩٦١ دا فەرمانی ئازادکردنمانی ئیمزا کرد.

سەرلەبەیانی ڕۆژێکی خۆش ئازادیم بینییەوە و هەوای پاکم هەڵئەمژیی و قاچەکانم شل و خاو و دڵم ئاسوودە و شادمان و خۆشحاڵ شەقمەکانی دیمەشقم تەی ئەکرد، هەرچەندە ئەشمزانی بەردەوام چاودێریم ئەکەن و بەدواوەمن. لەپڕێکدا سەیرئەکەم لەناو ئاپۆرەی ئەو خەڵکەدام کەلەکاری ڕۆژانەیاندا نوقم بوون، لەناو ساردەمەنی و شەربەت فرۆشاندا، کەبەدەنگی بەرز هاواری کاڵاکانیان ئەکرد. تەزوویەك بەلەشمدا تێپەڕی و پڕی کردم لەچێژ و شادیی.

چۆن توانیم ئەو هەموو ماوەیەی ژیانم لەپشت دیوارە کۆنکرێتییەکانەوە بەسەربەرم لەکاتێکدا دیمەشق ئاوا ژیانی لێ هەڵئەقوڵێت؟

لەدەرەوەی شوراکانی مەزە زۆر شادمان بووم بەڵام هێشتا هەستم ئەکرد تەواو ئازاد نیم، بۆیە کەوتمە خۆ، تا دیسان ڕابێمەوە لەگەڵ واتای ئازادی و ژیانی (سروشتیی).

یەکەم ئائومێدیم تووش بوو، کاتێك سەیرم کرد کۆمپانیاکەم کەتایبەت بوو بەهێنان و ناردن لەکاتی گیرانمدا زەوت کراوە و تێکدراوە و بودجەکەی زیاتر لە ٥٠٠٠٠ فرەنکی سویسریی کورتی هێناوە، بۆیە ناچاربووم خۆم کارەکان بگرمەوە دەست و لەسفرەوە دەست پێبکەم.

# سوریا

- راهاتنەوە لەگەڵ ئازادیی

- دارمانی یەکێتیی نێوان میسر و سوریا

- ئەزموونی کاندید-نوێنەر لەپەرلەمانی سوریا

- کودەتای سەربازیی و هاتنە سەرکاری پارتی بەعس

- چەند مانگ ژیانی نهێنی لەناو خێزانەکوردەکانی دیمەشقدا

گەندەڵیی سیستەمی ئابووریی و تێکچوونی هاوسەنگییەکەی بەهۆی دەسەڵاتی ناسرەوە لەسەر سوریا(بەتایبەت سیاسەتی خۆماڵیکردنی بانکەکان و کۆمپانیا گەورەکان و زەوییەکان)کارەکەی منیان سەختتر کردبوو، سورییەکانیش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاترو زیاتر هەڵئەچوون و تووڕەبوون لە(داگیرکردنی)وڵاتەکەیان لەلایەن میسرەوە و بەئاشکرا نارەزاییان دەرئەبڕی و بەدوای ڕێگەیەکی ڕزگاربووندا ئەگەڕان.

ئاخۆ لەناو ئەم دۆخە بێسەروبەرەدا ئەمتوانی ئارامیی و ئاسوودەخەیاڵیی بدۆزمەوە؟ لەڕاستیدا ئاواتی ئەوەم ئەخواست،تا ئەوڕۆژەی پیلانێکی پیاوانی هەواڵگریم بۆئاشکرابوو،بەناوی بازرگانییەوە ژوورێکیان بەرامبەر ئۆفیسەکەم بەکرێ گرتبوو و لەوێوەوە چاودێرییان ئەکردم، جارجارەش بەبیانووی چاکردنی کێشەی تەلەفۆنەوە ئەهاتنە نووسینگەکەم تابزانن کێ میوانمە.

لەگەڵ ئەوەدا و سەرەڕای ئەو چاودێرییە توندەی وەك کۆتوبەند دەوری دابووم، بەڵام توانیم بەشداری چەند کۆبوونەوەیەکی سڤیلیی و کادرەسەربازییەکان بم کە بڕیاریان دابوو سوریا لەچنگی دیکتاتۆرییەتی ناسریی دەربازبکەن. نارەزایی بەجۆرێك تەشەنەی سەندبوو، کە عەبدولحەمید سەڕاج کەوتبووە گومان لە دڵسۆزیی و وەفای خۆی بۆناسر،پیلانگێڕەکان هەوڵیاندا هانی بدەن بۆیاخی بوون،بەڵام کەمتەرخەمیی کرد. ناسریش بەپەلە ژەنەراڵ عامری فەرماندەی گشتیی هێزەچەکدارەکانی کۆماری یەکگرتووی عەرەبی نارد بۆ سوریا، ودوای ئەوەی عەبدولحەمید سەڕاجی دەستبەسەر کرد، کەوتە گواستنەوەی ئەو ئەفسەرانەی گومان لەدڵسۆزییان هەبوو، بەڵام نەیتوانی ڕۆڵەکەی تەواو بکات، چونکە بەرەبەیانی ڕۆژی ٢٨ ی ئەیلولی ساڵی ١٩٦١ هەندێك یەکەی سەربازیی سوریا بەفەرمانەیی کۆلۆنێل نەحلاویی سەرۆکی ئیدارەی فەرمانبەرانی ئەرکانی گشتیی و کۆلۆنێل حەیدەر خوزبەری

بەرپرسی هێزی گمرۆك، لەکۆشکەکەیدا لەئەبورومانەی دیمەشق غافلگیریان کرد ویەکسەر ناردیانەوە بۆ میسر.

رۆژی دواتریش کەوتنە لەقاودان و ریسواکردنی یەکێتیی نێوان میسر و سوریا، ئیتر دەیان هەزار ئەفسەر و سەربازی میسریی کە لەسەرتاسەری سوریادا بلاوکرابوونەوە، بەتایبەت لەسنووری ئیسرائیل خۆیان رادەستی مشتێك ئەفسەر و سەربازی سوریی کرد.

ناسر لەبەردەم ئەو پێشهاتەدا نەیوێرا دەستێوەردانی سەربازیی بکات، بەڵکو ئیزگەی بەکارهێنا بۆ پشتیوانیی و رێنمایی پیاوەکانی و هاندانی جەماوەری سوریا و عێراق دروستکردنی پشێویی و ئاژاوە لەسوریادا.

لەکاتەدا دەسەڵاتدارانی نوێی سوریا هەڵوێستی توندیان دژی لایەنگران و هاوسۆزانی ناسر وەرگرت و مەئمون خوزیریی،کەپێشتر ئوستاد بوو لەزانکۆی دیمەشق،راسپێردرا حکومەتێك دامەزرێنێت کەزیاتر لەکەسانی سیڤیل پێك بێت. و پاش ماوەیەکی کەم رایانگەیاند کە لە ٥ی کانوونی یەکەمدا (هەڵبژاردنێکی ئازاد) ئەنجام ئەدرێت.

بەهۆی کاریگەریی گەورەی دەستگیرکردنەکەم لەسەر کوردانی جەزیرە، و ئەو هەموو جۆرەی ئەشکەنجەیەی کەخۆیان لەماوەی دەسەڵاتی ناسردا گرفتاری بووبوون، هانیاندام خۆم کاندید بکەم بۆپارلەمان و بروایان وابوو هەڵبژاردنە چاوەروان کراوەکە (ئازاد) ئەبێت.

بێگومان کەسێکی زۆر رووناکبیر لەدیمەشق سەرۆکی حکومەت بوو، پیاوێکی سەر بە بۆرژوازیی لیبرالیی و بەجۆش و بەپەلە، تا لە سوریا ئازادیی و دیمۆکراسیی بەرقەرار بێت، بەڵام دەسەڵاتی تەواو هێشتا بەدەست سوپاوە بوو و ئەفسەرانی لاو باوەرێکی نەتەوەپەرستیی شۆڤینیی کورت بینیان هەبوو کە بەدژایەتیی کورد ناسرابوو.

من کەپێشبینیم ئەکرد سنووری ئازادیی رێپێدراو لەم (هەڵبژاردنە ئازادەدا) چەندە، بۆیە پێشنیازەکانی پارتی دیموکراتی کورد(کەهێشتا نهێنی بوو)م رەتکردەوە، بەڵام ئەمە نەبووە رێگر لەئەندامانی پارتی دیمۆکراتی کوردی سوریا و بەردەوام بوون لەنامە و بروسکە

ناردن و قسەکردن لەگەڵم بە تەلەفۆن و داوایان ئەکرد بچم بۆ قامیشلی،کە زانییان دوودڵم لەوەڵامدانەوەیان، پەیوەندییان کرد بەکاکمەوە و ئەویش داوای لێکردم وەڵام بدەمەوە و ملکەچی ویستی جەماوەر بم.

رۆژێکی ناوەڕاستی مانگی تشرینی دووەم سواری فڕۆکە بووم بەرەو قامیشلی، لەفڕۆکەخانە پێشوازییەکی گەرم کرام، بەلای ئەو کەسانەی سەرکوتکردن بووبووە خۆراکی رۆژانەیان، بووبوومە کەسێکی سوپەرمان کە ئەتوانێت دەرمانێکی جادوویی بۆهەموو ئازار و مەینەتییەکانیان بدۆزێتەوە.

کاتێك گەیشتمە لای کاکم، هاوڕێ و دۆستان کەوتنە گوشارهێنان تا تەنانەت یەك خولەکیش بەفیڕۆ نەدەم و کاندیدییەکەم پێشکەش بکەم و گروپێکی یاریدەدەران دیاریی بکەم، کە ئەوەش کارێکی ئاسان نەبوو.

بەپێی سەرژمێرییەکی ناتەواو و ساختە کەلەسێبەری ئینتدابی فەرەنسیدا بووبووە نەریت، ناوچەی هەڵبژاردنی ئێمە مافی چوار نوێنەری هەبوو: ( هاووڵاتییەکی کوردی تەعریبکراو، سریانییەکی ئارتۆدۆکس، کوردێك و عەرەبێکی دێهات). جگە لەوەش فەرەنسییەکان نەریتێکیان بەمیراتیی بۆدەسەڵاتدارانی سوریا جێهێشتبوو، کەسەرۆکی خێڵی شەممەری عەرەب،بەبێ بەشداریی هەڵبژاردن وەك ئەندام قبوڵ بکەن، سەرەڕای ژمارەی کەمی شەممەر لەسوریا، چونکە زۆرینەیان لەسەر خاکی عێراق،لەنزیکی سنوور نیشتەجێن.

ئەم شێوازەی کارسازیی جەورێکی زەق بوو، چونکە بەپێی ئامارەکانی دۆسییەی سیڤیلی قامیشلی، لەنێوان ٥٠٠٠٠ دەنگدەردا کەزۆرینەیان کورد بوون، تەنیا ٤٠٠٠ عەرەب و ٥٠٠٠ ناموسڵمان( کریستیان بەهەموو ئاینزاکانییەوە، کەزۆرینەیان سریانی ئارتۆدۆکسن و لەگەڵ جولەکە)، لەوناوچەیە نیشتەجێن.

وێڕای ئەو کوردانەی لەدۆسییەی سیڤیلدا تۆمار کراون، زیاتر لە ۱۰۰۰۰۰ کورد هەبوو کەناویان تۆمار نەکرابوو و دواکانیان بۆ وەرگرتنی ڕەگەزنامە چەندین ساڵ بوو لەئەمبارەکانی سەرای کۆنی دیمەشقدا تۆزی لێنیشتبوو. ئەم کوردانە بەخەڵکی سوریا دانەئەنران، کەچی ئەبوو خزمەتی سەربازیی زۆرەملێ بکەن (بەتایبەت لەبەرەی ئیسرائیل)، و ئەو ناسنامەیەی لەسوپا وەریان ئەگرت، تەنیا مافی هاتوچۆی ناو سوریای ئەدانێ، و هەموو دەرگەکانی فەرمانبەریی گشتیی و خوێندنگە حکومییەکان بەڕوویاندا کلۆم درابوو.

جگە لەم کوردە (ناسوریی)انە، لەراستیدا دەیان هەزار کوردی تۆمار کراو لەدۆسییە سیڤیلەکاندا،ناویان لەلیستەکانی هەڵبژاردندا دەرنەچووبوو، هاوکات چەندین کوردی تریش سەرەڕای بوونی ناویان لەدۆسییەکانی سیڤیلیدا، ناسنامەیان نەدابوونێ و لەمافی دەنگدان بێبەش کرابوون.

رۆژی ۲۰ ی تشرینی دووەم بەفەرمیی ناوی خۆم وەك کاندیدی هەڵبژاردن تۆمار کرد و هەمان رۆژ دیدارێکی درێژخایەنم هەبوو لەگەڵ فەرماندار(قائیمقام)ی شارەکە.

بەبێزارییەکەوە پێی وتم:

-ڕێنمایی پێویست ئەدەمە کارمەندانی بەرپرس تا بەپێی توانا مافی کوردانی زوڵم لێکراو، لێرە بگێڕنەوە بۆیان. بەڵام لەبەر ئەوەی کاتێکی کەمان ماوە تا هەڵبژاردن، نیگەرانم کەناتوانم وەڵامی هەموو داواکانی ئەو کەسانە بدەمەوە.

وەڵامم دایەوە:

-گەنجەکانمان ئەتوانن کارئاسانیی بۆ کارمەندەکانتان بکەن، ئەگەر پێتان خۆش بێت.

رۆژی دواتر حەوشەی سەرا جمەی ئەهات لەسەدان جوتیاری کورد، هەندێکیان ناسنامەکانیان ئەدایە خۆبەخشەکانی ئێمە و هەندێك داوایان ئەکرد ناونیشانیان تۆمار بکرێت. کارمەندەکانی کەسێتیی کە لەهەموو لایەکەوە داواکارییان بەسەردا کەوتبوو،

چەندین دۆسییەی زەبەلاحی پێکەوە بەستراویان لەسەر مێزێك والا کردبوو و بەدوای ناوەکاندا ئەگەڕان پێش تۆمارکردنیان.بەوشێوەیە، چەند ڕۆژێك پێش هەڵبژاردن ناوی زیاتر لەهەزار کەسی ناسنامەدار بەشێوەیەکی قانونیی لەلیستی دەنگدەراندا تۆمار کرا.

لەبەر ئەوەی پارتی دیموکراتی کورد لەسوریا باوەڕی وابوو زۆرینەی دەنگدەران لەکورد پێکهاتوون و زۆربەشیان دەنگ ئەدەنە لیستەکەی من، بۆیە ویستیان ئەو بنەمایەی هەڵبژاردن کە لەئینتیدابی فەرەنسیەوە بەمیرات مابووەوە بگۆڕن، ئەویش بەوەی لیستەکەی من جگە لەناوی خۆم وەك شارنشین، دوو کوردی دێهات و سریانییەکی قامیشلی تیابێت. یەکێك لە دوو کوردەکە ئەندامی پارتی و ئەوی تریان ئەندام پەرلەمانێکی پێشووی هاوسۆزمان بوو، سریانییەکەش زمانی کوردی قسەی ئەکرد و خۆی بەکورد ئەزانی.

کاریگەریی ئەم(تازەگەرییە)زەبرێکی بروسکە ئاسا بوو.لەگەڵ پێکهێنانی لیستەکەمدا، ئەفسەری هەواڵگریی سەربازیی، لەبێلایەنیی، کەتا ئەو ساتە پابەندی بوو، هاتە دەر و کەوتە گەرپێکردنی خۆم و لایەنگرانم و لەناوچەکانی هەڵبژاردنی سەر بەقامیشلی زۆریان بۆبەرپرسانی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکەم هێنا ودەستبەسەریان کردن، نوێنەرانی ئەفسەرەکە هاتنەلام و(دۆستانە)ئامۆژگارییان کردم لیستەکەم هەڵوەشێنمەوە و لیستێکی تر پێکبهێنم لەگەڵ (ئەو کاندیدانەی بەلای سوپاوە گونجاو بوون).

کەئەوەشم ڕەتکردەوە، هاوپەیمانییەکیان پێکهێنا لەلیستێکدا بەسەرۆکایەتیی تەلعەت عەبدولقادر کە بەرەچەڵەك لەخێزانێکی دێرینی قامیشلی بوو، بەڵام بەقووڵیی بووبوونە عەرەب و پێشتر فەرمانده بوو لەهێزی ئاسمانی سوپای سوریا. ئەویش دوو شێخی لەخێڵی(تەی)عەرەبی لەلیستەکەیدا دانابوو وەك یاریدەدەر کەتەواو نەخوێندەواربوون، ئەگەرچی بەپێی قانون، ئەبوو کاندیدی ئەندامێتیی پارلەمان خوێندەوار بێت،

سریانییەکەی لیستەکەی عەبدولقادر برایەکی ئەسفەرنەجار بوو، کەیەکێك بوو لەگەورەترین دەوڵەمەندەکانی سوریا.

بەرامبەر ئەو گروپەی سوپا پشتیوانی ئەکرد و پارەیەکی زۆری لەبەردەستدا بوو، رۆژ بەرۆژ گرەوەکەمان سەختتر ئەبوو.

من و تیمەکەم هەم چاوەڕێی دەنگی خەڵك بووین و هەم سەرچاوەی دارایی بۆ خەرجی پڕوپاگەندەی هەڵبژاردن.لەهەر شارێکی هەرێمەکە نووسینگەیەکمان دانابوو تا لایەنگرانمان بتوانن سەردانی بکەن و بحەوێنەوە وگفتوگۆ بکەن و پیاڵەیەك چا بخۆنەوە. جگەلەوەش ئەبوو لەگیرفانی خۆمان ولیستەکەمان و هەندێك بڵاوکراوە چاپ بکەین و ئۆتۆمبیل داین بکەین بۆ هاتوچوون و گواستنەوەی لایەنگرانمان بۆ ناوەندەکانی دەنگدان چونکە ئەم بنکانە لەدێهاتەکان ژمارەیان کەم بوو و دووریش بوون لەیەکەوە. من و هاوڕێکانم ئەو هەموو خەرجییەمان پێ هەڵنەئەسوڕا، بەڵام خۆشبەختانە میللەت، ئەو خەڵکە دێهاتییەی کە پێیان ئەوترا (بێهۆش و خەوتوو و کێویی)،ئامادەییان پیشاندا پارەکانیان بکەنە قوربانی ئێمە، ئیتر ئەو جوتیارانەی بەهەزارحاڵ بژێویی خۆیان پەیدا ئەکرد، دەیان هەزار لیرەی سوریان بۆ کۆکردینەوە و گروپی بەرامبەر کە داوای ۲۵ لیرەی لەهەر دەنگدەرێك ئەکرد، ئەم ئەنجامەی بەلاوە زۆر ناکاو بوو.

عەرەبە دژە کوردەکانیش بەتایبەت ئەفسەرەکان پێیان وابوو ئەم رەفتارەی گەلی کورد (ترسناك و هەڕەشەیە) و کەوتبوونە دانەجیڕە و لەناو خۆیاندا سوێندیان خواردبوو خرۆشی هەستی نەتەوەیی کورد خامۆش بکەن.

ئەو دەمە هەڵمەتی هەڵبژاردن گەیشتبووە ترۆپك و کاندیدانی لیستەکەم بەناوچەکەدا ئەگەڕان و سەردانی یەك بەیەکی گوندەکانیان ئەکرد، بۆدروستی کردنی پەیوەندییەکی نوێ لێرە و گوتاردانێك لەوێ و ئاگادارکردنی لایەنگرانمان لەهەڵچوون و هاربوونی رکەبەرەکانمان و هاندانیان بۆ رووبەڕووبوونەوەی هەڕەشە و دەستێوەردانی کاربەدەستان.

لای خۆمەوە و سەرەڕای ئامۆژگاریی هاوڕێکانم و ئەو بانگهێشتانەی پێم ئەگەیشت، بەڵام بەباشم زانی لەماڵەوە بمێنمەوە لەبری ئەنجامدانی هەڵمەتەکە. لەگەڵ ئەوەش ٣ ڕۆژ پێش هەڵبژاردن هەردوو شاری عامودا و دەرباسیە کە لەدوای یەك ٣٠ کیلۆمەتر و ٦٠ کیلۆمەتر لەقامیشلییەوە دوورن، بانگهێشتیان کردم و هێندە جەختیان کرد تا قایل بووم و وەڵامی ئەرێنی داواکەیانم دایەوە و پاش نیوەڕۆی ڕۆژی کانونی یەکەم هاوڕێیەکم خۆبەخشانە و بەرۆژ گەیاندمی.

لەدەروازەی شاری عامودا سەدان گەنجی هاوسۆز بەگەرمی پێشوازییان کردم لەبنکەیەکی کۆنی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد. دوای دروشمدان و هاواری ڕێزلێنان، بەریان بەئۆتۆمبیلەکەمان گرت و لەگەڵ مۆسیقایەکی دڵڕفێنی کوردی کەوتنە هەڵپەڕکێ. پاشان لەناکاوێك گەمارۆی ئۆتۆمبیلەکەیاندا و بروسکەئاسا بەرزیان کردەوە و خستیانە سەرشانیان بەدەم چڕینی سرودی نیشتمانیی کوردییەوە و ١٠٠ مەترێك بردیانین پێش ئەوەی بیخەنەوە سەر زەوی.

پاش ئەوە، هەندێك لەلایەنگرەکان تا بارەگای پارتی کەهەزاران کەسی لێبوو،منیان خستە سەر شانیان. دوای ئەوەی قاوەیان دامێ تکایان لێکردم چەند وشەیەك پێشکەشی جەماوەرەکە بکەم.

منیش لەبەردەم تریبۆنەکە پێزانینی خۆم دەربڕی بۆ ئەو پێشوازییە گەرمە و نەفرەتم لە ڕێژیمی ئاسەر کرد و سوپاسی سوپام کرد کەیارمەتی وڵاتی داوە بۆ گەڕانەوە بۆ ئازادیی و دیمۆکراسیی:

-کە ئەتوانم لێرە بەتەواوی ئازادیی قسەتان لەگەڵ بکەم، بۆ خۆی نیشانەی کرانەوەیە بەرووی سەردەمێکی گەشاوە و شادیهێندا لەسوریا بۆهەموو دانیشتوانەکەی بەعەرەب و کوردەوە.

لەبەر ئەوەی خۆر بەرەو ئاوابوون ئەچوو، ناچار بووم قسەکانم لەکورتیی ببڕمەوە تا فریاکەوم سەردانی دەریاسیەش بکەم پێش گەڕانەوەم بۆ قامیشلی.

دەوروبەری سەعات ١٠ ی شەو کە گەڕامەوە بۆماڵەوە، چەند هاوڕێیەك چاوەڕێم بوون بۆ زانینی هەواڵەکان،کاتێك خەریك بووم بۆچوونی خۆمم بۆ باس ئەکردن، لەدەرگە درا. دوو پۆلیس بوون ئەیانویست قسەم لەگەڵ بکەن.

دوو پۆلیسەکە بەرێزەوە پێیان وتم:

-ئەتوانیت بێیت بۆ ئۆفیسی پارێزگار؟ چونکە حەز ئەکات گفتوگۆیەکی کورتتان لەگەڵ بکات.

بێ ئەوەی هیچ روونکردنەوەیەکی قایلکەر بدۆزمەوە بۆ ئەم بانگهێشتە شەوانەیە، رێی دەرگەی سەرام گرتەبەر، لەدڵی خۆمدا هەزارو یەك پرسیارم لەخۆم ئەکرد. کاتێك گەیشتمە بەر دەرگەکە پۆلیسێك بردمییە ژوورەوە، پارێزگار و کۆلۆنێلێك و فەرماندەیەکی سەربازیی لەوێ بوون.

دۆستانە لێیان پرسیم: پاش نیوەڕۆی ئەمڕۆ چوون بۆ عامودا و وتارێکتان داوە، وانییە؟

بە سەرسامییەوە پێموتن:

-بەڵێ وایە. بۆ هیچ بووە؟

-نا، هیچ نەبووە، بەڵام وەك ئەزانیت تەنیا دوو رۆژی ماوە بۆ هەڵبژاردن و بەپێی قانون ئەبێت هەڵمەتی هەڵبژاردن ٣ رۆژ پێش ئەوە رابگیرێت. بەداخەوەین کەپێت بڵێین ئێوە رەچاوی ئەو شتەتان نەکردووە.

- جەنابی پارێزگار، بڕواناکەم قانونم پێشێل کردبێت چونکە ئەو راگرتنە لەسبەینێوە دەست پێئەکات. پاشان من بۆ ئەوە نەچووم بۆ عامودا تاداوا لەخەڵك بکەم دەنگم بۆبدەن، بەڵکو شارەکە خۆیان بانگهێشتیان کردبووم. و وتەیەکم پێشکەش کرد بۆ سوپاس کردنی

جەماوەر کە گەرموگوڕ پێشوازییان کردم و سوپاسی سوپاشم کرد کە وڵاتەکەمانی ڕزگارکرد لە دەسەڵاتی ناسر و دەزگای لێکۆڵینەوە.

لەکاتی قسە کردندا هەر سێ ئەفسەرەکە چاودێرییان ئەکردم. ئینجا پارێزگار پێی وتم:

-دکتۆر، ئەزانین میللەت خۆشی ئەوێیت و پێویستت بەپڕوپاگەندە نییە تا هەڵتبژێرن، بەڵام لەبەر ئەوەی هەستی جەماوەر ئەجوڵێنیت و ئەیانهێنیتە جۆش، باشتر وایە تا دوای هەڵبژاردنەکان لەماڵ نەچیتە دەر. بەڵێنم ئەدەیتێ ئەوکارە بکەیت؟

بێ دوودڵی وەڵامم دایەوە:

-بەڵێ، بێگومان.

بەدەم هەستانەوە بۆ تەوقەکردن لەگەڵم، وتی:

-باشە، ببوورن کە هەراسانم کردن، شەوێکی خۆشت بۆ ئاواتەخوازین.

دوو ئەفسەرەکەی تریش هەمان شتیان کرد و تا دەرگەکە بەرێیان کردم.

لەماڵەوە هاوڕێکانم بەنیگەرانییەوە دەوری کاکمیان دابوو. بۆ هێورکردنەوەیان پێم وتن:

-هیچی خراپ نەبوو. پارێزگار ئامۆژگاریی کردم تا دوای تەواوبوونی هەڵبژاردن ماڵ بەجێنەهێڵم، تا نەبمە هۆی ئاژاوە لەناو میللەتدا و خۆمان لەخۆپیشاندان بەدوور بگرین.

کاکم وتی:

-پارێزگار مرۆڤێکی شەرەفمەندە و مافناسێکی ڕێزدار و دیموکراتێکی بەباوەڕە، بەڵام لەوڵاتێکدا کەچارەنوسی گەلەکەی کەوتبێتە دەست چەند ئەفسەرێکی گەنجی نەزان و بەجۆش بۆ نەتەوەپەرستیی بەعسیی و ناسریی، کە هەرکامیان خۆی لێبووەتە ناپلیۆنێك و خۆبەزلزانی و چلێسیی لەمێشکیاندا هێلانەی کردووە، کەسانی دانای وەك پارێزگار کەبەدەگمەن ئەتوانن ڕای خۆیان بسەپێنن، ئەبێت لەکاتی ئەنجامدانی ئەرکەکانیاندا وریابن. ئەو ئامۆژگارییەشی واتای ئەوەیە هەستی کردووە مەترسیی هەیە لەسەر ئازادیت.

داوات لێنەکەم گوێ بەئامۆژگارییەکانی بدەیت و ملکەچی بیت و واز لەهاندان و وروژاندن بێنە.

هاوڕێکانمان لەسەر ڕۆشتن بوون کەجارێکی تر لەدەرگە درایەوە. دوو پۆلیسی ناوچاوان گرژ و مۆن بوون. یەکێکیان بەتوندی تێی خوڕیم:

-یەڵا خێرا بڕۆ بۆلای پارێزگار.

- بەڵام هەر سەعاتێك ئەبێت لای بووم.....

-ئەبێت هەر ئێستە بچیتەوە بۆ نوسینگەکەی!

دیارە هەڵوێستی دەسەڵاتداران گۆڕاوە و ترسی ئەوەم هەبوو جارێکی تر بکەومەوە پشت میلەکانی زیندان.

پارێزگار لەقاتی زەمینیی و ڕێك لەبەردەم دەروازەی سەرا چاوەڕێم بوو، بەدەم داوای لێبووردنەوە هات بەپیرمەوە.

-بەپێی توانا هەوڵمدا کێشەی گەشتەکەتان بۆ عامودا دەرباسیە یەکلایی بکەمەوە، بەڵام لەم وڵاتە مشتێك منداڵ دەسەڵاتدارن و ئەوانیش بێگومان ئەیانەوێت لێم بپرسنەوە لەسەر ئەوەی (قانونم پێشێل کردووە).

بەساردییەوە وتم:

-وەك ئەبینم نیازتان وایە دەستگیرم بکەن.

بەدەم چاو هەڵگلۆفینەوە پێی وتم:

-بڕوا پێبکە نورەدین بەگ، هیچ تاوانی منی تیانییە. ئەوە ئەفسەرکانمانن، ئەو منداڵانەن کە لەدیمەشقەوە تەلەفۆنیان بۆکردم و داوایانکرد دەستبەسەرت بکەم.

-گوێ بەمن مەدە، بەڵام بیر لەئەنجامەکانی دەستگیرکردنی من بکەرەوە. ئەی لەوە ناترسن ناوچەکە، کەلەناخەوە پێکراوە بەتەواوی هەڵچێت و بتەقێتەوە؟

-ئەزانم، ئەزانم. بەوردی باسی تایبەتمەندیی و جەزیرەم بۆکردن و تکام لێکردن ئەوە لەبەرچاو بگرن، بەڵام مەخابن نەمتوانی قایلیان بکەم، یاباشتر بڵێم نەمتوانی هەڵوێستی وەزیری ناوخۆ بگۆڕم،کەلەجیاتی ئەوەی راپۆرتی کارمەندە راستەوخۆکانی خۆی لەبەرچاو بگرێت، ملکەچی ئاگادارکردنی چەند ئەفسەرێکی بچووکی هەواڵگریی سەربازیی بووە.

لەگەڵ ئەوەش و پێش بڕیاردانێکی وامەترسیدار، جارێکی تر تەلەفۆن ئەکەمەوە بۆ دیمەشق.

دوای دە خولەك بەتووڕەیی هاتەوە.

-هیچم پێنەکرا، هەموو شتێك بەدەستی سوپایە و فەرماندەکانی ناتوانن بە بەرچاو روونی دۆخەکە شی بکەنەوە. بەهیچ شێوەیەك نایانەوێت بەرت بدەن. بەراستی من بەداخم، باچاوەڕێی هاتنی فەرماندەی پۆلیس بکەین.

ئەمەی وت و تلیسایەوە سەر کورسییەکەی.

پاش کەمێك فەرماندەی پۆلیس گەیشت. گەشتێکی پشکنینی بەشاردا کردبوو و سەرنجی دابوو کە بەو درەنگی شەوە، زۆرماڵ رووناکن. ئەمەش نیگەرانی کردبوو. بەتەنیشتمەوە دانیشت و گوێی رادێرا بۆئەو دەنگە دەنگەی لەدەرەوە ئەهات. ترسی ئەوەی هەبوو لایەنگرانم بەمەبەستی ئازاد کردنم، پەلاماری سەرا بدەن. لەسەر کورسیەکەی راچڵەکی و هەستا و بەچاوی پڕ پرسیارەوە لێم ورد بووەوە.

سنووری تورکیا تەنیا پێنج کیلۆمەتر لێمانەوە دوور بوو و شەوانە چالاکییەکی زۆری لەدەوربوو. هێڵێکی سیاسیی کوێرانەیان کێشابوو بۆ جیاکردنەوەی دەستکردی هەردوو وڵات، واتە رۆڵەکانی یەك میلەتیان لێکجیاکردبووەوە، وای لێهاتبوو، دانیشتوانی گوندێك لەشەو ورۆژێکدا خانووەکانیان کەوتبووە خاکی تورکیاوە و زەویەکانیان لەسوریا بوو. برایەك رەگەزنامەی تورکی هەبوو و برایەکی تر رەگەزنامەی سوری، و نەیانئەتوانی سەردانی یەك بکەن مەگەر بەنهێنیی.

کوردستانی تورکیا بەمەڕوماڵات و میوە و درەخت دەوڵەمەند بوو و کوردستانی سوریا بەدانەوێڵە و چنین و قاوە و چا و بەرهەمی سەرەتایی تر. لەبەرئەوەی یەکێتیی ئابووریی نێوانیشیان تێك شکابوو، بۆیە ئاڵوگۆڕە بازرگانییە پێویستەکان بەدزییەوە و بەقاچاخ ئەکرا.

بۆئەوەشی ببیتە قاچاخچی، ئەبوو چاونەترس و فێڵزان و چەکدار بیت و شارەزای تۆپۆگرافیای شوێنەکان بیت. ئەشبوو شارەزایی باشت هەبێت و نیشانەشکێنیش بیت.

هەرچەندە تارادەیەك کڕینی ژەندرمەکانی تورك ئاسان بوو، بەڵام ئەبوو بزانیت چۆن ئەیانکڕیت و هاوئاهەنگی ئەکەیت بۆپەڕینەوە لەسنوور هاوکاتی نۆرە ئێشکگریی ئەو ژەندرمە گەندەڵە. قاچاخچیش گەر ڕووبەڕووی گەشتێکی پۆلیس ببوایەتەوە، تەنیا دووڕێگەی لەبەردەمدا بوو: یا هەڵاتن یا شەڕکردن.

بۆیە مایەی سەرسوڕمان نەبوو کە شەوانی ئەو ناوچەیە هەمیشە گوێت لەدەنگی تەقینەوە و قرمەژنی گوللە بێت.

ئەو ئێوارەیە فەرماندەی پۆلیس لەگەڵ بیستی دەنگی هەر فیشەکێك کەلەلای سنوورەوە ئەچوو بەئاسماندا،ڕائەچڵکی.بەدەم گوێگرتن و سەیرکردن لەپەنجەرەکەوە، لەپارێزگاری ئەپرسی:

-ئەی ئەوە، ئەوە چییە؟

کۆنترۆڵی خۆم کردبوو تا پێنەکەنم لەکاتێکدا پارێزگار بەدەنگێکی نەرم هێوری ئەکردەوە:

-پێویستە هێور بیتەوە، ئاخر ئەو دەنگە بەبێ گومان لای ئێمەوە نییە!

لەبەرئەوەی فەرماندەی پۆلیس نەیئەتوانی ئۆقرە بگرێت، پارێزگار داوای لێکرد بڕوات و هەر من و ئەو بەتەنیا ماینەوە. نیگایەکی خەمناکی تێگرتم و بێزاربوو لەوەی ئەمبات بۆ زیندان.

بۆ هێور کردنەوە و هاندانی، پێم وت:

-پێم باشترە تۆ بمبەیت بۆزیندان تاکەسێکی تر. دەی رادەستی زیندانوانەکەم بکە و خۆت بچۆ بخەوە.

پارێزگار بەساردییەوە هەستاو تکای لێکردم دوای کەوم. زیندانەکە تەنیا پەنجا مەترێك لەوشوێنەوە دوور بوو. بەپاسەوانەکەی سپاردم، پاش ئەوەی چەند وشەیەکی چپاند بەگوێیدا. پاسەوانەکە کردمییە ژوورێکەوە کە بەندییەکی تری تیابوو، دوو پێخەفی خوری دامێ و دەرگە ئاسنینە قورسەکەی بەدوای خۆیدا داخست.

هاوزیندانەکەم رۆشنبیرێك بوو سەر بە خێڵی (تەی)ی عەرەبی و دوای چەند ساڵێك خوێندن، چاوکراوەبوو سەبارەت بەتاڵانبردنی ماندووبوونی رەشەخەڵکەکە لەلایەن دەرەبەگەکانەوە. دوو کاندیدی نوێنەرایەتی سەر بەو لیستەی ئەفسەرانی نووسینگەی دووەم پشتیوانیان ئەکرد-کە ئەندامی خێڵەکەی خۆی بوون-خستبویانە زیندانەوە چونکە بەهەراسانکەر و ئاژاوەچییان زانیبوو.

خێڵە کۆچەرەکانی عەرەب لەو سەردەمەدا بەتوندیی و بەئاشکرا دژی خوێندن بوون و فێربوونی ئاینیشیان بەسوك سەیر ئەکرد، بەرادەیەك مەلا پێشنوێژەکانیان بەگشتیی کورد بوون، بەڵام ئەم هاوزیندانەم دەگمەن بوو، خوێندنی ئاینیی لەخوێندنگەی خەزنەوی تەواو کردبوو، ئەو خوێندنگەیەی شێخ ئەحمەدی خەزنە دایمەزراندبوو، کەیەکێك بوو لەدیارترین پێشەوا ئاینییەکانی رێبازی نەقشبەندیی، و شۆڕشگێڕێکی سەرسەخت بوو دژی سەرۆکە دەرەبەگەکان و خەونی ئەبینی بەجیهانێکی ئازاد لەمشەخۆرەکان و هەموو جۆرە کەڵەکبازێك.

لەبەر ئەوەی خەوم نەئەهات چەندین سەعات گوێم بۆ رادێرا کە باسی فێڵ و پیلانی دەرەبەگە عەرەبەکانی بۆئەکردم لەگەڵ دەسەڵاتی ناوچەکە و تەختی پاشایەتی وڵاتانی

عەرەب، بەمەبەستی هەڵخەڵەتاندنی هاووڵاتییەکانیان و دەوڵەمەند بوون لەسەر ماندووبوونی ئەوان و ژیان وەك ئاغای مەزن.

ڕۆژی دواتر کاتێك چاوەڕێ بووم ئازادبکرێم، یەکێك لەئەندامانی تیمی بانگەشەکەمیان کردەلام لەزیندان بەتۆمەتی پێشێل کردنی ڕێنماییەکانی هەڵبژاردن. کاتێکیش لای نیوەڕۆ کاکم سەردانی کردم، نیگەرانی و دوودڵیم لەچاوانیدا خوێندەوە. وادیاربوو ئەفسەری هەواڵگریی سەربازیی هەڕەشەی کردووە ئەگەر کاندیکردنەکەم نەکێشمەوە رادەستی تورکیام نەکات.

پاشنیوەڕۆش ئەفسەرێکی هەواڵگریی سوپا و دوویاوەری سەردانیان کردم بۆئەوەی ناچارم بکەن خۆم بکێشمەوە.

قیژاندیان بەسەرمدا:

-ئەگەر کەللەرەقیی بکەیت، ئەتنێرینەوە بۆ بەندیخانەی مەزە.

بەپێکەنینەوە وتم:

-ئۆوا! لەوەتی بینیومە ترسم لێی شکاوە و پێی راهاتووم.

-ئاوا ؟! ئەیبینین.

ئیتر بەجێیان هێشتم و تەپەی پۆستاڵەکانیان بەدوایانەوەبوو.

کەشی ١١ی کانوونی یەکەم، واتە ڕۆژی هەڵبژاردن، هەتاو و زۆر جوان بوو و ڕێیان داین بچینە حەوشە. نزیکی سەعات ١١، پۆلیسێك کە لەپاسەوانیی بنکەیەکی هەڵبژاردن گەڕابووەوە، چووە سەربانێك کەبەسەر حەوشەکەدا ئەیڕوانی و بەدەنگی بەرز هاواری کرد:

-لەهەموو شوێنەکان هیچم نەبینی جگە لەتێپەڕینی لیستی زازا، زازا، زازا.

ئینجا هات و پیرۆزبایی لێکردم.

لای نیوەڕۆ پۆلیسەکانی تریش پیرۆزباییان لێکردم، بەڵام سەعات ٢ پۆلیسێکی تر هەواڵێکی نیگەرانکەری بۆ هێنایین:

-کاتێك بینیان لیستەکەت لەپێشەوەی لیستەکانی ترە، دەسەڵاتدران ڕێنماییان دایە قاچاخچییەکان(پاسەوانانی سنوور) بە سزادانی ئەو کەسانەی دەنگ ئەدەن بەئێوە و لەدەنگدەرێکی پڕیاندا، بەڵام سەرەڕای بەکارهێنانی حەیزەران و تۆقاندن، خەڵك هەر بەردەوام دەنگیان بەئێوە ئەدا، بۆیە دەسەڵاتداران نوێنەرەکانتانیانی دەستگیرکرد و ڕاپێچی زیندانی عامودایان کردن. ئەو لایەنگرانەشی ویستیان نارەزایی دەربڕن، کەوتنە بەر لێدانێکی دڕندانە، بەمەش ژمارەی دەنگدەران کەم بووەوە، سندوقەکانیش کەچاودێری ئێوەیان بەدیارەوە نەمابوو، ئاخنران بەکارتی دەنگدان بەقازانجی لیستەکەی میری. ئەمەت پێناڵێم تا خەمبارت بکەم، بەڵکو تەنیا بۆئەوەی ئاگات لەپێشهاتەکان بێت. تەنیا کاندیدی لیستەکەتان، کەهێشتا ئازاد بوو، هەوڵیدا بروسکەی نارەزایی بنێرێت بۆ دیمەشق، بەڵام ئەفسەری هەواڵگریی سەربازیی هەموویانی دەستبەسەرکرد.

هەموو پۆلیسەکانی تر لاڵ بوون و بێدەنگییەکی مەرگبار زیندانەکەی داپۆشی. درەنگانێکی ئێوارە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان راگەیەنرا: ئەوکاندیدانەی سوپا سەپاندبوونی سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەستهێنا. دوو ئێوارە دوای ئەوە لەگەڵ هاورێکەم بردیانین بۆلای دادوەری لێکۆڵینەوە کە ماوەی دوو سەعات بەپرسیاری بێ سەروبەر ماندووی کردین و تاوانباری ئەکردم بەهەندێك شت کەعەقڵ نەیئەبڕی.

دادوەر پرسی:

-بۆ لیستەکەت بەو شێوەیە پێکهێنا؟

-بۆ ئەوەی چەندی ئەکرێت نوێنەرایەتی هەمووان بکات.

-ئەی بۆ کەسی نا کوردی تیا نەبوو؟

-لەبەر ئەوەی زۆربەی هەرە زۆری پارێزگەکە کورد نشینە.

-بۆ لە عامودا و دەرباسیە بەکوردی قسەت کرد؟

-ئاخر ئەگەر قسەکانم بۆ کوردان بێت، بۆ بەکوردی قسە نەکەم؟ئایا لەسوریاش وەك تورکیا قانون یابڕیارێك هەیە بۆ قەدەغەکردنی زمانی کوردی؟

دادوەر بە رووگیرییەوە وەڵامی دایەوە:

-نا، پێم وانیە.

پاشان درێژەی دایە:

-بیرتان بێت، ئەو عەرەبەی ئایندەی نەتەوەی عەرەبی بەلاوە بایەخدار بێت، نیگەرانە لەئاواتە میللییەکانی کورد. ئەو کارەسات و نەهامەتیانەی زایۆنییەکان بەسەریان هێناوین و ئێستاش بەردەوامە، هەستیار و هۆشیاری کردووین بەرامبەر هەر گەلێکی نیشتەجێی جیهانی عەرەب. راپەڕینەکەی کوردی عێراق بەسەرکردایەتی ژەنەراڵ بارزانی، کەداوای مافەکانی کورد، بگرە داوای ئۆتۆنۆمی تەواو ئەکات بۆهەموو باکووری عێراق، ئەو باوەڕەمان لا دروست ئەکات کە لەبەردەم لەدایك بوونی ئیسرائیلێکی تردایین و گومان ئەکەین ئێوە پەیوەندی راستەوخۆتان لەگەڵ بارزانی هەبێت بۆ ئەوەی باکووری سوریا بخەنە پاڵ ئەو وڵاتە دەستکردەی بیر لەدامەزراندنی ئەکەنەوە بەدابڕینی بەشێکی خاکی وڵاتانی عەرەب، گوتارەکەی ئێوەش لەعاموددا هەر هەمان ئاراستەی هەبووە، کە بەدەق وتوتە:((ئەمڕۆ، نەتەوەی کورد سەرکەوت بەسەر نەتەوەی عەرەبدا....))

لەگەڵ ئەوەی هەوڵم ئەدا کۆنترۆڵی خۆم بکەم تا نەتەقمەوە، لێم پرسی:

-ئێوە گاڵتە ئەکەن، یا ئەوقسانەتان بەڕاستە؟!

-من گاڵتە نازانم، راپۆرتی بەرپرسی ناوچەکە ئەو خاڵە دووپات ئەکاتەوە.

-ئەڵام ئاخر چۆن ئەبێت کارمەندێکی دەوڵەت، بەرپرسێکی بەرێوەبەریی لەناوچەکە راپۆرت بنوسێت لەسەر قسەی هەڵبەستراو؟ چۆن ئەبێت دادگە پشتی پێ ببەستێت بۆ زەوتکردنی ئازادی هاووڵاتیان و دارزاندنیان لەزینداندا؟ هەزاران کورد کەلەعاموددا

گوێبیستی گوتارەکەم بوون، ئەودێڕانەیان نەبیستووە، ئیتر جەنابی بەرپرسی ناوچەکە ئەم قسانەی لەکوێوە هێناوە، کە ئەو یەك وشەی کوردیش تێناگات؟!

ئەو تۆمەتانەی ئەیدەتە پاڵ من و پاڵ کورد بەگشتیی هیچ بنەمایەکیان نییە، ئەوە هیچ نییە جگە لەبیانوویەك بۆ جێبەجێکردنی پیلانی لەناوبردنی کورد بەکوشتنیان، یا بەعەرەبکردنی کوردی سوریا، ئەگینا نەتەوەپەرستە شۆڤینییەکانی عەرەب کورد بە زایۆنییەکان ئەچوێنن؟ ئایا ئەوان هاتوون خاکی عەرەب زەوت بکەن؟ نەخێر بەڵکو عەرەب ئەیانەوێت کورد لەخاکەکەی دەربکەن، خۆشتان ئەزانن، و بەهەموو توانایەك هەوڵ ئەدەن بۆریشەکێشکردنی کەلتوور و بەهاکانیان.تەنانەت خوێندنگەی کوردیش، ئێوە رێیان پێنەدەن بیکەنەوە؟ ئایا رادیۆ و تەلەفزیۆنی سوریا بەزمانی کوردی بەرنامە بڵاوئەکەنەوە؟ نەخێر، نەخێر هیچ شتێکی واتان نەکردووە، کەچی زایۆنییەکان لای خۆیانەوە ئازادی زۆریان سەلماندووە بۆعەرەبی نیشتەجێی وڵاتەکەیان.لێتان ناشارمەوە، کاتێك سوریا لەدیکتاتۆریی ناسریی رزگاری بوو، چاوەڕێی سەروەریی سەردەمێکی نوێ بووین لەدیموکراسیی راستەقینە.

لەوانەبوو لێپرسینەوەکە چەندین سەعاتی بێ کۆتایی بخایێنێت، بەڵام دادوەر لەپڕێکدا بڕیاریدا کە کات درەنگ بووە و لێپرسینەوەی هاوڕێکەمی لەکورتی بڕییەوە،پێش ئەوەی فرمان بکات بمانبەنەوە بۆ زیندان. کە دوو رۆژی تری لێمانپنەوە و ئینجا دۆسییەکەمانیان بردە دادگە و ئەبوو چاوەڕێ بین تا رۆژێك ئەچینە بەردەم دادگەی تاوانەکان لەقامیشلی.

خۆ ئەگەر لەقامیشلی بمامایەتەوە، لەوانەبوو لەلایەن هەواڵگرییەوە دەستگیر بکرێم.

لەگەڵ چەند هاوڕێیەکدا بەرەو دیمەشق بەرێ کەوتم لەرێی حەلەبەوە.لەبەر ئەوەی خۆم بەشکست خواردوو نەئەزانی سووربووم لەسەر ئەنجامدانی لێکۆڵینەوە بۆ سەلماندنی راستیی ئەنجامی هەڵبژاردنەکان، بەڵام داواکەم بەهیچ شێوەیەك بەدڵی بەرپرسانی سوریا نەبوو، و بەشێوازەکەی خۆیان تۆڵەیان کردەوە. نزیکەی ٢٠٠ خوێندکاری خەڵکی عامودایان

دەستگیر کرد، کەتەمەنیان ١٢-١٦ ساڵان بوو بەتۆمەتی ئەوەی لەسەر دیوارەکانیان نووسیبوو:

ئێوە، ئەی عەرەب

خاکی ئێمە، کوردستان

بەجێبهێڵن

بژی بارزانی و

نوێنەرەکەی لەسوریا

نورەدین زازا!

پۆلیسەکان هەندێك لەمناڵەکانیان رووت کردبووەوە و هەڕەشەی دەستدرێژییان لێکردبوون:

-یەڵا بڕۆن و بڵێن زازا چەکی لەبارزانی وەرگرتووە و بەنیازی کودەتا بووە لەسوریا، ئەگینا....

زۆربەی مناڵەکان لەترس و تۆقیندا ملکەچ بووبوون، بەڵام ئەشیانزانی کە نەچەکم لەبارزانی وەرگرتووە و نە بەنیازی کودەتاش بووم.

پەرلەمان لەکۆتایی مانگی کانونی یەکەمدا کۆبووەوە، بەڵام کۆمیتەی لێکۆڵینەوە تا ناوەڕاستی کانونی دووەم دانەنرا. بەفەرمیی داواکەمیان پەسەند کرد و تەنانەت کۆمیتەیەکی لێکۆڵینەوەی ناوچەییان پێکهێنا بەڵام فریای دەستبەکاربوون نەکەوت، چونکە دوای ماوەیەکی کورت کودەتایەکی سەربازیی کرا و (نازم قودسی)سەرۆك کۆمار و (مەعروف دوالیبی)سەرۆکی پەرلەمان دەستگیرکران و یەکسەر پەرلەمان و دەستوور هەڵوەشێنرانەوە. ئەم دەستێوەردانەی سوپا، هاوشانی دەستێوەردانی بەکرێگیراوانی سیخوڕیی ناسرییەکان لەکاروباری وڵاتدا، زنجیرەیەك هەوڵی کودەتای سەربازیی بەدوای خۆیدا هێنا. ئەو کودەتایەی لە ٨ ی ئازاری ١٩٦٣ دا روویدا بەسەرکردایەتی کۆلۆنێل

حەریری، پارتی بەعسی هێنایە سەر دەسەڵات و لەبەر ئەوەی بەعس تەنیا ژمارەیەکی کەم ئەندامی هەبوو، بۆیە دەستیان کردە سەرکوتی سەربازیی و پۆلیسیی بۆ مانەوە لەدەسەڵاتدا.

ئەم رێکخراوە سیاسییە، خێرا کەوتە رێکخستنی لیستی رەش بۆ ئەو هاووڵاتیانەی ناسراوبوون بە ئارەزووی دیمۆکراسیی و لای جەماوەر خۆشەویست بوون، هەرکەسێك ناوی لەو لیستانەدا بوایە بێبەشیان ئەکرد لەمافە سڤیلییەکانی و رووبەرووی زیندان و ئەشکەنجە ئەبووەوە. ئەو لیستە رەشانەشیان رۆژی چەند جارێك لە رادیۆوە بڵاو ئەکردەوە بەمەبەستی تۆقاندنی قوربانییەکان و وروژاندنی خەڵك.

رۆژی ٢٠ ی مارس لەبەرنامەکانی سەرلەبەیانی رادیۆدا چەند جارێك گوێم لەناوی خۆم بوو، ئەمەش نیشانەیەکی پێشوەخت بوو بۆ نیازی خراپی کاربەدەستان بەرامبەرم، بەڵام دۆخەکەم رێی نەئەدام وڵات بەجێبێڵم، بۆیە بەردەوام بووم لەچوونە نوسینگەکەم و بایەخدان بەکارەکانم، وەك ئەوەی هیچ نەبووبێت.

سەرلەبەیانی رۆژی ٢٨ ی مارس هەواڵگریی پۆلیسیان ناردبوو بۆ گرتنم، بەڵام توانیم لەدەستیان دەربازبم. ژوانێکم هەبوو لەگەڵ پزیشکی ددان و لەدەرەوەی نوسینگەکەم چاوەڕێی ئەسانسۆرە کارەباییەکەم ئەکرد کە دووپیاوی لێهاتنە دەرەوە.

دەرگەوانەکە ئاماژەی بۆ نوسینگەکەم کرد و وتی:

-ئا لەوێیە.

لەدڵی خۆمدا وتم:

-دیارە پیاوانی هەواڵگرین.

خۆم تێك نەدا و خێرا چوومە ناو ئەسانسۆرەکەوە و لەباڵەخانەکە هاتمە دەرەوە و بەهەنگاوی خێرا خۆم کرد بە شەقامێکدا. هەروەك ئۆتۆمبیلێکی ڤۆلکس واگن(بۆقی)م

بینی لەوبەر شەقامەکەوە وەستابوو و شۆفیرەکەی تیا دانیشتبوو. خۆشبەختانە هەواڵگریی وەك ئەوەی سەردەمی ناسر نەمابوو و لەبەرکەمئەزموونیی نەیانناسیمەوە.

خۆم کرد بەشەقامە جەنجاڵ و پڕهاتوهاوارەکەدا و رووم‌کردە کلینکی پزیشکەکەم کە زۆر لەوێوە دوورنەبوو. لەکاتێکدا پزیشکەکە چارەسەری ئەکردم، ژنە یارمەتی دەرەکەی لەپڕدا پێی وتم:

-ئای خوایە، ناوتیان خستووەتە لیستە رەشەکەوە. بەڵام ئەمانە هەموو کەس ناناسن! وابزانم زۆری پێناچێت پیاوی چاك لەم وڵاتەدا نامێنێت.

پزیشکەکە لەبنەماڵەیەکی بۆرژوازیی دێرینی دیمەشق بوو، بەچاوی سووکەوە ئەیڕوانییە سوپا و دیکتاتۆرییەکان، بەڵام ئینتما چینایەتییەکەی ناچاری ئەکرد بەئاگایی و تەنانەت ترسنۆکانە رەفتار بکات. بۆیە بە تۆنێکی وشك وتی:

-کلینکی پزیشکیی شوێنێکی گونجاو نییە بۆ ئەو جۆرە قسانە.

توانیم لەچنگی هەواڵگریی دەربازبم، بەڵام تا کەی؟ گەڕانەوە بۆماڵەوە مەحاڵە. بۆیە هەر لەگەڵ هاتنە دەرەوەم لەکلینکەکە بەرێ کەوتم بۆلای هاوڕێیەکم کە لەخاچی سووری سوریا کاری ئەکرد و هاتنی پیاوەکانی هەواڵگریم بۆ باس کرد و تکام لێکرد سەردانی نوسینگەکەم بکات و هەواڵێکم بۆ بهێنێت. هاوڕێکەم خێرا رۆیشت و دوای چارەکە سەعاتێك گەڕایەوە و دووپاتی کردەوە کە پیاوانی هەواڵگریی بوون.

گومانەکانم بوونە راستی، ئێستا ئیتر گرنگترین شت ئەوەبوو بەدوای پەناگەیەکدا بگەڕێم لای کەسێکی جێبڕوا. دوای بیرکردنەوەیەکی قوڵ، بڕوام هێنا کە بێوەی ترین شوێن ماڵی ئوستادی خانەنشین (مەمدوح سەلیم)ە،کەیەکێکە لەتێکۆشەرە دێرینەکانی بزووتنەوەی میللیی کورد و دەمێکە وازی سیاسەت هێناوە.

لەزووەوە هاوسەرگیریی کردبوو و خانوویەکی بچووکی هەبوو کەچل ساڵ بوو تیایدا بوو لەبەرزاییەکی گەڕەکی کۆچەران(حي المهاجرين) و بەتەنیا ئەچێتە ئەوێ بۆناو کتێبەکانی.

بەڵام ئەو خانووەی لەگەڵ هاوسەرەکەی و خەسووی لەناویدان، لەباشووری شارە، لە پردی سپی و کەمتر ئەچێتە ئەوێ لەچاو(کتێبخانە کوخ ئاساکەیدا). لەبەر ئەوە بەخۆمم وت: هەواڵگریی هەرگیز بیر لەوەناکاتەوە لەشوێنێکی وا بەدوامدا بگەڕێت.

هاوسەرە چەرکەسەکەی مەمدوح سەلیم پێشوازیی کردم و لەخۆڕا پێشهاتەکەم بۆ گێڕایەوە.

-لەنەبوونی مەمدوح بەگدا، ئەتوانم بڵێم بەئامێزی وازەوە پێشوازیت ئەکەین و ئەتخەینە (سەرسەر و سەرچاو).

هێور بوومەوە و کاتێکی خۆشم بسەر برد لەدەمەتەقێ لەگەڵ ئەو دایکە پیرەکەی کەجوانترین رۆژەکانی ژیانی لەدەرباری دوا سوڵتانی عوسمانی بەسەر بردبوو و چێژی لەوە ئەبینی باسی ئەوشتە دەگمەنانە بکات کە سوڵتان-خەلیفە عوسمانییەکان لەسەراکانیاندا کۆیان کردبووەوە. یەکێك لەکچەکانی کەلەسەردەمی منداتی بریتانیادا شووی کردبوو بەدەوڵەمەندێکی فەلەستینیی لەحەیفا،دوای شکستەکەی ١٩٤٨ پەنای هێنابووە دیمەشق و لەگەڵ خێزانەکەی بەرامبەر ماڵی مەمدوح سەلیم نیشتەجێ بوون.

لەو دەمەدا مێردەکەی متمانەیەکی کوێرانەی هەبوو بەناسر و پێی وابوو ئەم(مەزنەی جیهانی عەرەب) جولەکە فڕێئەداتە دەریاوە. هاوسەرەکەی مەمدوح سەلیم پرسی کە ئایا ئەتوانێت بانگی بکات تا بیبینم.

-گەر دڵنیایت نهێنی پارێزە و زۆر بەناسردا هەڵنادات، بۆ نا؟

-بۆ نهێنی پارێزییەکەی، دڵنیام. بەڵام بۆ مەرجی دووەم، ناتوانم بەڵێنت پێبدەم. ئاخر فەلەستینییەکان پێویستیان بە(ڕزگارکەرێکە) و دڵنیان ئەو کەسە ناسرە، بەڵام ئەگەر ناسر ئەو خەونەیان بۆ نەهێنێتەدی، خۆ ئەو متمانەیە تاهەتایە بەردەوام نابێت.

ئەو فەلەستینییە ناوقەدباریك و ناوچەوان کراوە و چاوشینە، هیچ شتێکی لەعەرەب نەئەچوو، بەڵام زێد و زمان و چارەنوس، کردبوویانە عەرەبێکی تەواو عەیار. جگە لەوەش

بیزی لەئایدۆلۆژیای بەعس و بەعسییەکان ئەهاتەوە. سوێندیشی بۆ خواردم کە وەك کوڕی خۆی ئەمپارێزێت. ئەیویست بڕوام پێبێنێ کەپرۆگرامی ناسر مەسەلەی رزگاریی گەلی کوردیشی تیایە. بەڵام هەیهات!

مەمدوح نێوەڕۆ هاتەوە. هەر کە ژنەکەی شتەکەی بۆگێڕایەوە، بۆی دووپات کردمەوە کەماڵەکەی ماڵی خۆمە تا لێرەبم.

دە رۆژ لەماڵیان مامەوە و وام هەستئەکرد میوانێکی راستەقینەم. مەمدوح بەگ جارجارە ئەچوو بۆ نوسینگەکەم و هەواڵی بۆ ئەهێنامەوە: هەواڵگریی بەردەوام سەردان ئەکەن و هەڕەشەی داخستنی کۆمپانیاکەم لەکرێکارەکان ئەکەن، ئەگەر هاوکاریی نەکەن لەگرتنی مندا. بەڵام هەر خۆڕاگرن و هیچ گوێ بەو هەڕەشەو گوڕەشانە نادەن.

تەمەنی مەمدوح سەلیم سەرووی حەفتاوپێنج ساڵ بوو و شانازیی بەداڵدە دانەوە ئەکرد، بەڵام ئاشکرا بوو کەناتوانم بۆ هەتاهەتایە لەماڵیان بمێنمەوە، بێ ئەوەی ببمە هۆی تێکدانی شیرازەی ژیانی خێزانەکە. بۆیە هەر لەرۆژی سێیەمەوە داوام لەپیرە هاوڕێکەم کرد سۆراخی پەنایەکی ئارامم بۆبکات.ئەوەمان بەمێشکدا هات کە بێوەیترین شوێن، گەڕەکی کوردانی دیمەشقە کەوەك خاکی دوورخستنەوەی بێزراوان و چەوساوان و زۆرێك ئاسیاو و هاوڕێمان لەوێن ئامادەن داڵدەمان بدەن.

دوو مەرجی سەرەکیی، دڵسۆزیی و گیانفیدایی خاوەن ماڵ بوو،بەڵام ئەمانە هەموو شتێك نەبوون، بەڵکو بۆمسۆگەرکردنی لانی کەمی نهێنی پارێزیی، ئەبوو دۆخی دەرەکیی و ناوخۆی ماڵەکە و پێکهاتەی خێزانەکە و پەیوەندییەکانی لەگەڵ خزمان و دەر و دراوسێ تاوتوێ بکەین.

بافی جەنگیز، کەپێشتر پۆلیس بوو و لەبەر کوردایەتی دەرکرابوو، ئەرکی گەڕان بەدوای ناونیشانی ئەوخێزانانەی گرتە ئەستۆ کەئەتوانن داڵدەم بدەن. یەکەمجار چوومە

ماڵی سۆفی، کەخۆی و خێزانەکەی هیچ درێخییان نەکرد لەوەی بەخواردنە خۆشەکانیان شادمانم بکەن.

سۆفی،دوای ئەوەی لەکارەکەی،دەرگەوانی قوتابخانە، لابرابوو، ناچار بوو هەر کارێك بکات. لە وەرزی حەجدا ئەبووە رێنیشاندەری ئەو حاجیە کوردانەی لەتورکیاوە ئەهاتن و لەرێی دیمەشقەوە ئەچوونە مەکە. و لەم کارە هەندێك پارەی دەستئەکەوت.

هێشتاش بیرمە کەلەکار ئەگەڕایەوە،پارەکانی لەسەر مێزەکە هەڵئەڕشت و بەشادی و سەرکەوتنەوە ئەیوت:

-ئەمە داهاتی ئەمڕۆمە، ئەبێتە خۆراك و میوەی تۆ!

سۆفی تەنیا پارەیەکی کەمی دەستئەکەوت. لەبەر ئەوەی من برێ پارەم پێبوو، زۆر جەختم ئەکرد پارەی بدەمێ، بەڵام هەرگیز قایل نەئەبوو:

-چۆن ئەبێت؟ ئاخر تۆ لەماڵی ئێمەیت.

سێ هەفتە  لای بووم، پاشان باوکی عادل پێشوازیی کردم، دوای ئەویش عیزەت ئاغا کەهەموو خێزانەکەی کۆکردبووەوە بۆ پێشوازیم.

ئەو کوردانەی بوونە پەناگەم، هەموویان لەخێزانە زۆر هەژارەکان بوون و رەنجیان ئەدا بۆئەوەی هەردوو سەری مانگەکە پێکەوە گرێدەن. قوربانیی بەرچاویان ئەدا لەپێناو دابین کردنی ئاسایشم و پێشکەشکردنی خواردنی جۆراوجۆر و دەست و دڵکراوە، هەر کاتێکیش داوای بەشداریی خەرجییەکانم ئەکرد بەوەی برێك پارەیان بدەمێ، هەستیان بە شەرمەزاریی ئەکرد و لێم ئەپاڕانەوە تا دڵنیا بم کەئەوان وەکو کورد میوانداریی بەبەهایەکی پیرۆز ئەزانن. ئەی ئەوان هەر لەمنداڵییەوە فێری ئەوە نەبوون کەچۆن پێشوازیی میوان بکەن و خزمەتی بکەن و رێزی بگرن؟

ئەو سێ ماڵەی لێی مامەوە، پڕبوون لەمنداڵ، کەچی سەرەڕای چوونە دەرەوەیان، جا بۆ قوتابخانە یا بۆ یاریی کردن لەگەڵ هاوڕێکانیان، لەدەمی کسیان دەرنەچوو

کە(میوانێکی شاراوە)یان هەیە،بەڵکو بەپێچەوانەوە هەمیشە ئامادەبوون هەرخزمەتێکم بکەن، ئینجا گۆرانیی و شیعریان بۆ ئەوتم بە کوردیی و عەرەبی.

هاوسەرەکەی باوکی عادل، زۆر حەزی لەئاژەڵ بوو، بەتایبەت پشیلە. دە دانەی هەبوو و توانیبووی کارێك بکات مریشك و ڕێوی و چەقەڵ بەوپەڕی ئاشتی و دۆستانە پێکەوە بژین.

یەکێك لەرۆژە جوانەکان کوڕە بچووکە نۆ ساڵەکەیان هاتەوە ماڵەوە و پشیلەیەکی بچکۆلەی پێبوو، کە تووکێکی ئاوریشمیی درێژی مارۆنی هەبوو، زەرد و سپی تێکەڵاو. لەکۆڵانێکی دیمەشق دۆزیبوویەوە. کردمە باوەشم و کەوتمە یاریکردن لەگەڵی.

-گەر دۆخەکەم وانە نەبوو، داوام ئەکرد بمدەیتێ.

دایکی عەدنان وتی:

-ئێ قەیچێکا، وابزانە هی خۆتە و بەئارەزووی خۆت ناوێکی لێبنێ. با لێرە بێت تا ئەو ڕۆژەی دۆخەکەت چاك ئەبێت.

بۆیە کەوتمە بیرکردنەوە لەناوێکی جوانی کوردی.

-ئەمڕۆ چ ڕۆژێکە.

مناڵێکیان وەڵامی دامەوە:

-هەینی.

منیش وەك ئەوەی شتێکی گرنگم دۆزیبێتەوە، هاوارم کرد:

-مادام ئێوارەی هەینییە، کەواتە پشیلەکە ناو ئەنێین (شیڤین).

دوای ئەوەی ناومان نا شیڤین، پشیلەکەیان خستە ژێر چاودێری منەوە و دوای چەند ڕۆژێك هێندە هۆگرم بووبوو کە ئەهاتە سەر سەرینەکەم. کەچی دوای هەفتەیەك سەیرم کرد لێم دوورئەکەوێتەوە و ناچاربووم چەند جارێك بانگی بکەم تا لێم نزیك بێتەوە،

بەشەویش نەئەهات بۆ ژوورەکەم، کەبەزۆریش ئەمبرد نەکەوتە میاواندن. بۆیە سەیرم لەرەفتاری هات و لەوبارەیەوە پرسیارم لەدایکی عەدنان کرد، کەپێکەنینێکی گاڵتەوە وتی:

-هۆکەی زۆرسادەیە.شیڤین بۆیە لێت دوورئەکەوێتەوە چونکە دایکێکم بۆدۆزیوەتەوە.

-ئەمە چۆن؟

-توانیم وابکەم یەکێك لەوپشیلانەی بەچکەیان هەیە،بیگرێتە خۆی و تێرشیری بداتێ، ئیتر ئەویش ئەو کاتەی پێخۆشە کە لەگەڵ (دایك) و (برا) و (خوشکەکان)یەتی.

ئەوژنە گەنمرەنگ و تەمەنی ٤٠ ساڵێك و پڕبوو لەئازایەتی و چاکخوازیی، ئەو باشییەشی لەپێشینانییەوە بۆ مابووەوە. کاتێك عوسمانییەکان سوریایان داگیرکرد، نەنکی یەکێك لەئامۆزاکانی دالّدەدا، کە کاربەدەستان بەدوایدا ئەگەڕان بەتۆمەتی کوشتنی ئەفسەرێك. دایکی عەدنان بەشانازییەوە نمونەکەی نەنکی باس ئەکرد و دووپاتی ئەکردەوە کە ئەویش ئامادەیە هەمان کار بکات.

هەموو ئەو خێزانانەی میواندارییان کردم، رەسەنایەتی و بەخشندەیی خۆیانیان پیشاندام،بەڵام دۆخی سوریا و چوونەپێشی رووداوەکان،ناچاریان کردم لەمیوانداریی حەساوەی دۆستانی کوردم هەڵێم و بەدوای پەناگەیەکدا بگەڕێم لەدەرەوەی سوریا، ئاخر ئەو وڵاتە شتێکی بۆ نەهێشتمەوە تا پێوەی پەیوەست بم.

پێش جێبەجێکردنی پلانەکەم، بیرم لەو هاوپۆلەی کۆنی زانکۆم، لە لۆزان کردەوە کەلەکابینەی نوێدا بووبووە وەزیری ئابووریی، کەمال حوسنی، هەڵگری بڕوانامەی دکتۆرا لەزانستەکانی ئابووریدا و بەوە ناسرابوو کەبەعسییەکی روناکبیریی سەنگین بوو و بڕوای بە دیمۆکراسی هەبوو و بانگەشەی سۆسیالیزمێکی مرۆڤانەی ئەکرد. لەچەندین دیدارەکانماندا لەدیمەشق و لەکاتی گفتوگۆکانماندا، تێگەیشتنێکی قووڵی پیشان ئەدا بۆ دۆزی کورد(لەسوریا هەروەك لەعێراقیش) و هیواخوازی برایەیەکی راستەقینەی نێوان هەردوو گەلی کورد و عەرەب بوو.

منیش کەبەمتمانە و دڵنیا بووم لەقسەکانی پێشووی، نامەیەکی پیرۆزباییم بۆنارد بەبۆنەی بەشداربوونی لەکابینەی حکومەتدا و تکام لێکرد بەقازانجی من کارێك بکات تا دەست لەبەرۆکم بەردەن. ماوەیەکی کورت دوای ئەوە، هەواڵگریی مۆری (سوور)یان دا لەدەرگەی نوسینگەکەم و یەکێك لەکارمەندەکانمیان دەستگیر کرد و هەوڵەکانیان بۆ دۆزینەوەی حەشارگەکەم چڕتر کردەوە.

دۆخەکە بۆ کوردی عێراقیش لەوە خۆشتر و باشتر نەبوو، چونکە ئەوانەی دوای کودەتاکەی ۸ ی شوباتی ۱۹٦۳، بەسەرکردایەتیی ژەنەراڵ عەبدولسەلام عارف، دەسەڵاتیان لەبەغدا گرتە دەست، بەڵێنەکانیان سەبارەت بە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستانی عێراق جێبەجێ نەکرد، بگرە کەوتنە ئامادەکاریی بۆ جەنگێکی کتوپڕ و دڕندانە دژی بارزانی و لایەنگرانی. زانیاریی ئەوەشم پێگەیشت کەحکومەتی نوێی بەعسییان لەسوریا هێزی زەمینی و ئاسمانی ئەنێرێتە عێراق بۆ بەشداریی شەڕی دژە کورد.

دوای مانەوەی چەند مانگەم لەخۆشاردنەوەدا نیتر نەبوو گەڕەکی کوردانی دیمەشق جێبێڵم، تا هەرچی زووە دەربازم لەچنگی سورییەکان و رووبکەمە ئازادیی و ئاشتی، بۆنزیکترین(تاراوگە) بۆنموونە لوبنان. هاوڕێکانم شۆفێری تەنکەرێکیان ئەناسی کە بەردەوام لەسنوور ئەپەڕییەوە.دانوستاندن لەوبارەیەوە دەستی پێکرد و ئەنجامەکەی ئەوەبووبەرەبەیانێك (باوکی ئەنوەر) کەخۆیەخشانە ئامادیی دەربڕیبوو بەتەنکەرەکەی بمبات تا حمس، بێداری کردمەوە و وتی:

-تەنکەرەکە ئامادەیە...ئەتوانین بڕۆین.

## لوبنان

- هەڵاتن بۆ لوبنان

- ژیانی کوردان لەبەیروت

- ئەرکێکی راگەیاندن سەبارەت بەجەنگ لەکوردستانی
عێراق لە میدیای لوبنانی و لیبراڵی و جیهانی

- گیران و زیندان لەبەیروت بەگوشاری حکومەتی عێراق

- دوورخستنەوە بۆ ئوردون و ڕادەست کردنەوەی سوریا

رۆژی ١٤ ی حوزەیرانی ١٩٦٣ بوو. دە رۆژ پێش ئەوە سوپای عێراق پەلامارەکەی بۆسەر کورد دەستپێکردبوو و پێیان وابوو لە دەرۆژدا هەموو شت تەواو ئەبێت، وەك ژەنەراڵ عەماش، وەزیری بەرگریی عێراق رایگەیاندبوو:

-ئەرکەکە تەنیا سەیرانێکە بۆ باکووری وڵات!

سەرکێشییەکەم بۆلوبنان بەهەوڵی کوردانی ئازا و قاچاخچیانی پسپۆری ئاودیوکردنی سورییەکان بۆ لوبنان، دەستی پێکرد.

قۆناخی یەکەم کە بردینییە حمس بێ گرفت تێپەڕی و کاتێك خاڵەکانی پشکنینی سەربازیی کە ٣٠ کیلۆمەتر لەدیمەشق دوور بوون تەنکەرەکەیان ئەبینی ئاماژەی تێپەڕبوونیان ئەدایێ. لەحمس لە ڕۆژنامەی بەعسدا لیستی نوێی ڕەشی نوێمان بینی بۆ کەسانی داواکراو و لەناویاندا زۆر لەناسیاوە کوردەکانی تیابوو، کەهەندێکیان دەستگیر کرابوون و بردبوویانن بۆ زیندانی مەزە.

رۆژنامەکە هەواڵی(جەنگی سەرکەوتووانەی فلیقێنەری دژ بەمیلیشیاکانی کورد) و (جیاخوازانی نۆکەری ئیمپریالیزمی ئەمێریکا)ی بڵاوکردبووەوە.

بەپێی رۆژنامەی بەعس: هەر کەجەنگ تەواوبوو، نیشتمان فرۆشان قورسترین سزا ئەدرێن.

دیمەنی سروشتیی ئاماژەی هەژاریی و خەمۆکیی ئەدا، بەڵام تا لە بوکی-گۆشەیەکی ترنجاوی چەندکیلۆمەتریی خاکی لوبنانە کەرێگەی حمس بۆ لازقیەی پیا تێئەپەڕێت- نزیك ئەبووینەوە، رووەکەکان هەمەجۆر و باڵابەرز تر ئەبوون. بەلای راستدا (قەڵای کوردان)مان لێوە دیاربوو، تەم دەوری دابوو و ئەیرووانییە دۆڵ و دەشتەکە(ئەو ناوەی لەکتێبەکانی مێژووی عەرەبدا لێنراوە).

لەدەروازەی (بوکی) خاڵی پشکنینی سوریا دۆستانە مامەڵەیان کردین و کاتێك (ئەبو ئەنوەر)خەریکبوو ناسنامەکامانیان بداتێ ئاماژەی ڕۆشتنیان بۆکردین.

دوای چەند سەد مەترێك پاسەوانە فریشتەکەم لەبەردەم دوکانەکەی باوکی حەسەندا تەنکەرەکەی ڕاگرت و بەهەراسانییەوە گەڕایەوە چونکە ڕێنیشاندەرەکان تا سەعات نۆ ناگەن، و وتی:

-ئەفرەت....تا چاوەڕێین ئەتوانین لە(تەرتوس) نان بخۆین و خۆمان بشۆین. لەگەڵ مندا خەمی هیچت نەبێت.

لەبەردەم خاڵی پشکنینی(بوکی)دا، چەندین ئۆتۆمبیل وەستابوون و بەوردی ئەیانپشکنین، تەنکەرەکە لەدوایانەوە وەستا و دڵم کەوتە پەلەپەل. لەدڵی خۆمدا وتم:

-خوابکات ناوم نەدرابێ بە بنکە سنوورییەکان.

لەساتەدا سەربازێکی پایەبەرز بەگەرمی چاکوچۆنی لەگەڵ باوکی ئەنوەر کرد و بێ گوێدانە ئەو هەموو ئۆتۆمبیلەی لەپێشەوە بوون، ئاماژەی تێپەڕینی دایە.

دوای بوکی، ڕێگەکە پێچاوپێچ و هەوراز بوو کە گەرمیی تەنکەرەکەی بەرز کردەوە. باوکی ئەنەوەر، لەناو قرەقری ئۆتۆمبیلەکەدا هاواری کرد:

-دنیا زۆرگەرمە و هێشتا ڕێیەکی زۆرمان لەبەرە تابگەینە تەرتوس. چەند کیلۆمەترێك لەلاوە چێشتخانەیەك ئەزانم لەهەوای ئازاددا، کەمریشکە برژاوەکەیان بەناوبانگە. بەسروشتیی گەورەیان ئەکەن و گۆشتەکەی تازەیە. ئەڵێی چی ئەچینە تەرتوس و یەکێك لەو مریشکە خۆماڵییە بچکۆلانە نۆش بکەین؟

-بۆنا، منیش پێم خۆشە. یەڵا بابچین بۆ ئەوێ.

تەنکەرەکە بەلای ڕاستدا لایدا و ڕێگەیەکی تەسکی گرتە بەر، و خستمییە بیری شاخە بەردین و پڕ دارمیوەکانی سەردەمی مناڵی(مادن) و تاسوقی ئەوە بووم لەتەنکەرەکەوە خۆم هەڵدەمە خوارەوە و لەناو گیاکەدا یاری بکەم بە دارەکاندا سەرکەوم.

چێشتخانەکە لەشوێنێکی بەهەشت ئاسادا بوو: ئاوێکی سازگار لەدۆڵێکدا، داپۆشراو بەبەردی شین باو و کەنارەکەشی لێکی بلوری داپۆشیبوو. چێشتخانەکەش لە دەشتاییەکی کەناری رووبارەکەدا دروست کرابوو. بەڵام کەبینیم ژمارەیەکی زۆری ئەفسەر لەوێن، خەریك بوو هەڵێم. خێرا باوکی ئەنوەر هێوری کردمەوە:

-مەترسە بابە، ئەمانە لەو دەوروبەرەوە دێن بۆ نانخواردن وەك من و تۆ.سەیریان بکە، هەموو خێزانیی هاتوون و هەر ئاگایان لەئێمە نییە. لەگەڵ ئەوەش تا توشی گۆڵمەزێك نەبین، ئەچینە ئەو شوێنە کەهەر لەکەپر ئەچێت، لەقوڵایی چێشتخانەکەدا.

بارۆکەکان بەبەردەماندا راوراوێنیان بوو بەدوای کولله و زیندەوەری تردا لەکەناری چەمەکە، شاگردەکان دوایان کەوتن و دوانیان لێگرتن تا لەسەر خەڵووز بۆمان ببرژێنن.

باوکی ئەنوەر دەرفەتەکەی قۆستەوە و کەوتە گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆی و دەرکەوت لەکاتی جەنگی دووەمی جیهاندا، خۆیەخش بووە لە لەشکری عەرەبی ئوردون، کەبریتانیای مەزن پێکیهێنا و خستییە ژێر فەرماندەیی(کلوپ پاشا)ی ئەفسەری ئینگلیزەوە.

ئەولەشکرە زیاتر پێکهاتبوو لەرەوەندە عەرەبەکانی دڵسۆزی بنەماڵەی هاشمی، ئینجا چەرکەس و کورد و ئەرمەن. ئەو دەمە یەکێك بوو لەرێکخراوترین و بەدیسپلین ترین لەشکرەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاست و سەربازەکانی بە چاونەترسیی و خوێنرێژیی و توندوتیژیی بەناوبانگ بوون.

باوکی ئەنوەر گێڕایەوە:

-خەڵك لەترسی ئێمە ئەلەرزین. لەبەر ئەوەی ئینگلیز لەئوردون(ئەو دەمە ئەودیو ئوردون) و فەلەستین فەرمانڕەوا بوون، بۆیە لەهەردوو وڵات سەربازگەمان هەبوو. لەفەلەستین و لای جولەکەکان، وەك(دێو)ی داستانەکان وابووین. تەنانەت رۆژێکیان کچێکی بلیت فرۆش لەیەکێك لەسینەماکان کەمنی بینی، سڵەمییەوە و خێرا پەنجەرەکەی داخست. تابەرپرسەکەی بەهەڵەداوان هات بۆ هێور کردنەوەی.

باوکی ئەنوەر بەپێکەنینەوە بەردەوام بوو:

-ڕۆژێکیان دووبارە چاوم بەو کچە گەنجە کەوتەوە، کەزۆر جوان بوو. بانگهێشتم کرد تاپێکەوە پێکێك بخۆینەوە. ئەزانیت بەترس و لەرزەوە چی لێ پرسیم؟ (ئایا راستە کە سەربازانی لەشکرەکەمان گۆشتی مرۆڤ ئەخۆن؟) بڕوای تەواوی بەمە هەبوو چونکە پڕوپاگەندەکان وایان ئەوت.

کات نزیکەی چواربوو، چێشتخانەکەمان جێهێشت، پاش سەعاتێك هێشتا ڕێنیشاندەرەکان نەگەیشتبوون، باوکی ئەنوەر پێش ئەوەی سەرلەنوێ بکەوێتەوەڕێ، سپاردەی بەباوکە حەسەن. بەڵام قایل نەبوو تەنانەت یەك فلسم لێوەربگرێت بەرامبەر ئەو هەموو پیاوەتییەی لەگەڵی کردبووم. بۆیە بەنیگایەکی خەمبارەوە سەیرم ئەکرد تا لەرێگە پێچاوپێچەکە ئاوابوو و ئاسودە بووم کە سەرنجمدا خاڵی پشکنینەکەی سوریا بۆ لێپرسینەوە راگیریان نەکرد. بۆیە بە دڵنیایی و ئارامی چووم بۆ دوکانەکەی باوکی حەسەن تا قاوەیەك بخۆمەوە.

دووکانەکەی باوکی حەسەن پێکهاتبوو لەژوورێکی گەورەی بێ رووکار، وەك گەنجینە بەکاری ئەهێنا و بەکارتۆنە پسکیت و کیسە شەکر و قاوە و ئارد هەڵچنرابوو. لە تاقە تاریکەکاندا ئامێری رادیۆ و تەلەفزیۆن ئەبینران. باوکی حەسەن توانیبووی دوو ئاپارتمانی لەسەر دروست بکات، یەکێکیان بۆخۆی و هاوسەرەکەی و ئەوی تریش بۆ حەسەنی کوڕی کە ماوەیەکی کەم لەوەوپێش هاوسەرگیریی کردبوو. و وێڕای بازرگانییە بچووکەکەیان، باوك و کوڕ کشتیشیان ئەکرد و کێڵگەکانیان کە گەنمەشامی و پەمو و توتنی تیاچێنرابوو، لەپشت ماڵەکەیانەوە بوو.

باوکی حەسەن کەتەمەنی هێشتا نەبووبووە پەنجا ساڵ حەزی ئەکرد رووخساری پیرانە دیاربێت، ئەمەش نەرێتێکی باوە لەخۆرهەڵاتی ناوەراستدا، کە پێیان وایە پیرێتیی نیشانەی داناییە و قورسایی ئەبەخشێتە وشەکانی. ئەو هاوسۆزی کورد بوو و بێزی

لەبەعسییەکان نەهاتەوە، رای وابوو کورد خەڵکێکی ئازا و راستگۆ و وەفادارن، بەڵام بەعسییەکان کەسانی دووڕوو و بەرژەوەندیی پەرستن. دڵنیا بوو کە کوردەکان دەرسێکی چاکی سوپا دائەدەن لەعێراق و هەموو رۆژێك نزای ئەکرد لەپێناوەدا.

کاتێك قسە دۆستانەکانی ختوکەی هەستمیان ئەدا، گوێمان لە دوو تەقینەوەی لەرزێنەر و هەژێنەر بوو.

باوکی حەسەن بەهێواشی لەسەر کورسییەکەی هەستا و پێی وتم:

-لێرە مەجوڵێ، ئەچم بزانم چی بوو.

دوای دە خولەکێك بەپێکەنینەوە هاتەوە:

-ئەوە حەسەن بوو بەتاپڕ تەقەی لەمارێکی زەبەلاح کردووە، کەخۆی ئاڵاندووە لەدارمێوی پشت ماڵەکەوە. ترساوە لەپەنجەرەکەوە بچێتە ئەو ژوورەی کوڕە سێ مانگەکەی لێ خەوتووە. مارەکە پارچەپارچە بووە. ئەگەر حەز ئەکەیت بچۆ سەیری بکە.

وەڵامم دایەوە:

-سوپاس، هەرچەندە خۆشم لەژیانمدا ماری زۆرم کوشتووە بەڵام دیمەنەکەی ناخم ئەلەرزێنێت. خۆ ئەگەر خەو بەمارەوە ببینم و نەیکوژم، رۆژی دواتر تووشی گرفتێك ئەبم. لەبەر ئەوەشی باوەڕم بەو ئەفسانانە هەیە کەلەبارەی مارەوەن، ئەوا کە کوڕەکەت دانەیەکی کوشتووە، مژدەیەکی خۆشە.

وردە وردە دووکانەکەی باوکی حەسەن بووە هۆڵێکی پێشوازیی و لەودەوروبەرەوە گوند نشینەکان ئەهاتن بۆ دەمەتەقێ و گفتوگۆ. پێئەچوو هەموویان هاوتەمەن بن و هەمان سمێڵی زلی شۆڕیان هەبوو و پۆشاکەکانیان لەیەك ئەچوو، هەروەك باوکی حەسەن، شەرواڵی رەش و ئەو کراسانەی لەکۆنە(کەلەئەمێریکاوە هێنرابوو)بەنرخێکی هەرزان کڕیبوویانن لەکۆنەفرۆشە گەڕۆکەکانی بەیروت و تەڕابولس. هەروەك لەرووخساری خەمۆك و سەنگینیاندا دیاربوو پێشوەخت پیربوون.

حەسەن بەشانازییەوە کەوتە گێڕانەوەی دووروودرێژی قەبارەی زەبەلاحی نێچیرەکەی. لەخۆرهەلاتی ناوەڕاست وایە، کاتێك باس لەمار ئەکرێت، بەسەرهاتەکان کۆتایی نایە، ئاخر هەریەکەیان چیرۆکێکی لەوبارەیەوە هەیە. بەلام ئەو ئێوارەیە بەوجۆرە نەبوو، دیاربوو خەلکەکە گرفتێکی ئالۆزیان هەبوو لەبەر کەمناوبی کێلگەکانیان، هەروەك ئەو دانەوێلەیەی لەئوسترالیا و ئەمێریکاو کەنەداوە ئەهێنرا زۆر هەرزان ئەفرۆشرا و کاری کردبووە سەر فرۆشی ئەوان. ئەو نرخەشی بەرێوەبەرێتیی توتن دایئابوو مایەی گالتەجاریی بوو. ناوچەکە پشتگوێ خرابوو، نە رێگەی هەبوو نەئامرازی هاتوچووی گونجاو، جگەلەوەش لەوکاتەوە سوریا خاڵی پشکنینی لەدەروازەکانی بوکی دانابوو، ئیتر بەدەگمەن ئەتبینی سوریەکان بوێرن لەبەردەم دووکانیاندا راوەستن بۆ کڕین و فرۆشتن، ئەمەش وایکرد زۆربەی دووکانە بچووکەکان دەرگاکانیان دابخەن.

کاربەدەستانی لوبنان هێندەی لەخەمی کۆکردنەوەی باجدا بوون هێندە بایەخی بەخەلکەکە نەئەدا. کارمەندانیش بیریان تەنیا لای بەرتیل وەرگرتن بوو، ئەندامانی پەرلەمانیش بەلێنەکانی کاتی هەلبژاردنیان بیرچووبووەوە. لەبەرهەموو ئەمانە، گەنجان ناچاری کۆچکردن بوون، هەندێکیان بۆ جێگیربوون و نیشتەجێ بوون لە تەرابولس و بەیروت،ئەوانی تر ڕوویانئەکردە ئەفریکا و کەنەدا، تەنانەت ئوسترالیاش.

حەزم ئەکرد چەندین سەعات دانیشم و گوێ لەدەردەڵی بێزراوەکانی لوبنان بگرم، بەلام لەناکاو کیژۆلەیەك لەسوچی دەرگەکەوە دەرکەوت تا هەوالی گەیشتنی رێنیشاندەرەکانمان بداتێ. باوکی حەسەن هیوای سەفەرێکی شادی بۆخواستم و تەنیا پێنج لیرەی لوبنانیی لێوەرگرتم بەرامبەر میوانداریی و ناوبژیوانییەکەی. کوڕەکەی بردمییە ئەوبەر رێگەکە. لەوێ سەکنەکە، کەگەنجێکی بیست ساڵە بوو چاوەڕێی ئەکردین.

بەرێگەیەکی دژواری ناو باخەکاندا تێپەڕین و پیاوێکی بەخۆ، هێمنانە لەبەردەم ئۆتومبیلێکی مارسیدسدا چاوەڕێ بوو. حەسەن بردییە ئەو لاوە و داوای لێکرد ئاگای لێم

بێت. زۆر پێکەوە مانەوە و سەرئەنجام حەسەن گەڕایەوە و پێی وتم، لەسەر ١٥٠ لیرەی لوبنانیی ڕێکەوتوون تا بەیروت و هەرخۆم بەتەنیا لەگەڵی ئەبم. (تۆنی) کەناوی شۆفێرەکە بوو سوێندی خوارد کەکەسی تر جگە لەمن سوار ناکات بۆی ئەوەی لەرێگە تووشی کێشە نەبین. بەمەرجەکان قایل بووم و بەرەو بەیروت بەرێ کەوتین. بەڵام دوای دە کیلۆمەترێك لەشوێنێکی بەردەڵاندا، پیاوێك هاتە بەردەمان. شۆفێرەکە دابەزی قسەی لەگەڵ بکات و وتی:

-ئەوە برامە.

بەبیانووی کارێکی خێزانیی بەلای چەپدا لای داو رێگەیەکی دژواری گرتەبەر. ئۆتۆمبیلەکە لەگۆڕەپانی گوندێکدا وەستا، کەخانووەکانی پەرش و بڵاوبوون. شۆفێرەکە دابەزی و دوای ئەوەی بێخەمی کردم کەتەنیا چەند خولەکێکی پێنەچێت، لەتاریکییەکەدا ون بوو. دوای سەعاتێك لەگەڵ دوو پیاو و ژنێکی سەرتاپا رەش کە دوومناڵی لەباوەشدا بوو، گەڕایەوە. پێش ئەوەی هیچ گلەییەکی لێبکەم، تۆنی لێم نزیك کەوتەوە و بەنەرمی پێی وتم:

-نابێت لەو چاوەڕوانییە زۆرە تووڕە بیت، ناچاربووم چاوەڕێی ئەو هەژارانە بکەم کە دۆخەکەیان لەتۆ باشتر نییە و ئەبێت هەرچۆنێك بێت بگەنە تەرابولس. ئاساییە لەگەڵ خۆمان بیانبەین؟

-نا بەپێچەوانەوە، من ئامادەم کورسییەکەی خۆشم چۆڵ بکەم بۆهەر کەسێك بیەوێت لەدۆزەخەی سوریا دەرباز بێت.

تۆنی وتی:

-نا شتی وا نابێت، لانی کەم ئەبجارە. دڵنیابە جێگەکە تەنگ نابێت.

ئۆتۆمبیلەکە کەوتەوە رێ و لەخۆشی ئەو (راو)ە شەوانەیە، تۆنی کەوتە وتنەوەی گۆرانییە ناسکەکانی فەیروز و سەباح، ئەو دوو ئەستێرە گەورەیەی گۆرانی میللیی لوبنان.

لەیەکێك لە قۆناغەکاندا، شۆفێرەکە لای راستی گرتەبەر لەگەڵ ئەوەی زۆر سەخت و پێچاوپێچتر بوو، گوایە دڵنیابوو تووشی پیاوانی حکومەت نابێت، مارسیدسەکە بەدەنگێکی خرۆشان و بەهێز و سەختییەوە سەرکەوت و لەوشوێنەدا کەرێگەکە تەخت ئەبێتەوە، لایتی ئۆتۆمبیلێکمان بینی بەرەو ڕوومان ئەهات. تۆنی لایتەکانی کوژاندەوە و لایدایە قەراخی رێگەکە. ئۆتۆمبیلەکەی تر کەفول لایتی داگیرساندبوو بەهێواشی لێمان نزیك بووەوە.

-سەیرە ئاخۆ کێ بن؟!

تۆنی بێ ئەوەی خۆی تێکبدات وەڵامی دایەوە:

-پێم وایە ژەندرمەن.

لەکاتێکدا خۆم لەزیندان و گرتندا ئەبینی، پرسیم:

-ئەی چی بکەین ئەگەر بەڕاست ژەندرمەبن؟

-خۆراگربە و هیچ وەڵامی پرسیارەکانیان مەدەرەوە، ئەزانم چۆن قسەیان لەگەڵ بکەم، کارەکە بەدڵی خۆمان ئەبێت. بڕوام پێبکە.

دوای چەند ساتێك ئۆتۆمبیلێکی جیپ بەرامبەرمان راوەستا و چوار ژەندرمەی لێ دابەزین. تۆنی خێرا چوو بۆلایان و بەگەرمی سڵاوی لێکردن و توانی رایانکێشێتە ئەوبەری رێگەکە تا مامەڵەیان لەگەڵ بکات.

سەرجەنتەکەیان وتی:

-٥٠ لیرەمان بدەنێ و بڕۆن. نە هیچمان بینیوە و نەهیچمان بیستووە.

تۆنی وەڵامی دانەوە:

-نا بیست لیرە. هەریەکەتان پێنج لیرە.

لەم مامەڵەیەدا بوون کەیەکێك لەژەندرمەکان لەئۆتۆمبیلەکەمان نزیك بووە و بەجدییەوە داوای ناسنامەی لێکردین، و ئەوەی لەتەنیشتمەوە دانیشتبوو، خۆی پێنەگیرا و وتی:

-من سوریم و رۆژنامەنووسم.

-ئێ ئێ! سوریت و رۆژنامەنووسیشیت! بۆیە هاتوون بۆ ئێرە، تا ناوبانگی ولاتەکەمان بزڕێنن لەرۆژنامەکانی سوریادا!

رۆژنامەنووسەکە گەنجەکە ویستی تۆمەتەکەی بۆ راست بکاتەوە بۆیە بەپەلە وتی:

-نە بابە! لەراستیدا ئیتر ناتوانم لەسوریا بژیم و هاتووم لەلوبنان بەدوای کارێکدا بگەڕێم.

-ئێ وایە، هاتوویت ململانێی رۆژنامەنوسەکانمان بکەیت، لەکاتێکدا خۆمان بەدەست بێکارییەوە گرفتارین.

گەنجەکە وەلامی دایەوە:

-ئەگەر لەرۆژنامەنوسیشدا کارم دەست نەکەوێت، هەر کارێك بێت ئەیکەم، تەنانەت شاگرد چایچی و بۆیاخچی پێلاویش بێت. ئەتوانین لەسایەی ئەو ئازادییەی ولاتەکەتان و ئەو سەرمایەیەی ولاتانی عەرەب لەوێ وەبەریان هێناوە، هەرچۆنێك بێت بیگوزەرێنین.

-باشە بزانین چۆن ئەبێت!

ئینجا ژەندەرمەکە رووی کردە من تا لێمبپرسێت کارم چییە.

منیش بەپێی ئامۆژگارییەکانی تۆنی، بێدەنگ بووم. بەلام سەرسەختییەکەم وای لەژەندەرمەکە کرد، فرمانم پێبکات ئەو جانتا بچووکەی بەرپێم بکەمەوە و کەوتە وردبوونەوە لەشتەکانی ناوی. لەوکاتەدا تۆنی بەشادییەوە گەڕایەوە. رێکەوتین، پارەی خۆماندا و ئێستا بەرێنەکەوین.

بەلام ئەو رێگەیەی مابوو لەپێشماندا بێ گرێ و گۆڵ نەبوو. بەپێچەوانەوە ناچار بووین چەند جارێك لەئۆتۆمبیلەکە دابەزین و بەرێنمایی سەکنەکە بەپێی بەرێگەی پێچاوپێچ و سەخت و درێژدا تێپەڕین. تەنیا شۆفێر و ژنەکە و منالەکان لەئۆتۆمبیلەکەدا ئەمانەوە، و هەر کەلەخالەکانی پشکنین ئەوەستان ژنەکە ئەیوت لوبنانییە، چونکە ئەو سەردەمە ژنانی لوبنانیی ناچار نەبوون ناسنامە هەلگرن یاوێنەی لێبدەن.

سەرکەوتنی دوا لاریّ کەئەبوو بەدەوری بنکەیەکی ژەندرمەدا بسوڕێینەوە سەخت و درێژ بوو بەناو ئەو دارمێوانەدا کەدیواری بەرزی تەختمیان بۆکرابوو. سەکنەکە دەیان جار ئەو رێگەیەی بڕیبوو و شارەزای ناوچەکە بوو و بێ گرفت تێپەڕ ئەبوو و دوو ڕێبوارەکەی تر لەنزیکەوە دوای ئەکەوتن، بەلاّم من چونکە دوو مانگ لە گەڕەکی کوردان هیچ نەجولاّبووم، قاچەکانم خاوبووبوونەوە و بەدوامدا نەئەهاتن بەتایبەت لەسەرکەوتندا. خەریك بووم بەدیوارێکدا هەلّئەزنام کەبەردێکی گەورە لەژێر دەستم خزا و دای بەقاچی راستمدا و برینداری کرد. برینەکە قولّ بوو، بۆیە ماوەیەکی زۆر لەبن دیوارەکەدا مامەوە بەبێ جولّە. پاشان کەگوێم لەدەنگی پێی هاوڕێکانم نەما، زۆرم هەولّدا تا پێیان بگەمەوە بەلاّم نەمتوانی و لەناو مێوەکاندا تەنیا مامەوە، بۆیە ناچاربووم هاواربکەم کەفریام بکەون.

سەکنەکە بەتووڕەییەوە قیژاندی بەسەرمدا:

-چییە وا ئەقیژێنیت؟ ئەتەوێت باخەوانەکان پێمان بزانن و بمانگرن؟

-ئاخر ناتوانم ڕێبکەم. سەیری قاچم بکەن.

قیژاندی بەسەرمدا:

-خوای ئەکرد تووشی تیراوێ ئەبوویت. ڕێبکەوە ئەگینا لێرە جێت ئەهێلّم و ئەڕۆم.

-بەلاّم ناتوانم بڕۆم. لێرە جێمبهێلّن و بڕۆن.

-دەستم بگرە، یارمەتیت ئەدەم تا خێراتر ڕێبکەیت.

تا ئەو چەند سەد مەترەمان بڕی کە ئەیگەیاندنە ئۆتۆمبیلەکە، قاچە ئاوساوەکەم تا مردن ئازاری دام، بەلاّم خۆشبەختانە دوای ئەو هەلّگڕانەی هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە، ئیتر ناچار نەبووین تا تەرابولس لەئۆتۆمبیلەکە دابەزین، کەبەرێیەکی لابەلادا گەیشتین و هاوسەفەرەکانم لەچاو تروکانێکدا لەبەرچاو ون بوون.

دوای وچانێکی کورت، هێندەی بەنزینمان کردە ئۆتۆمبیلەکەوە، تەکسییەکە کەوتە ڕێ بەرەو بەیروت. لەنزیك بەیروت دوو ژەندرمە ئاماژەی وەستانیان بۆکردین. جەستەم لەرزی و بیرم لەوە ئەکردەوە، واگەیشتینە ئامانج، ئیتر چۆن ئەبێت ئێستا بمانگرن؟

-ئەچن بۆ بەیروت؟

شۆفێرەکەمان وەڵامی دایەوە:

-بەڵێ.

-کەواتە ئەتوانن سوارمان بکەن. چونکە جێتان هەیە.

تۆنی دوای ئەوەی لەتفەنگەکانی شانیان ورد بووەوە، وتی:

-سەرچاو، فەرموو سەرکەون!

بەم شێوەیە دوو ژەندرمەی لوبنانی سواری هەمان ئۆتۆمبیل بوون کە لەناو لوبناندا بەقاچاخ کوردێکی سوریای هەڵگرتبوو. لەبەر ئەوەی تەنیا شۆفێرەکە قسەی لەگەڵ نەکردن، سەرجەنتەکە کەمێك گومانی لەمن کرد، بۆیە بەزاراوەیەکی خاوی بەیروتی رایچڵەکاندین:

-هیوادارم هەمووتان لوبنانی بن.

شۆفێرەکە بەدڵنیایی و توند وەڵامی دایەوە:

-بێگومان، هەموومان لوبنانین!

دەرکەوت بونی ژەندرمەکان سودبەخش بوو، چونکە نزیکی بەیروت پۆلیس ئۆتۆمبیلەکەمانی راگرت. یەکێکیان تێی خوڕین:

-ناسنامەکانتان دەربهێنن.

لەگەڵ ئەوەش نیگەرانیمان زۆری نەخایاند و سەرجەنتەکە خێرا لەناو ئۆتۆمبیلەکەوە بەڕوویدا هەڵشاخا:

-پێویست ناکات. پێشتر پشکنیومانن.

پۆلیسەکە داوای لێبووردنی کرد و رێی داین تێپەڕین.

بەڵام هێشتا کۆسپمان لەڕێدا مابوو. پێش چوونە ناو بەیروت، هێندەی نەمابوو بکەوینە خاڵێکی پشکنینی سەربازییەوە، بەڵام تۆنی هەرزوو پێچی کردەوە و وەستا و داوای لە دوو ژەندرمەکە کرد دابەزن.

لێیان پرسی:

ئاخر بۆچی؟

شۆفێرەکە بیانوویەکی دۆزییەوە:

-چونکە بیرم کەوتەوە کەئەبێت لەرێی سەرەوە بڕۆم نەك لەرێی بەندەرەوە.

دوو ژەندرمەکە بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی دابەزین و تا تێپەڕین تەماشایان کردین.

کات نزیکەی ٢ی شەو بوو کە تۆنی لە گۆڕەپانی تۆپەکان دابەزاندم. بێگومان چونکە بەقاچاخ هاتبووم نەمئەتوانی بچمە ئوتێل، بۆیە تاکسییەکم گرت بۆ زاروب-عیتون لە(گەڕەکی کەرکونی دوورزییەکان)، کەئەمزانی پوورە زوهرە بەسۆز و خۆشەویستی دایکێك بۆ کوڕەکەی پێشوازیم ئەکات.

کات نزیکەی سێی شەو بوو لەدەرگەمدا. دوای ئەوەی گوێی لەدەنگی دەرگەکە بوو بەسەختی لەجێگەکەی هەستا و بەهەنگاوی قورس هاتە بەردەگە و بەعەرەبی و بەدەنگێکی توند پرسی:

-کێیە ئەوە؟

وەڵامم دایەوە:

-میوانێکی نائاسایی.

هەر کەبینی ئەشەلم هەراسان بوو:

-چیت بەسەرهاتووە؟ ئەبینم ناتوانیت بەپێوە بوەستیت. نەخۆشیت یا تەقەیان لێکردوویت؟ پێم بڵێ چی روویداوە.

لەبەر ئەوەی ئەستەم بوو پوورە زوهرە ماوەیەکی زۆر بەپێوە بوەستێ،بەشیرەی برازای بێدارکردەوە،کەهەرچەند تەمەنی هەر نۆ ساڵێك ئەبوو بەڵام راهاتبوو لەیارمەتیدانی پوورە نەخۆشەکەی. خێرا تەشتێك ئاوی گەرمی هێنا ،منیش کەوتمە خاوێنکردنەوەی برینەکەم.

دوای دە رۆژ لەوە، ئەمتوانی بەناوشاردا بگەڕێم و سەردانی ئەو هاوڕێیانەم بکەم کە

متمانەم پێیان هەبوو. ئەبوو وریابم لەپەیوەندیی و هاتوچۆکاندا، بەبێ ئەو کارتە پەمەییەی ئاسایشی لوبنان ئەیدایە ئەو سوریانەی بەفەرمیی ئەهاتنە لوبنانەوە. جگە لەوەش دوای ئەوکودەتا شکستخواردووەی شەوی سەرساڵی ١٩٦٢ روویدا، کاربەدەستانی لوبنان زیاتر چاوکراوەبوون و جاری واهەبوو بەرۆژ، هێزکانی تایبەت کە بە (لیوای ١٦) ناسرابوون، پشکنینیان ئەکرد و داوای ناسنامەیان ئەکرد، بۆیە بەدەستهێنانی کارتی پەمەیی پێویست بوو.

یەکێك لەکوردانی سوریا کە ئەندامی پارتی کۆمۆنیستی سوریا بوو، و بەهەمان دۆخی هەڵاتنی مندا تێپەڕیبوو، توانیبووی بەیارمەتی پارتی کۆمۆنیستی لوبنان ئەو بەڵگەنامەیە بەدەست بهێنێت،هاوکاریی کردم تامنیش وەریبگرم، دوای هەفتەیەك ئیتر ترسم نەبوو لەهاتوچۆی ئازادانەی ناو بەیروت و هەموو لوبنان، جگە لەسنووری باشوور، بۆیە ئەمتوانی لەناوەندەکانی کوردی بەیروت نزیك ببمەوە.

ئەو سەردەمە کۆمەڵگەیەکی گەورەی کورد لەلوبنان ئەژیا کە لەجەنگی یەکەمی جیهانەوە وردە وردە ژمارەیان زۆر ئەبوو، تا لەسەرەتای رووداوەکانی ١٩٧٥ دا گەیشتبووە ١٠٠٠٠٠ کەس. ٩٥٪ی کوردەکانی بەیروت لەهەرێمی ماردینی کوردستانی تورکیاوە هاتبوون. چەندین هۆی ئابووریی و سیاسیی ناچاری کردبوون کۆچ بکەن. حکومەتە یەك لەدوای یەکەکانی تورکیا تا ساڵی ١٩٢٥ نەیاتوانیبوو کۆنترۆڵی ناوچەکە بکەن و سەربازگیریی تیا بکەن. بەڵام دوای سەرکوتکردنی راپەڕینەکەی ساڵی ١٩٢٥ی کورد،ئەوناوچەیەش کەوتە ژێر دەسەڵاتی مستەفا کەمال. ئەمەش زۆر لەگەنجانی ناوچەکەی ناچارکرد کۆچ بکەن بۆ دەرباز بوون لە سەربازگیری وڵاتێك کە زمانەکەشیان نەئەزانی،جگەلەوەش ئەو کارەساتە ئابوورییەی بەرۆکی گرتن هانیدان بێ دوودڵیی بریاری کۆچ بدەن: نەخۆشی فیلۆکسیرا(ئەسپێی رووەك) لەمێوستانەکانی داو بەشێکی زۆری خەڵکەکەی لەبژێوی بێبەش کرد.

سەرەنجام هۆکاری کۆمەڵایەتیشی هاتەسەر و خێڵی عمێریی کەخێڵی سەرەکی نیشتەجێی ناوچەکە بوو بەسەر دوو پارتی ڕکەبەردا دابەش بوو، مەحمودکییەکان (لایەنگرانی مەحمود) و عوسمانکییەکان(لایەنگری عوسمان)، و زۆرجار بەهۆی زۆر سادە ناکۆکیی دروست ئەبوو و شەڕی خوێناویی هەڵئەگیرسا کەبریندار و تەنانەت کوژراویشی لێئەکەوتەوە.

پێش دەسەڵاتی ڕاستەقینەی تورك، داناياني هەردوولا ئەیانتوانی ئاشتیان بکەنەوە و قەسابخانەکە ڕاگرن، و ئاگربەست ڕاگەێنن تا بەپێی توانا زامدارەکان چارەسەر بکەن و هیچیان نەئەزانی سەبارەت بەسەربازیی تورکیا و بیرۆکراسیی پۆلیس و زیندان، بەڵام کاتێك ئەو ئامێرە قورسە کەوتە کار، سەدان خێزان سەرکێشییان هەڵبژارد بۆ گەڕان بەدوای گوزەراندا لەدەرەوە، تەنانەت ئەگەر پرپیش بێت لەکۆسپ و تەگەرە، چونکە سوکایەتییەکەی کەمتر بوو لە دەزگای (لێکۆڵینەوەی تاوانەکانی تورك).

لەگەڵ ئەوەش ژیانی کوردانی کۆچبەر لەبەیروت بەهیچ شێوەیەك ئاسان نەبوو، چونکە وێڕای ئەوەی زۆرینەیان مەرجەکانی وەرگرتنی ڕەگەزنامەی لوبنانیان تیابوو، بەڵام تەنیا دابوویانە چەند دەهەزارکەسێك و داواکانی تر بەهۆی ئاینەکەیانەوە هەڵپەسێردران. دانی ڕەگەزنامە بەکوردانی موسڵمان ئەبووە هۆی تێکدانی هاوسەنگیی نێوان ئاین و ئاینزاکان بەزیانی کریستیانەکانی لوبنان، بۆیە هەزاران منداڵی کورد لەقوتابخانە حکومییەکان بێبەشکران و مافی چارەسەریان نەبوو لەنەخۆشخانەکانی حکومەت.

چەند کەسایەتییەکی ناوداری لوبنان هەوڵیاندا ئەو ستەمە ڕاست بکەنەوە، لەوانەش کەمال جونبەلاتی وەزیری ناوخۆی ئەو دەمە، بەڵام کە زانی ناتوانێت کەلەڕەقیی ناوەندە ڕاستڕەوەکانی کریستیان کەئەو کات دەسەڵاتدار و بەهێزبوون لەبەیروت نەرم بکات، بۆیە بڕیاریدا بەڵگەنامەی تایبەت بداتە ئەو کوردانەی بێبەش بوون لەبەڵگەنامە نیشتمانییەکان، تابتوانن ئازادانە لەلوبنان نیشتەجێ بن و کاربکەن.

ورده ورده پەیوەندیم لەگەڵ کوردانی نیشتمانپەروەر پەیداکردەوە بەتایبەت ئەوانەیان کەرەگەزنامەی لوبنانییان هەبوو و هاندان بۆ دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی خێرخوازیی کوردیی کەتوانای هەبێت چالاکیی رووناکبیریی و وەرزشی ئەنجام بدات. ئەم کارە بەپشتیوانیی کەمال جونبەلات ئەنجامدرا و دوای ماوەیەکی کەم، کوردەکان لەهەموو لایەکەوە روویانکردە ناوەندی کۆمەلایەتیی و پزیشکیی و رووناکبیریی و وەرزشیی کوردی، و سەرەڕای ناکۆکیی نێوان مەحمودکی و عوسمانکییەکان، بەلام هەمووان پابەندی گەشەپێدانی بوون. لای خۆمەوە و بۆئەوەی نەبمە جێ سەرنج، هەرگیز سەردانی ناوەندەکەم نەکرد و هەر لەدوورەوە و بەبایەخێکی تایبەتەوە چاودێریی چالاکییەکانیم ئەکرد، وخانوویەکیان لەشوێنێکی تر دابین کرد تا وانەی کوردی تیابلێمەوە.

سەرەڕای جێگیربوونم لەبەیروت بەلام چاودێریی پێشهاتەکانی کوردستانم ئەکرد. هەندێك کەسێتی کوردی عێراق، نیشتەجێی پایتەختی لوبنان، ئۆپۆزسیۆنی رژێمی بەغدا و هاوسۆزی بزوتنەوەی میللیی کورد، لەنزیکەوە چاودێری دۆخی عێراقیان ئەکرد و ئەیانتوانی ئاگادارم بکەنەوە لەرووداوە سیاسیی و سەربازییەکان. ئەو زانیارییە نهێنیانەی لای ئەو سیاسەتکارە دێرینانەبوو، هاوشێوەی ئەوەبوو کەنوێنەرانی بارزانی لەکاتی تێپەڕبوونیان بەبەیروتدا بلاویان ئەکردەوە و پێچەوانەی ئەو هەوالانە بوو کە بەهەراوزەناوە هەندێك رۆژنامەنوسی وابەستە بەبەغدا لەبەیروت بلاویانئەکردەوە.

راستییەکەی سوپا عەرەبییەکانی سەرکەوتوو لە دەشتەکاندا، رووبەڕووی بەرگرییەکی توند ئەبووەوە لەچیاکاندا و زیانی قورسی بەرئەکەوت و داوای یارمەتی لەبەعسی سوریا ئەکرد. کاتێکیش کاربەدەستانی بەغدا هەستیان بەمەترسی کرد، داوای هاوکارییان لەتورکیا و ئێران کرد بۆشەڕی دژی (دوژمنی هاوبەشیان) و ئەفسەرانی تورك و فارس نێردرانە کەرکوك بۆ لێکۆڵینەوەی پلانێکی جەنگیی هاوبەش بۆشەڕی دژ بە(یاخیبووانی باکووری عێراق).

هێندە بەس بوو سەیری ئەو گەورە رۆژنامانەی لوبنان بکەیت کە سەربەخۆیی خۆیان پاراستبوو، تادیمنی راستەقینەی دۆخی عێراق بۆ رای گشتیی لوبنان و عەرەب روون ببێتەوە. هەولێکی زۆرمدا تا سەرنوسەرانی رۆژنامەکانی(ئەلحەیات و نەهار و زمان حال و لۆرینتی بەیانیان و ئێواران) قایل بکەم و بەڵێنیان لێوەرگرم ئەو هەواڵانە بلاویکەنەوە کە ئەیاندەمێ و وتاری بەپێز لەبارەی کێشەی کوردەوە بنوسن.

(عەرەب، ژیان و زمان و کەلتووری ئەمرۆیان،قەرزاری سەلاحەدینی کوردن و پشتگوێ خستنی ئەو راستییە، واتە بێئاگایی تەواو لەمێژوو و ئەو خزمەتانەی گەلی کوردی پالەوان پێشکەشیان کردووین. کاتێك پارتی بەعس خەڵك دژی کورد هان ئەدات، ئەوا دژی مێژووی عەرەب ئەوەستێت و ئەو برایەتییە مەزنە تێك ئەدات کە ئەو گەلە سەرەبەرزە لەهەمووساتە یەکلاکەرەوەکانی مێژووماندا بۆیان دەربڕیوین).

ئەمە وتارێکی مێژوونوسی بەناوبانگی عەرەب (سەلاحەدین مونجد) بوو لەرۆژنامەی حەیاتدا.

رۆژنامەی زمانحالیش کەوتە لەقاودانی ئایدۆلۆژیای فاشییانەی پارتی بەعس و داوای نەرمیی و دیمۆکراسیی لێئەکرد. رۆژنامەی لۆرینتیش لای خۆیەوە راپۆرتێکی درێژی بلاوکردەوە کە بەنازناوێکەوە بۆم ناردبوون، لەوەلامی وتارێکی پڕهەڵەی سەرنوسەرەکەیان. پەیوەندیشم کرد بەئاژانسە جیهانییەکان و پەیامنێرانی رادیۆ و تەلەفزیۆنەکانی ئەورووپا و ئەمێریکاوە.

وردەوردە هەواڵی راستی پێشهاتەکانی کوردستان بەرێکوپێکی لەبەیروتەوە ئەچووە دەر وخەیالپلاو و هەڵبەستەکانی حکومەت رسوا ئەبوون،کورد لەسەر زەوی بەرگریان ئەکرد لەلەشکری هەردوو هاوپەیمانی عێراق و سوریای چەکدار بەفڕۆکە و تانك و تۆپ و بۆمبی ناپالم.

عێراق کەخۆی بەسەرکەوتنەکانییەوە بانەدا هەوڵێکی زۆری دا بۆکڕینی ڕۆژنامە سەربەخۆکانی لوبنان، یا جڵەوکردنی توندڕەوەکانیان، بەڵام هەرنەیانتوانی زانیارییە بابەتییەکان سەبارەت بەکوردستانی عێراق پەردەپۆش بکەن. پاش ماوەیەکی کورت باڵیۆزی عێراق لەبەیروت توانی ناوی ئەو کەسە ئاشکرا بکات کەهەواڵی ورد و بەڵگەداری عێراق ئەداتە میدیای لوبنانی و جیهانی، و بەدەست تێکەڵ کردن لەگەڵ بەڕێوەبەری ئاسایشی لوبنان پیلانێکیان دانا بۆ دەستگیرکردنم و بەبێ ئاگاداریی (پییێر جەمیل) کەئەودەمە وەزیری کاروباری ناوخۆ بوو، پیلانەکەیان جێبەجێ کرد.

لەدیدارێکی نێوانماندا، جەمیل پێی وتم:

-چاك لەنەهامەتییەکەتان تێئەگەم. ئاخر دۆخی ئێوەش بەجۆرێك، لەدۆخی ئێمە، مارۆنییەکانی لوبنان، ئەچێت. شۆڤینییەکانی عەرەب ئەیانەوێت خۆمان تەواو وەك ئەوان بەعەرەب دابنێین هەر لەبەرئەوەی بەعەرەبی قسە ئەکەین. ڕاستە بەعەرەبی ئەدوێین بەڵام بەوە نابینە عەرەب، چونکە ئێمە مێژوویەکی تر و کەلتوورێکی تر و شێوازێکی جیاوازمان هەیە لەبیرکردنەوە و کارکردن و خەون بینیندا. شێوازێکی تەواو جیاواز لەشێوازی ئەوان. تائەوکاتەشی بەڕێزەوە ڕەچاوی تایبەتمەندییەکانمان نەکەن، ئێمەش بەردەوام لێیان هۆشیارئەبین.

سەرلەبەیانی ڕۆژی ١٥ ی شوباتی ١٩٦٦، سێ پیاوی ئاسایشی لوبنان لەبەردەم دەرگەی ماڵی پورە زوهرەدا وەستابوون.بە بەشیرەیان وت، کەدەرگەی لێکردنەوە:

-ئەمانەوێت لەگەڵ نورەدین زازا قسە بکەین.

بەبێ ئەوەی چاوەڕێی (بەخێربێن و فەرموو) بن، ملیان نا بەرەو ئەو هۆڵەی ژوورەکەی من بەسەریدا ئەڕوانێت و سەرۆکەکەیان هاتە پێشەوە:

-دکتۆر زازا؟ ئێمە ئاسایشی لوبنانین، ئەوەش ناسنامەکەم. فرمانم پێیە لەگەڵ خۆمان بتبەین بۆ لێکۆڵینەوە.

-مەبەستت کام لێکۆڵینەوەیە؟
-مەترسە شتێکی وانییە و تەنیا چەند پرسیارێکە.
-لەبەرئەوەی لەگەڵ راپێچ کردن و(چەند پرسیارێك)راهاتووم، کەواتە رێمبدەن تەلەفۆن بکەم بۆ پارێزەرێك تا بەرگریی لەمافەکانم بکات.
سەرۆکەکەیان لەگەڵ ئەوەی ئامۆژگاریی کردم خێرا خۆم بپێچمەوە و هەوڵی دەرباز بوون نەدەم، وەڵامی دامەوە:
-بەڵێنت ئەدەمێ، ئەگەر پێویستی کرد، لای ئێمە ئەو کارەبکەیت.
ماڵی پوورە زوهرە تەنیا یەك قات بوو و چەندین پەنجەرەی تیابوو کەئەڕوانییە سەر باخچەکە و هانی راکردنی ئەدا. بەڵام تەنیا چەند ساتێك ئەو بیرە هاتە مێشکم و لەبەرئەوەی نەمئەزانی چیم لێئەکەن، دوودڵ بووم لەوەی خۆم توشی سەرکێشییەکی بێسود بکەم.
خەریك بوو لەگەڵ پاسەوانەکانم لەماڵەکە دەرچین، پورە زوهرە بەکوردی پێی وتم چی لەکتێب و نامەکانم بکات. توانیم تێی بگەێنم کەلای دراوسێکان بیشارێتەوە.
دوای بیست خولەك لەیەکێك لەژوورەکانی بارەگەی ئاسایشی لوبنان خۆم بینییەوە. سەعاتێك زیاتری پێنەچوو بردمیانەوە بۆماڵەوە. ئاخر بەڕێوەبەرێتیی ئاسایش پێویستی بەبەڵگە هەبوو تا بەندم بکات و بەداتە دادگە، بۆیە هاتبوون ماڵەکەم بپشکنن. ئەترسام پورە زوهرە فریای ئەوە نەکەوتبێت هەموو بەڵگە ترسناکەکان بشارێتەوە. خواخوام بوو لەرێگە توشی رووداوێکی لەناکاو یا پەککەوتن ببین و درەنگ بگەینە ماڵی پورێ، بەڵام مەخابن هیچ موعجیزەیەك روونەدا. لەگەڵ ئەوەش کاتێك چووینە ژوورەکەم یەکسەر سەرنجی ئەوەمدا کە کارتۆنە کتێبەکانی سەر دۆڵابەکە و بەڵگەنامەکانی تریش نەماون. کەچی هەر سێ پۆلیسەکە بەپەلە کەوتنە کردنەوەی دۆڵابەکە و راکێشانی چەکمەجەکان و تەنانەت ژێر جێگە و ژێر فەرشەکەش گەڕان. بەڵام بێسود بوو چونکە پێشتر و بەوردی

هەموو شوێنێکیان پاك کردبووەوە. دوای نیو سەعات پشکنین بەئاتومبێلێ بردیانەوە بۆ ئاسایش.

بردمیانە ژووری (عومەر نوێری)سەرۆکی کۆمیسەرەکان، کە بەدژایەتی کردنی توندی کوردانی بەبیروت ناسرابوو. هەموو جارێك کەیەکێك لەکرێکارە گەنجەکوردەکانی ئەگرت و لێیئەدان یا ئەشکەنجەی ئەدان بەگومانی کوردپەروەریی، لەخۆشیدا هەردوو دەستی لەیەك ئەخشاند. هەر ئەم موسڵمانە سونەیەش بوو کەشەڕی زۆری کرد، تا رێنەدات، کەمال جونبەلات مۆڵەت بداتە کوردەکان بۆکردنەوەی ناوەندی کۆمەڵایەتیی و کەلتووریی. ئەو زەلامەبوو کە بە ناوچاوانێکی گرژ و هەڕەشەوە پێشوازیکردم:

-بۆ سەردانی رۆژنامەکانی لوبنان و ئاژانسە بێگانەکانت کردووە تا پەیوەندیی دۆستانەی لوبنان و عێراق تێکبدەیت؟ لەسایەی جەنابتەوە حکومەتی عێراق لەهاوولاتیانی خۆی قەدەغە کردووە کە لوبنان وەك وڵاتێکی گەشتیاریی هەڵبژێرن.

وەڵامم دایەوە:

-ئەگەر رۆژێك عێراق بڕیارێکی وابدات، ئەوا بەهۆی ئەو جەنگەوەیە کەدژی کورد بەرپای کردووە. بێگومان ئەو جەنگەش بەهاکەی گرانە و لەرۆژانی داهاتوودا، وێڕای داهاتی خەیاڵیی نەوتی کورد، گەنجینەکانی عێراق بەتەواویی بەتاڵ ئەبێت. بۆیە لەبەرژەوەندیی لوبنانە ئەو شەڕە بوەستێت و سەرەنجام عێراق دان بەئۆتۆنۆمیدا بنێت، ئەو مافە هەژارانەیەی کورد داوای ئەکات.

نوێری بەتووڕەییەوە وەڵامی دایەوە:

-وەك بێگانەیەك بۆت نییە دەست وەردەیتە سیاسەتی لوبنانەوە. کەچی تۆ لەنوسینگەکەی منیشدا ئەوە ئەکەیت! ئەمە ناماقوڵە و لەمەودوا لەوڵاتی خۆماندا رێی ئەوەت پێنادەین.

-کەواتە بەرگەیەکی هاتوچۆم بدەنێ و بۆچەند رۆژێك مۆڵەتم بدەن تالەکۆڵتان ببمەوە.

-بەرەگەی هاتوچۆ وەرنەگریت و مۆڵەتی چلوهەشت سەعاتت هەیە بۆ بەجێهێشتنی لوبنان و دوای ئەوە بۆت نییە بێیتەوە بەبێ رەزامەندیە ئێمە.

بەمەرجەکانی نوێری قایل بووم بەلاَم ئەیویست دەست بەسەرم بکات تا کاتی رۆشتنم. پێم وت:

-هیچ هۆیەك نییە بۆ دەستبەسەر کردنم. تکائەکەم رێبدەن لەگەڵ پارێزەرێك قسەبکەم تابەرگریم لێبکات.

بەپێکەنینەوە وتی:

-ئەبێت ئەو پارێزەرەی بەرگریت لێئەکات بەدەستپێشخەریی خۆی بێت بۆ ئێرە. لەم کاتەوە بۆت نییە پەیوەندیی بکەیت بەدەرەوە.

قسەکانی تەواو کرد و دوو یاساوڵی بانگ کرد، کەیەکسەر راپێچی ژوورێکیان کردم و بۆینباخ و قایش و قەیتانی پێلاوەکانمیان لێسەندم و لەوێوە بەدووری چەند مەترێك بردمیانە بەردەم دەرگەیەکی شیشی ئاسنی ئەستوور و پۆلیسێك دەرگەکەی کردەوە و پاڵی پێوەنام بۆ شوێنێکی ژێرزەمین ئاسای روناك کە بەپاڵەپەستۆ چەند کەسێکی تیا پاڵ کەوتبوو. بۆچەند ساتێك لەناوەڕاستی ژوورەکەدا وەستام و لەچواردەوری خۆم ورد بوومەوە: شوێنەکە هەر دوو مەتر و نیو بە چوار مەتر ئەبوو، بێ دەریچەی رووناکیی و هەواکێش،مەگەر لەرێی شیشەکانەوە،ئاو وئاودەستی تیانەبوو. لەبنەوەی ژێرزەمینەکەدا سەرنجی سەتڵێکی فافۆنی پڕ ئاوم دا کە رووەکەی بە ئاغزەجگەرەو بەڵغەم داپۆشرابوو.

کاتێك یەکێك لەبەندییەکان بینیمی بێ جووڵە ئەبڵەق بووم، داوای لێکردم لەتەنیشتییەوە و لەسەر حەسیرەکەی دانیشم. خەڵکی سوریا بوو و شەوێك کە(کارتە پەمەییەکەی)لەماڵەوە بیرچوو بوو لەپشکنینێکی سەربازیدا گیرابوو و لەبری ئەوەی پۆلیس بچن بۆماڵەکەی تا لەراستیی قسەکانی بکۆڵنەوە، فڕێیان دابووە ئێرە و پێنج رۆژە کەس لێی ناپرسێتەوە. ئەو چاوەڕێ بوو. زۆری تریش وەك ئەو قوربانیی مامەڵەی خراپ و

پشتگوێ خستن بوون و بووبوونە قوربانیی گەندەڵیی و بیرۆکراسییەتێکی کرچ و کاڵ. پاکستانییەکم بینی کە شەش مانگ بوو لێرەدا دارزابوو لەبەر ئەوەی پاسپۆرتەکەی ون کردبوو.منیش پێنج رۆژم بەسەربرد و کەس لێی نەپرسیمەوە. سەرەنجام رۆژی شەشەم دەربان کردم بەمەبەستی ئامادەکردنی کارتی هاتوچۆ، بەرێکەوت چەند وێنەیکی پاسپۆرتم پێبوو بۆیە کارەکە تەنیا سەعاتێکی خایاند. بەپێی قسەی کۆمیسەرەکە، لەم ساتەوە تەنیا چلوهەشت سەعاتم لەبەردەمدا بوو تا ڤیزای وڵاتێکی ئەوروپای خۆرئاوا وەرگرم، کەچی لەپڕ ئاسایش رای گۆڕی سەبارەت بەوەی چلوهەشت سەعات لەناو بەیروتدا ئازاد بم، بۆیە کەتمە بیرکردنەوە لەوەی چیم پێنەکرێت لای کەسایەتییە ناودارەکانی لوبنان کەئەمناسین لەوانەش کەمال جونبەلات و پییێر جومەیل.

کۆمیسەرەکە پێی وتم:

-شتی وانییە ئێرە بەجێبهێڵیت. لێرەوە بەتەلەفون پەیوەندیی بکە بەو باڵیۆزخانانەی مەبەستتە.

پێشنیازێکی بێسود بوو، هێندەی بەوتایە لەکوێوە تەلەفون ئەکەم، مەترسی ئەوە هەبوو دیپلۆماتەکان داواکەم رەت بکەنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا توانیم قسە بکەم لەگەڵ کونسوڵی گشتیی هۆڵەندا و کونسوڵی ئەڵمانیای فیدراڵ، کەپێشتر و لەدەرفەتێکدا باسی کێشەی کوردم بۆ کردبوو.

هەردووکیان وەڵامیان دامەوە:

-پێویستە سەردانی نوسینگەکانمان بکەیت تا داوای فەرمیی پێشکەش بکەیت.

لەبەر ئەوەی ئاسایش بەهەمموو توانایەوە ئەیویست لە لوبنان دوورم بخاتەوە، بۆیە گرێمانەیەکی تری دانابوو، چونکە هەر ناسنامەت پێبوایە ئەتتوانی لە سوریاوە بچیتە ئوردون و لەگەڵ ئەوەی نیشتەجێی لوبنان بووم بەڵام ئەمتوانی بەبێ گرفت بچم بۆ عەممان.

ئەمە رای جەنابی کۆمیسەر بوو. بەڵام خۆم دڵنیا بووم کە لە ئوردون تووشی کێشە نەبم، کەچی ئەو پیاوچاکانەی ئاسایش مکوڕ بوون لەسەر جێبەجێکردنی پێشنیازەکەیان.

ئێوارەی ۲۱ ی نیسان راپێچیان کردمە فڕۆکەخانەی بەیروت و ناچاریان کردم بلیتێکی دووسەرەی بەیروت-عەمان بکڕم و رادەستی پیاوێکی ئاسایشیان کردم کەبەرپرسی ئاسایشی کۆمپانیایەکی هێڵی ئاسمانیی بوو.

دوای چەند سەعاتێك فڕۆکەکە لەخاکی ئوردوندا نیشتەوە. کاتی تێپەڕبوون بەبنکەی سەیرکردنی پاسپۆرتدا کابرای ئەفسەری خزمەتگوزار کە ڕووخسارێکی چەرکەسیی ئاشکرای هەبوو، لەشوێنەکەی راپەڕی،وەك ئەوەی شارە زەردەواڵەیەکی تێوروکابێت و بەزاراوەیەکی عەرەبی کۆچەریی تێکشکاو لێی پرسیم:

-لەکوێوە هاتوویت؟

-لەبەیروتەوە.

-ئەی کوا پاسپۆرتەکەت؟

کەبۆم روون کردەوە من کێم و ئاسایشی لوبنان چییان پێکردووم، سەرێکی لەقاند و وتی:

-ئەوەی تۆ باسی ئەکەیت سەیر و سەمەرەیە.

پاشان بردمییە ئۆفیسەکەی و تەلەفۆنی کرد بۆ سەرۆکایەتیی ئەرکانی ئوردون و هەواڵگریی تایبەت. دوای نیوسەعات جیپێکی سەربازیی بردمییە بەردەم بارەگەی سەرۆکایەتی ئەرکانی ئوردون، و هەر گەیشتمە ژوورەوە شەش ئەفسەر دەوریان دام، پێش ئەوەی بمبەن بۆشوێنێکی تر.

فەرماندەیەکی گەنجی باڵابەرز و سپیکار ئەیویست شتی زیاترم لەبارەوە بزانێت:

-ئاخر من کوردم.

-کورد چۆن؟ مَن مەبەستم ئەوەیە سەر بە چ پارتێکیت؟

-تەنیا کوردم.

-پشتیوانیی بارزانی ئەکەیت؟

-وەك هەر کوردێکی تر هاوڕای تێکۆشانی ئەوم.

-ئێ دەڵێن کە تۆ جوداخواز و کۆمۆنیستیت.

-بارزانی نەکۆمۆنیستە و نەجوداخواز. ئەو تەنیا کوردێکی بەشەرەفە و خەبات ئەکات لەپێناو مافە سروشتییەکانی گەلەکەی.

فرمانی پێکردم:

-بەکورتی شتێکمان بۆ بنوسە لەسەر ژیانت و چالاکییەکانت.

لەبەر ئەوەی خۆم شەکەت بووم، یەکێك لەئەفسەرەکان شتەکانی بۆ نوسیم و قۆناغە گرنگەکانی ژیانی تۆمار کرد لەگەڵ چالاکییەکانم وەك تێکۆشەرێکی کورد، ئینجا تەنیا جێی هێشتم و سەرقاڵی کاغەزەکانی بوو. گفتوگۆکان درێژەی کێشا و نزیکی سەعات یەکی بەیانی سەربازێك هات بەدوامدا تا بمبات بۆ شوێنێك کە پێی نەوتم کوێیە. دوای تێپەڕبوون لەچەندین گردی رووتەن جیپە سەربازییەکە گەیشتە عەمان و بەرێگەیەکی کەم رووناکیدا رۆیشت تا سەرەنجام لەبەردەم بنکەیەکی پۆلیسدا وەستا. کەچووینە ژوورەوە پۆلیسێکی پاسەوان چوو بۆ بێدارکردنەوەی ئەفسەری ئێشکگر کە بەباڵای بەرز و قژی زەرد و روومەتە سوور هەڵگەڕاوەکانیدا دیاربوو نەژادی قەفقازییە. کاتێك بەتورکی لێمپرسی چارەنووسم چی ئەبێت،بەچاوانی سەرسام وپێڵو ئاوساوەوە تێی روانیم و هیچی نەوت. چووە ژوورەکەی و کەوتە خوێندنەوەی ئەو کاغەزانەی پاسەوانەکەم بۆی رادێرا و تەلەفۆنێکی کرد. ئینجا چەند قسەیەکی چرپاند بەگوێی پۆلیسەکەدا و کاغەزەکانی دایەوە دەستی. سواری ئەو جیپە بووینەوە کە هێنابووینی و پێچی کردەوە و دوای نزیکەی کیلۆمەترێك رێبڕین لەبەردەم بنکەیەکی تری پۆلیسدا راوەستاین. لەبەردەم دەرگەی زیندانەکەدا سەرجەنتێکی سمێڵ زل و شۆڕ، دەرگەی لێکردینەوە کە خۆشمەشرەبیی لەسیمایدا دیاربوو.

دوای ئەوەی لەدۆسیەیەکی زەبەلاحدا ناومی تۆمارکرد، یاساوڵەکە دەرگەی ڕاڕەوەکەی بۆکردمەوە و فرمانی دامێ وەك بەندییەکانی تر لەسەر زەوییەکە بخەوم، بەڵام لەبەر پرخەپرخ و بۆنی ناخۆشی شوێنەکە پێم باشتر بوو لەڕاڕەوەکەدا بمێنمەوە و خۆمدا بەسەر شیشی دەرگاکەدا. یاساوڵەکە کەسەراسیمەبوو لەدۆخی من و پۆشاکە خاوێنەکانم لەچاو بەندییەکانی تردا، پێشنیازی بۆ کردم کوپێك چای لەگەڵ بخۆمەوە و منیش بەخۆشییەوە قایل بووم و لەسەر جێگەکەی دانیشتم.

بەدەم چاخواردنەوە زانیم فەلەستینییە و زۆرینەی کارمەندانی حکومەت فەلەستینین و ڕەگەزنامەی ئوردونییان وەرگرتووە. ئەوەشی بەڕاشکاویی درکاند کە فەلەستینییەکان چارەی شاحسێن و خێزانەکەییان ناوێت و بەم نزیکانە لەکۆڵ خۆیانی ئەکەنەوە.

ئینجا باسی ئەوەی بۆکردم خێزانێکی زۆری بەسەردا کەوتووە و موچەکەی بەشی تێرکردنیان ناکات و ناچارە بەرۆژ هەندێك وردەکاری تر بکات. لەبەر ئەوەی کرۆزانەوەکەی نەئەبڕییەوە بڕێك پارەم بەلیرەی لوبنانی دایە کەئەیکردە دوو دیناری ئوردونیی، بۆئەو پارەیەکی خەیاڵی بوو،هەر بۆیە یەکسەر داوای لێکردم تاخۆرهەڵاتن لەسەر جێگەکەی ئەو بخەوم.

لێم پرسی:

-ئەی خۆت؟

-ئۆو، فێری شەو بێداریی بووم و ئەگەر زۆر خەویشم هات ئەوا سەرئەخەمە سەر مێزەکەو ئەخەوم.

بەو جۆرە بەشێکی شەوەکە لەجێگەکەی سەرجەنتدا خەوتم. کەمێك پێش بەرەبەیان، لەپڕ بێداری کردمەوە:

-لەوانەیە کەمێکی تر فەرماندەکانم بگەنە ئێرە. باشتر وایە هەوڵ بدەیت لەسەر ئەو کورسییەی ڕاڕەوەکە بخەویت.

پاش کەمێك زەنگی تەلەفۆن لێیدا و پێیان وتم خۆم ئامادە بکەم ئەمگەڕێننەوە بۆ بەیروت. دوو سەعات دواتر فڕۆکەیەك لەفڕۆکەخانەی خالیدی دایگرتم و نیو سەعات دواتر لەبەردەم کۆمیسەر نوێریدا بووم.

نوێری قیژاندی:

-ها، ناردیانیتەوە بۆمان؟

-پێم وتیت ئوردون ئامێزم بۆناکاتەوە. لەمەو دوا مەمنێرن بۆ ولاتێکی عەرەبی، بەڵکو چلوهەشت سەعات بوارم بدەن. هەرهێندەم پێویستە تا ڤیزای ولاتێکی ئەوروپایی وەرگرم.

کۆمیسەر وەلامی دایەوە:

-هیچ کارمان نییە هەرخەریکی کێشەکانی تۆیین لازۆر بەسادەیی بڕیارماندا بتنێرینەوە بۆسوریا و ئەوە گرفتی خۆتە کە باری خۆت لەگەڵ کاربەدەستانی ولاتەکەت باش بکەیتەوە.

-جا ئەوێرن کارێکی وا بکەن؟

-بەڵێ چونکە ئەوە بۆ هەردوولامان باشترە.

-ئەی ئەگەر رەتم کردەوە؟

-ئامۆژگاریت ناکەم ئەوە بکەیت؟ چونکە بڕیارمانداوە هەرچۆنێك بێت رادەستی سوریات بکەینەوە، تەنانەت ئەگەر بەچوارپەلی بەستراویش بێت. بۆیە باشتر وایە گوێرایەل بیت و سەرسەختیی نەکەیت.

دووچاری نەهامەتییەکی ترسناك بووبووم، لەدەرەوە دۆستانم نەیانتوانی هیچ شتێك بکەن بۆ دەربازکردنم لەم قۆرتە. لەوانەبوو هەوڵی کەسایەتییە کاریگەرەکان ببێتە هۆی بەهانا هاتنم، چونکە ئاسایش هیچ بنەمایەکی قانونیی نەبوو بۆ گرتنم.کەچی کەس نەجولا، نە جونبلات و نە جومەیل کە ئەیانتوانی بە تەلەفۆنێکی ئاسایی ئازادم بکەن،

بەڵام ئاگایان لەبەسەرهاتەکەم نەبوو.دوای بیرکردنەوەیەك ناچار قایل بووم بێ پەلەقاژە رادەستی سوریام بکەنەوە. و بەپەلە نوێری کەوتەخۆ بۆ رێکخستنی کارەکە و پۆلیس هاتن تا بمبەنە بنکەی ژەندرمەی خۆرئاوای بەیروت. دەمەو ئێوارە گواستیانمەوە بۆ لقی ئەشرەفیەی ژەندرمە، کەئەرکی ئاڵوگۆڕی(تاوانباران)ی نێوان هەردوو وڵاتی لەئەستۆ بوو و شەوێکی تۆقێنەرم لەوێ بەسەر برد بەبێ پێخەف و تابەیانی لەسەر چیمەنتۆکە هەڵئەلەرزیم. بۆ بەیانییەکەی سەرجەنتێکی بەجۆش ئەیویست ناچارم بکات شوێنەکە خاوێن بکەم، بەڵام کاتێك گوێی لێبوو بەزمانی فرەنسی نارەزایی دەرئەبڕم لەشوێنەکەی خۆی راچڵەکی و سەرەنجام لەدۆخەکەم تێگەیشت-شەیدای ئەدەبی فرەنسی بوو-کەچی سەرجەنتەکە پێنج لیرەی لوبنانی لێ کێشامەوە بەو بەڵێنەی رێمبدات تەلەفۆن بۆ هاورێیەکم بکەم کە پییێر جەمیلی ئەناسی، بەڵام بەڵێنەکەی نەبردەسەر. رۆژی دواتر واتە ٢٣ی نیسان، منی سێ ساڵ لەوەوبەر بەنهێنی هەڵاتوو، پێوەند لەدەست و بەپاسەوانیی سێ ژەندرمەی لوبنانی بەئۆتۆمبیلێکی لاندرۆڤەر بەرەو سوریا ئەبرام،لەرۆژێکی زۆر دڵگیردا کەئاسمان ساماڵ و شین و خۆری بەیانی بەهاریی چیاکانی داپۆشیبوو، بەچینێك ئاوریشمی مۆسلین و درەختەکانی بستە و کشمیش و قۆخ و سێو بۆنێکی جادوویيان پەخش ئەکرد. ئەم دیمەنە هێندە دڵرفێن و جادوویی بوو کەیەکسەر خستمییەوە بیری ساڵانی منداڵیم لەکوردستانی تورکیا و کۆت و پاسەوان و ئاقارەکەمی لەبیر بردمەوە.

کاتێك ئۆتۆمبیلەکە لەناکاو لەبەردەم پۆلیسی سەربازیی سوریادا راوەستا، بڕوام بەچاوی خۆم نەئەکرد. لەخۆمم پرسی:

-نا، ئەمە مەحاڵە، چۆن ئەبێت هەمدیسان بکەومەوە ژێر چنگیان؟

# سوریا

- شەش مانگ لەزیندانێکی تاکەکەسیدا لەزیندانی شێخ حەسەن لەدیمەشق

- ژیانی رۆژانە بەئەشکەنجەوە

- لەنێوان بەندییەکانی(برایانی موسڵمان) و بەعسییەکان و .......هتد

- دوورخرانەوە بۆ چیای دروز

- نیشتەجێی زۆرەملێ لەدیمەشق

کاتێك کاربەدەستانی سوریا بەتەلەفۆن ئاگادار کران، سەرجەنتێك و سێ پۆلیسیان ڕاسپارد بۆ کارەکە و وەریانگرتم و بێ ئەوەی تەنیا ساتێك بدەن بەفیڕۆ، تێیانتەقاند بۆ دیمەشق. سەرجەنتەکە سەرەڕای جەختکردنەوەی یاساوڵەکانی، بەپێویستی نەزانی کەلەپچەم لەدەست بکات.

-لەم شاخ و داخەدا بۆ کوێ ئەچێت؟

ئەم ڕەفتارەی دڵنیا و هێوری کردمەوە. نەمزانی کە ڕۆژی ۲۳ ی شوباتی۱۹٦٦ کودەتایەکی سەربازیی لەسوریا کراوە و (سەرکردایەتیی نیشتمانی) پارتی بەعس بەسەرکردایەتی (سەلاح جەدید)، (سەرکردایەتیی نەتەوەیی) بەسەرکردایەتیی (ئەمین حافز)ی سەرۆکی وڵاتی لەکار خستووە و سەرکردایەتیی نوێ ئاڕاستە چەپی سۆسیالیستی ڕاگەیاندووە.

((تۆ بڵێیت ڕەفتاری مرۆڤ دۆستانەی سەرجەنتەکە ئەنجامی ئەوە بێت؟))

خەیاڵەکانم زۆری نەخایاند. لەدیمەشق بنکە بەبنکە گێڕایانم تا خۆم لەگەڕەکی شێخ محێدین بینییەوە و ناچاربووم چەند سەعاتێك چاوەڕێ بم. سەعات یەکی پاش نیوەڕۆ دوو پۆلیسی سڤیل هاتن و بردیانمە ژوورێکی ژێرزەمین و دەرگەی ژوورێکیان لێ داخستم کەجێخەوێکی سەربازیی و چەندین باوەڵی داخراوی تێدابوو. ژوورەکە پەنجەرەکانی شیشبەند و داڕماو بوو و سێ ڕۆژی تیامامەوە. سەرلەبەیانی ڕۆژی سێیەم بردیانم بۆشوێنێکی نادیار. تووشی دڵە کوتێ بووم و بیرم کردەوە کە دیسان لەزیندانی مەزە بەندم ئەکەنەوە،بەڵام کەگەیشتینە ناوەندی شار ئۆتۆمبیلەکە لەجیاتی لای ڕاست بەلای چەپدا پێچی کردەوە. لەخۆم پرسی:

-تۆ بڵێیت بەرەو بەندیخانەی ناوەندی بێت؟

نا نەخێر، چونکە جیپەکە دوای تێپەڕین بەبەردەم بازاڕی حەمیدیەدا بەرەو مەیدان بایدایەوە کەیەکێکە لەکۆنترین گەڕەکە میللییەکانی دیمەشق. دوای کەمێك لەبەردەم خانوویەکی دیوار ئەستووری دەرگە زەبەلاحدا وەستا کەبەسەر دەرگەکەوە نوسرابوو: (بنکەی پۆلیسی شێخ حەسەن).

((ئاخۆ لەژووری تاکە کەسیدا بەندم ئەکەن وەك ئەوەی لەشێخ حەسەن نەریتە؟ ئایا ئەتوانم بەرگەی ئەو گۆشەگیرکردنە بگرم؟) ئەو پرسیارە مێشکی بەرنەئەدام دوای ئەوەی چەند هەنگاوێك بەقادرمەیەکی پێچاوپێچدا سەرکەوتین و گەیشتینە دەرگەیەك کەلەودیوەوە داخرابوو. یەکێك بەتوندی و چەند جارێك لەدەرگەی دا، بەشێوەیەك هەموو خانووەکە ئەلەرییەوە. دەنگێك لەسەرەوە هاواری کرد:

-وا هاتم!

پاشان دەنگی کلیل هات و لەبێدەنگییەکی تەواودا گوێمان لەدەنگی پێ بوو لەسەر پلیکانەکە و کاتێك دەرگە کرایەوە پیاوێکی ئەسمەری کەتەم بینی کەکراسێکی نیوقۆڵی پۆشیبوو، سمێڵێکی فشی هەبوو و دەمانچەیەکیش بەلاقەدییەوە شۆڕ بووبووەوە.

بەبزەیەکەوە بەهاوکارەکانی وت:

-مشتەرییەکی نوێ؟ لەکاتێکی گونجاودا هات چونکە خەریك بوو لەودوانەی تر کە لێرەن بێتاقەت ئەبووین.

پاسەوانە سمێڵ شۆڕەکە بەوشکیی دەرگەی ژوورێکی لێداخستم کەدرێژیی ١٨٠ سانتیمەتر و پانییەکەی مەتر و نیو و بەرزییەکەشی دوو مەترێك ئەبوو، لای چەپەوە بەدرێژایی دیوارەکە سەکۆیەکی قوڕی بەچیمەنتۆ لەبغ کراویان درووست کردبوو وەك جێخەو و لەناویشەوە لەنزمایییەکدا چاڵێك و بەلوعەیەك بەسۆندەیەکی ئاوەوە بەستراو وەك تەوالێت،پەنجەرەیەکی بچووکیش بەسەر حەوشەدا ئەیڕوانی و ئەگەر پێوە لەسەر نوکی

پەنجە بوەستاییتایە دیمەنی گۆڕستانێکی گەورە دیاربوو کەدەوری سێ بەشی زیندانەکەی دابوو. و بەدرێژایی ماوەی مانەوەم لەشێخ حەسەن گریان و لەخۆدانی ناو گۆڕستانەکە هاورێم بوون.

بەشی سەرەوەی دەرگەکە کونێکی تیابوو،پاسەوانەکان بەویستی خۆیان ئەیانکردەوەو دایان ئەخست و ئەوی ژوورەکەی من ماوەی یەك مانگ داخرابوو، ئەو ماوەیەی بەگۆشەگیریی بەسەرم برد و تەنیا دەنگم ئەبیست و کەسم نەئەبینی مەگەر لای نیوەڕۆ کاتێك پۆلیسەکان کونەکەیان ئەکردەوە تا بزانن چی ئەخۆم و لەبەر ئەوەی خواردنی گەرم قەدەغەبوو پێشنیازی سێ جۆر سەندویچیان ئەکرد: سەندویچی پەنیری سپی، یا سەندویچی کەرە و مرەبا، یا شیرینی. ئەمتوانی داوای میوەش بکەم. دە خولەك پاش ئەوەی داوام ئەکرد، پۆلیسەکان خۆراك و میوەکەیان ئەخستە بەردەمم و داوای پارەکەیان ئەکرد و بەپەلە دەرگەکەیان دائەخستەوە.

کاریگەریی گۆشەگیرییەکە زۆر سەخت بوو لەسەر دەروونم تا رادەیەك کە ئێوارەی رۆژی سێیەم بیرم لەخۆکوشتن کردەوە بەبڕینی خوێنبەری مەچەکم. بۆئەوەش بزمارەکانی قەراخی پەنجەرەکەم هەڵکەند و هەوڵمدا بەشێکی شوشەکە بشکێنم و خەریك بوو ئەگەیشتمە مەبەست، بەڵام دیاربوو زۆرم هەڵکەندبوو، شوشەکە لەچوارچێوەکەی هاتەدەر و خزایە خوارەوە و دەنگێکی ترسناکی هەبوو، بەشێوەیەك کەپاسەوانی ئێشکگر بەهەڵەداوان خۆی گەیاندە ژوورەکەم. و بەترسەوە لێی پرسیم:

-چی بووە؟!

-ئۆی، هیچ نەبوو، شوشەکە کەوتە خوارەوە.

-شوشە لەخۆیەوە ناکەوێت. دیار دەستکاریت کردووە.

-ئەمویست پەنجەرەکە بکەمەوە، کەوتە خوارەوە.

بەتووڕەیی وەڵامی دامەوە:

-درۆ و دەلەسەم بۆ مەکە، بەڵکو بڵێ بەنیازی کاری خراپ بوویت و ناشتوانیت بیشاریتەوە،لەوشتانەم زۆربینیوە. هەر ماوەیەك لەمەوبەربوو، لەدواساتدا بەندییەکمان رزگار کرد، کەبەهەمان شێوازی تۆ توانیبووی خونبەری مەچەکی ببڕێت. باشترە وایە جارێکی تر هەوڵی لەوجۆرە نەدەیت، ئەگینا بەزنجیر نەتبەستینەوە. یەڵا ئێستا ئەم ژوورە بەجێبهێڵە و وەرە تا لای ژوورەکەی خۆمەوە جێت بکەمەوە. پێخەوەکانت مەهێنە، لەوێ هیترت ئەدەمێ بەدڵی خۆت.

کە گواستەمەوە بۆ شوێنە نوێکەم دوو بەندییەکەی ترم بینی. یەکێکیان بەساڵاچوو بوو و لەنزیك ژوورەکەیەو و لەسەر پێخەوێك لەرارەوەکەدا قاچ لەسەر قاچ دانیشتبوو، کە لەبەر تەمەنەکەی ئەو نیعمەتەیان دابوێ. بەندییەکەی تر لەپشت پەنجەرە کراوەکەیەوە راوەستابوو و بەسیمایدا ئەوەم بۆ دەرکەوت کەپێشتر موچەخۆری هەواڵگریی ناسر بووە و دیارە ترس و تۆقینی لەگیانی تۆپۆزسیۆنی رژێمدا چاندووە. تۆمەتی ئەوەیان دابووە پاڵ کەچەندین بەندکراوی ئەشکەنجە داوە تا مردن، تۆ بڵێیت کاربەدەستانی ئێستا بیانەوێت لەسەر تاوانەکانی سزای بدەن، یا بەسادەیی ئەیانەوێت ناچاری بکەن تا بەگیان و دڵ بکەوێتە خزمەتیانەوە؟ هەرگیز وەڵامی ئەو پرسیارەم دەست نەکەوت چونکە چەند رۆژێك دواتر ئازادیان کرد.

ئەو ئێوارەیەی بەبەردەمیاندا تێپەڕیم، دیاربوو هاوسێکانم سەرگەرمی چاخواردنەوەن، پاش ماوەیەکی کورت لەکونجە نوێکەمدا پیرەکە لێم نزیك بووەوە و دەریچەکەی کردەوە و کوپێك چای بۆ درێژکردم. بەشێوەیەکی باوکانە پێی وتم:

-ها بگرە و بیخۆرەوە، ئەتحەوێنێتەوە. رۆژەکانی سەرەتا لێرە زۆر سەختن، دوای ئەوە رادێیت. کەمێك ئۆقرە بگرە و هەموو شتێك باش ئەبێت.

دوای ئەو قسەیە پەنجەرەکەی داخست و گەڕایەوە و تەسبیح بەدەست و بەدەم چا خواردنەوە،سەرگوزشتەی بۆپاسەوانەکە ئەگێڕایەوە.

سەردانەکەی و وشە هاندەرەکانی و چایەکەی، هێوریان کردمەوە و حەزم کرد گوێ لەقسەکانی ئەوپیاوە ئازایە بگرم و بەدەم ئاوازی دەنگە نەرمەکەیەوە خەوم لێکەوت. بۆ بەیانی و رۆژانی دواتر بەردەوام کوپێك چای بۆ ئەهێنام، هەموو جاریش قسەی لەگەڵ ئەکردم. کاتێك لەبارەی خۆیەوە لێم پرسی، دەرکەوت زۆر دڵپڕە و بەدەنگێکی نزم پێی وتم دانیشتووی گەڕەکی کوردانە و ئەشزانێت من کێم.

بەڵام پیرەمێردێکی نیگا میهرەبانی وەك ئەو بۆ ئەبێت رێی بکەوێتە شێخ حەسەن؟ بۆی باس کردم کەخانوویەکی هەیە و چەند ساڵێکە ئەفسەرێك بەکرێ گرتوویەتی، ئەمیش کوڕەکەی واخەریکە هاوسەرگیریی بکات و بڕیاریدا لەوخانووەدا نیشتەجێی بکات و مۆڵەتی شەش مانگی دایە ئەفسەرەکە تاخانوویەکی تر بدۆزێتەوە، بەڵام شەش مانگە تێپەڕی و ئەفسەرەکە لەجێی خۆی نەجوڵا و پیرەی دیارنەبوو کەنیازی وایە خانووەکە چۆڵ بکات، پیرەمێردیش لەدادگە سکاڵای لێکرد بەهیوای وەرگرتنەوەی مافی خۆی.

ئەفسەرەکەش بەروویدا هەڵشاخا:

-چۆن؟ ئەوێریت شکاتم لێبکەیت؟ پیشان ئەدەم چیت پێ ئەکەم.

پاش چەند رۆژێك ئاسایش بەشەو چوونەسەری ولەجێگەکەی دەریانهێنا و فڕێیاندایە شێخ حەسەنەوە و پانزە رۆژە لەوێدایە و هەڕەشەیان لێکردووە ئەگەر سکاڵاکەی نەکێشێتەوە، تائەمرێت لێرە ئەمێنێتەوە.

لێمپرسی:

-ئەی بیر لەچی ئەکەیتەوە؟

بە کەساسییەوە وتی:

-ئۆهـ! پێموایە واز لەسکاڵاکە ئەهێنم چونکە نەتوانا ونە لەشساخیی ئەوەم هەیە بەرگەی ئەم جۆرە زیندانە بگرم. کوڕەکەم قیربەقەرەس، کەی توانیمان شوێنێك بۆخۆی و ژنەکەی لای خۆمان دابین بکەین، ئەو کاتە ژن ئەهێنێت.

دوای ئەوە بە سێ ڕۆژ و لەکاتی ماڵئاواییی لێکردنم، لێی پرسیم کەئەتوانێت لەناو شار چیم بۆبکات، ناوی هەندێك دۆستم پێوت و تکام لێکرد خۆی بچێت بۆ بینینیان و هەواڵی منیان بداتێ و داوایان لێبکات هەوڵ بدەن بۆ دەرکردنم لەزیندان. سوێندی خوارد کەئەو کارە ئەکات و بۆیادگاریش تەسبیحە درێژەکەی بۆ بەجێهێشتم.

-یارمەتیت ئەدات بۆ کات بەسەربردن و هاوکات وای دابنێ تەلیسمێکە و شادی و کامەرانیت بۆ ئەهێنێت.

زۆری نەبرد بەندیی تریان هێنا کە سەر بەرێکخراوی(برایانی موسڵمان)بوون و ڕاپێچی ژووری ئەشکەنجەیان کردن و توانییان هەندێك ناویان لێ دەرکێشن وبەڵێنیان پێ ئیمزا بکەن بەوەی توخنی سیاسەت نەکەون، پێش ئەوەی ئازادیان بکەن. گوێم لە گریان و پاڕانەوەیان بوو.

سەرلەبەیانی ڕۆژێکی خۆش، کە دە ڕۆژ تێپەڕیبوو بەسەر مانەوەمدا لەشێخ حەسەن، تەقەتەقێکی توند هات و دەرگەی ژوورەکەم کرایەوە و پیاوێکی بەلەسەی لەخۆباییی تەمەن نزیکەی سی ساڵ خۆی کرد بەژووردا و بەکەشوفشەوە وتی:

-ئەمناسیت؟

زۆر سادە وەڵامم دایەوە:

-نا.

-کەس باسی لیفتنانت محەمەد ڕەمەزانی بۆ نەکردوویت؟

-نا!

-پێشتر جێگری پارێزگاری عامودا بووم. ئەوە هیچت بیر ناخاتەوە؟

-نا، نەخێر. هۆیەکەشی سادەیە. چونکە ئەم ساڵانەی دواییم لەلوبنان بەسەر بردووە.

لەڕاستیدا هیچ کام لەکارە دڕندانەکانی ئەو جێگری پارێزگارەم بیرنەچوویوو، کە کورد ناویان نابوو(جەلادەکەی عامودا) و ناسرابوو بەدوژمنایەتی کورد و دژایەتیی کردنیان و بەڵێنی دابوو زۆرترین ژمارەی کورد قەڵاچۆ بکات.

ڕۆژێکیان و کاتێك لەیەکێك لەسینەماکانی عامودا فیلمێك لەبارەی جەزائیرەوە پیشان ئەدرا، لەناکاو ئاگرێك کەوتەوە و سەرتاپای هۆڵەکەی گرتەوە. کاتێك تەماشاکەرە منالکارەکان هیچ دەرفەتێکیان نەما، شالآویان برد بەرەو دەرگەکان بۆ چوونە دەرەوە، بەڵام لەدەرەوە داخرابوون! بۆیە بەتۆقاویی کەوتنە راکردن بەهەموو لایەکدا بۆ خۆ قوتارکردن. بەوشێوەیە چوارسەد کەسیان برژابوون و مردبوون پێش ئەوەی فریایان بکەون، لەوکاتەدا جێگری پارێزگار لەئۆفیسەکەی دانیشتبوو و قلوەی ئەنۆشی.

سەرەڕای نارەزایی گشتیی، کەچی جێگری پارێزگار ماوەیەکی زۆر لەپۆستەکەیدا مایەوە و بەردەوام بوو لەتۆقاندنی خەڵك بەتایبەت منداڵان و نەوجەوانان. هەر ئەویش بوو بیست کەسی لێ دەستگیرکردن، کەتەمەنیان ۱۲ و ۱۵ ساڵان بوو،بەبیانووی ئەوەی دروشمیان بۆبارزانی داوە و هەڕەشەی دەستدرێژیی لێکردن گەر دان بەوەدا نەنێن کەمن چەکم لەبارزانی وەرگرتووە(بۆدەرکردنی عەرەب لەناوچە کوردنشینەکان)و لەکاتەدا ئامێری سێکسی خۆی پیشان ئەدان. لەژێر گوشاردا و بەزۆر، زۆربەی منداڵ و نەوجەوانەکان دەمیان دا. هەندێکیان فەلاقەکاریی و هەندێکیشیان توشی شۆکی دەروونی بوون و ناچاربوون چارسەری پزیشکیی وەرگرن. کاتێکیش کەسوکاری ئەو خوێندکارانە وێرایان نارەزایی دەربرن دژی ئەو شێوازە نوێیەی مامەڵەی دڕندانە، بە بەرچاوی خەڵکەوە دارکاریی کران و رەوانەی زیندانی (مەزە)یان کردن.

بۆ پێشگیریی لەخۆپیشاندانی خەڵك، جێگری پارێزگاریی عامودا، فرمانی دا بە تانك دەوری شارۆچکەکە بگرن. جارجار خۆی ئەچووە سەرپشتی تانکێك و بەناو شارۆچکەکەدا ئەسوڕایەوە و داوای لەجەماوەر ئەکرد ئەگەر ئازان بێنە دەرەوە.

دوای کودەتا سەربازییەکەی ۲۳ ی شوباتی ۱۹٦٦ پۆستەکەی بەرز کرایەوە و بوو بە لێکۆڵەری ئاسایش!

ئێستا ئەو نەگبەتییە لەبەردەمدا وەستابوو و سوکایەتی پێنەکردم:

-ئێی، تۆ من ناناسیت؟ دە بابزانیت من ئەو کەسەم کە بەتەنیا یەك تانك هەموو کوردی جەزیرەم کردە کونەوە، تەنیا یەك تانك، تێنەگەیت؟ یەك تانکم بەسە بۆ پلیشاندنەوە و قەڵاچۆکردنی کوردی سوریا. گوێت لێمە؟ لەناوبردنتان!

وەڵامم دایەوە:

-چەکی تەواوت لەبەردەستە بۆ ئەو کارە، بەڵام پێت وایە ئەو کارە مایەی شانازیی و پێوەنازینە بۆ وڵاتێك کە بەشێکی گرنگی هاووڵاتیانی خۆی لەناوبەرێت تەنیا لەبەر ئەوەی سەر بە نەتەوەیەکی ترن؟

بەتووڕەییەوە قیژاندی:

-ئەی بێگومان! کاتێك ئەو هاووڵاتیانە سەرپێچی بکەن لەوەی لە قاڵبی نەتەوەی عەرەبدا بتوێنەوە و بیانەوێت تایبەتمەندیی خۆیان بپارێزن، نەك هەر ئەوە، بانگەشەی نەتەوەیەکی جیاوازیش بکەن وەك ئەوەی ئێستا بارزانی لەعێراق ئەیکات، یائەوەی ئێوەی کورد لەسوریا بانگەشەی بۆئەکەن. جگە لەوەش ئێمە زانیاریی و بەڵگەمان لایە کە تۆ چوویت بۆلای بارزانی و ڕێنماییت وەرگرتووە تا باکووری سوریا بلکێنن بەو وڵاتە کوردییەوە کە بەنیازن دوای ماوەیەکی تر لەعێراق دایمەزرێنن.

پێم وت:

-ئەوەی تۆ باسی ئەکەیت خەیاڵپڵاوە. لەبەر هۆیەکی سادە، ئەویش ئەوەیە کەبارزانی هەرگیز بیری لەوە نەکردووەتەوە لەعێراق جیابێتەوە. سەبارەت بەخۆشم تا ئێستا شەرەفی بینینیم پێنەبڕاوە. ئەشتوانن لای کاربەدەستانی لوبنان لەوە بکۆڵنەوە و دڵنیابن، لەوکاتەوەی سوریام بەجێهێشتووە بەهیچ شێوەیەك لەلوبنان دەرنەچووم.

-ئەوە دوایی ئەیزانین. تا ئەو کاتەش ها ئەوانە بگرە و راپۆرتێکم بۆ بنوسە کەئەو ماوەیەی لەلوبنان بوویت چیت کردووە و ئەمەویت بۆ سبەینێ ئامادەت کردبێت.

دوای ئەوقسانە،چۆن هاتبوو ئاوا رۆشت و منیش دەستمکرد بەنووسینی راپۆرتەکە.

سەرەتا باسی برایەتیی مێژوویی نێوان کورد و عەرەبم کرد و پشتیوانیی کورد بۆ عەرەب لەچەندین ماوەی چارەنووسسازی مێژوودا،جا سەردەمی خاچ پەرستان یا سەردەمی داگیرکاریی فەرەنسا. ئاماژەمدا بەهاوسێیەتیی باشی نێوان کورد و عەرەب لەسوریا تا ئەوکاتەی دەسەڵات کەوتە دەست ئەو فەرماندە سەربازییانەی بەرگریان لەبیروباوەری بەعس ئەکرد. ئینجا رەخنەم گرت لەئایدۆلۆژیای بەعس و دژیەکییە مێژووییەکانی و سیاسەتی کوێرانەییم ریسواکرد و زۆر بەروونی باسی چالاکی سیاسیی خۆمم کرد لەلوبنان و هەڵوێستی خۆم سەبارەت بەرێزگرتنی مافە رەواکانی گەلی کورد لەپێناو چەسپاندنی برایەتی راستەقینەی نێوان کورد و عەرەب. لەکۆتایی راپۆرتەکەدا داوامکرد بێ هیچ مەرج و بەندێك ئازادم بکەن.

دوای دوو رۆژ هاتن و بەپەلە راپێچی ژوورێکیان کردم کەدیوارە ئەستوورەکانی لەخشت دروستکرابوون و بێ پەنجەرە بوو و رووناکییەکی کەمی تیابوو. لەوێ جێگرەکەی پێشووی پارێزگاری شاری عامودام بینی خۆی دابوو بەسەر مێزێکدا و دە یاساولی لەدەور بوو کەهەریەکەیان کوتەکێکی بەدەستەوەبوو.

لیفتنانتەکە پێی وتم:

-هێی تۆ، پێم بڵێ، نەك جموجوڵەکانی خۆتت نەشاردووەتەوە، بەڵکو چاونەترسانە رەخنەت لەپارتەکەمان گرتووە و درۆشت بۆ هەڵبەستووین؟

ئینجا روویکردە پیاوەکانی:

-ئادەی ئەم خوێڕییە بدەن بەزەویدا و دارکاریی بکەن تا دان ئەنێت بەوەدا کەبارزانی بینیوە و بەنوسین پەشیمان ئەبێتەوە لەوقسە رەقانەی سەبارەت بەپارتی بەعسمان کردوویەتی.

دووان لەیاساوڵەکان هورورژمیان بۆهێنام و دایانم بەزەویدا و سێیەمیان قاچی هەڵبڕیم و چوارەمیان کەوتە بەستنەوەی هەردوو قاچم، بەشێوەیەك هەستمکرد کەبڕاونەتەوە. ئینجا دووانی تریان کەوتنە کوتانی بنی پێم. لەزەبری سێیەمدا پێستی پێم داماڵرا و خوێبەرێکم بڕرا و خوێن فیچقەی کرد. کاتێك لیفتنانتەکە ئەوەی بینی، هاواری کردە پیاوەکانی:

-بوەستن، بوەستن، نابێت بیکەینە شەهید. خێرا تەلەفۆن بکەن بۆ بەڕێوەبەرێتیی تا پزیشکێك بنێرن.

لەچاوەڕوانی هاتنی پزیشکدا یەکێك لەجەلادەکان پارچەیەك جلەشڕەی هێنا و لەپێمییەوەی پێچا و دوای چەند خولەکێك هەمووی بەخوێن سووربوو. لەبەرئەوەی بەڕێوەبەرێتیی هیچ پزیشکێکی لەبەردەستدا نەبوو بۆیە سواری ئۆتۆمبیلێکی لاندرۆڤەریان کردم و بردیانم بۆبەشی نەشتەرگەریی نەخۆشخانەی سەربازیی مەزە.

کاتێك هاتمەوە هۆش خۆم، هەستم کرد لەجێگەیەکی خاوێن راکشاوم و پێکانم ئازارێکی زۆری هەیە و ئاویان بۆ بەستبووم. و پێش ئەوەی بمبەنەوە بۆ زیندانی شێخ حەسەن، پانزە رۆژ لەونەخۆشخانەیە مامەوە.

دوای ئەو رووداوە ئاسایش بەئاسانکاریی زیاترەوە رەفتاریان لەگەڵ ئەکردم، پەنجەرەی ژوورەکەیان بەکراوەیی هێشتەوە ولەوێوە ئەمتوانی پێشهاتەکانی راڕەوەکە ببینم و لەگەڵ بەندییەکانی تر بەتایبەت هاوسێ نزیکەکانم قسە بکەم.

ئەو ماوەیە ژوورەکان چۆڵ نەئەبوون، چونکە تاقمی نوێی حکومەتەکەی بەعس هەر بەردەوام بوو لەدواکەوتنی لایەنگرانی(سەرکردایەتی نەتەوەیی) دۆڕاو. ئەوانیش دوای سەردانی ئاسایش خێرا ملکەچ ئەبوون و دڵسۆزیی خۆیان بۆ رژێمی نوێ رائەگەیاند و

ئەکەوتنە ئیدانەکردنی ڕژێمی پێشوو و سەرکردەکانی. کاربەدەستانیش بەگشتیی دوای چەند ڕۆژێکی کەم ئازادیان ئەکردن. بەڵام ئەو ژمارە کەمەی کەلەرەقییان ئەکرد، دابەشیان ئەکردن بەسەر زیندان و بەندیخانەکانی دیمەشق و شارەکانی تردا. ئەوانەشی ئەهێنرانە شێخ حەسەن زیاتر کەسانی سەندیکایی و زانکۆیی بوون کەبڕیاریان دابوو سەرسەختانە دژایەتی کاربەدەستانی نوێی سوریا بکەن.

ئەمانەیان ئەخستە ژووری هاوشێوەی ژوورەکەی منەوە و پەنجەرەکانیان لەیەکەم ڕۆژەوە کراوەبوو، و ماوەی بیست ڕۆژ دایانئەبڕین. هەروەك دڕندانەتر لەگەڵ سەندیکاییەکانی ئۆپۆزسیۆن رەفتاریان ئەکرد و هەندێك جار نیوەشەو بێداریان ئەکردنەوە و ڕاپێچیان ئەکردن بۆ بەندیخانەی تەدمور ی ناوەڕاستی بیابان. لەوانەی هاوسێی زیندانم بوون مامۆستای ئامادەیی و ئەندازیار و سەرکردەی سەندیکایی و هەروەها سکرتێری گشتیی بەڕێوەبەرێتیی گشتیی پەروەردەشیان تیابوو.

هاوارم لێئەکردن:

-ئاوەها ئەی فاشییانی بەرەڵا، ئاوا ئێستا قایلن بەوەی کردتان؟

بەسەرسامییەوە ئەیانپرسی:

-کام فاشی و مەبەستت کام شتە؟

-مەبەستم ئێوەیە، ئێوەی بەعسی. ئەی هیوادارنەبوون و کارتان بۆئەوە نەئەکرد سوپا دەسەڵات بگرێتە دەست و شۆڤینی سۆسیالیست بەسەر میللەتدا بسەپێنن!

سەرەتا قسەکانم تووڕەو بێزاری ئەکردن،بەڵام وردەوردە وایان لێهات لانیکەم بەزارەکی پشتیوانییان ئەکردم، هەرچەندە هەر ئومێدواربوون ڕۆژێك دیسان بەکودەتایەکی سەربازیی دەسەڵات بگرنەوە دەست.

ئەو دەمانە هەموو هیوایەکیان بەپاڵەوانی ڕزگارکەریان، سەلیم حاتوم دروزی، فەرماندەی کۆماندۆس بوو کەپشتیوانی ئەفسەرە عەلەویەکانی کرد و ڕۆڵی گرنگی هەبوو

لەخۆ بەدەستموەدانی ژەنەراڵ ئەمین حافزی سەرۆك کۆماری سوریا و رابەری راستەقینەی(سەرکردایەتی نەتەوەیی) پارتی بەعس.

دۆخی بەندێتی زیندانی شێخ حەسەن زۆر سەخت بوو، کە سەرەدان و چوونەدەرەوەیان بۆ پشوو لێ قەدەغە کردبووین. بۆئەوەی توانای جەستەیم بپارێزم لەپاسەوانەکە ئەپاڕامەوە رێم بدات ڕاڕەوەکە گسک بدەم و خاوێن بکەمەوە.

سەرەنجام رۆژێکیان فەوزی پاسەوان بەداواکەم قایل بوو و دەرگەکەی بۆکردمەوە و گسکێك و سۆندەیەکی ئاوی دایەدەستم. کاتێکیش بەندییەکان بینیان بەئازادی هاتوچۆنەکەم و ئەرکەکەم بەشادی و خۆشییەوە جێبەجێ ئەکەم، ئەوانیش داوایان کرد(ئەوئیمتیازە)یان بدرێتێ، بەڵام فەوزی لەترسی ئەوەی بەرێوەبەرێتیی ناقایل بێت، داوای لێکردم بچمەوە ژوورەکەم و ئیتر دەرگەکەی نەکردەوە تا یەکجاریی ئازاد بووم.

بەهۆی سەختیی رێنماییەکانەوە بەندییەکان بەگشتیی مانگێك زیاتر لە شێخ حەسەن نەئەمانەوە بەڵام من نزیکەی حەوت مانگی تیاماامەوە. تارۆژێکیان لەناوەڕاستی ئەیلولدا زەنگی تەلەفۆنی ڕاڕەوەکە لێیدا و فەوزی کە هێندە نەبوو نۆرە پاسەوانیی وەرگرتبوو، تەلەفۆنەکەی هەڵگرت و سەیرم کرد بەوردیی گوێی گرتووە و ئاماژە بۆ من ئەکات و ئینجا بەرووییەکی خۆش و پێکەنینەوە بەرەو لای من هات و وتی:

-هەواڵێکی خۆش. دەرئەچیت خۆت ئامادەبکە.

-ئەی چیم لێئەکەن؟ پێیان نەوتیت؟

-وەك تێگەیشتم ئەتبەن بۆ(سوەیدا) لەچیای دروز و نیشتەجێی زۆرەملێ ئەبیت. راستە ئازادی تەواوت نابێت بەڵام دۆخەکەت زۆر لێرە باشتر ئەبێت.

چەند ساتێك دواتر  دوو پاسەوانی سڤیل ئەملاولایان گرتم و خستمیانە ئۆتۆمبیلێکی کۆنەوە. کاتێك گەیشتینە ناوەندی دروز شەو داهاتبوو و رەشاییەکی زیاتری دابووە بەردە

ڕەشە گرانیتەکانی خانووەکان. لەبنکەی ئاسایش ئەفسەری بەرپرس تەوقەی لەگەڵ کردم و بەڵگەکانی ئیمزا کرد و فرمانی دامێ هەموو بەیانییەك لەبنکەکە سەردانی بکەم.

ئازادبووم لەوەی کوێم لەشارەکە پێخۆشە لێی نیشتەجێ ببم بۆیە (هاوڕێکانم)بردیانم بۆ گونجاوترین ئوتێل و دوای ئەوەی لای بەڕێوەبەرەکەی قسەیان بۆکردم، ڕێی گەڕانەوەیان بۆ پایتەخت گرتەوەبەر.

لەقاتی دووەمی ئوتێلێك نیشتەجێ بووم کە لەبەردی ڕەش دروستکرابوو و لەگۆڕەپانێکی گەورەدا بوو بەرامبەر بە سەرای میری. خراپی و پۆخڵیی سیمای دەرەوەی و کەلوپەل و جێخەوەکانی مایەی بێزکردن بوون و زۆرم لەخۆم کرد تا لەیەکەم شەوی ئازادیمدا چاوێك لێکنێم. خۆشبەختانە ڕۆژی دوایی کارەکەری ئوتێلەکە هەموو ڕۆژەکەی بەخاوێن کردن و ئوتووکردنەوە بەسەربرد و بۆ ئێوارەکەی جێخەوێکی خۆش و خاوێنم دەستکەوت.

کە ئەو سەردەمە حوکم ئەدرایت بەوەی ژیان لە سویداء بەسەربەریت هەستت ئەکرد کەهێشتا لەژێر ئەشکەنجەدایت. جاران فەرەنسییەکان نەتەوەپەرستانی عەرەبیان بۆئەوێ دوورئەخستەوە و ئێستاش کوردە ئاژاوەچییەکان! بۆئەوێ دوورئەخەنەوە. پێش منیش نزیکەی دە کەس لەکوردانی حوکم دراوی سیاسی لێرە بەزۆر نیشتەجێ کرابوون، جا یا لە هەمان ئوتێل یا لەزیندانی سویداء.

پاش دووهەفتە نزیکەی پانزە مامۆستای کوردی جەزیرە خۆیان کرد بە ئوتێلەکەدا کە کاتێك بەخۆیان زانیبوو لەشەو و ڕۆژێکدا لەپارێزگای سویداء دامەزراون.

ناوچەکە لەڕووی مێژوویەوە بەچیای دروز ناسرابوو بەڵام لە سی ساڵی ڕابردوودا گۆڕابوو و ناویان نابوو چیای عەرەب(جبل العرب).

لێمپرسین:

-هیچ مامۆستای کورد لەجەزیرە ماون؟

بەدڵێکی پڕەوە وەڵامیان دامەوە:

-وەك ئێمە بزانین، هیچ کارمەندێکی کورد لەجەزیرە نەماوە. یا دەریانکردوون یا وەکو ئێمە گواستویاننەتەوە بۆ شوێنی تر.

لای خۆیانەوە دروزەکانیش بێزاربوون لەمامەڵەی دیمەشق لەگەڵ ناوچەکەیان و سەیرکردنی وەك شوێنێك بۆ پەراوێزکردن و دوورخستنەوە:

-هەر هێنانی هاوولاتییان لەشوێنەکانی ترەوە بەنیازی سزادانیان، خۆی لەخۆیدا داننانە بەوەی پارێزگەکەمان شوێنێکی هەژارە و لەڕووی رۆشنبیری و مادی و فکرییەوە دواکەوتووە.

خاوەن هۆتێل و هاورێکانی ئەیانوت:

-ئێمە بێزار و تووڕەین چونکە حکومەت مێش میوانی نییە وهیچ ناکات بۆ باشکردنی دۆخەکەمان.

-بەڵێ، بەلام ڕووناکبیران و ئەفسەرانتان هەر زوو پشتیوانیی و پاڵپشتیی بەعسیان کرد، لەگەڵ ئەوەی ئێوە بەرەچەڵەك عەرەب نین، کەچی ئەوە دوورزییەکان بوون لەدواکودەتادا بەبەشداریی لەگەڵ سەلیم حاتوم گورزێکی کوشندەیاندا لەرژێمی پێشوو.

-ئەوە راستە کەئێمە عەرەب نین و هەندێك لەمێژوونوسان پێیان وایە ئێمە کوردین و هەرچەندە بە(ئامۆزاکانمان)ئەڵێین کورد، بەلام راستییەکانی ئەمڕۆ پیشانی ئەدەن ئێمە بەتەواویی بەعەرەب بووین و تەنیا بەزمانی عەرەبی قسەئەکەین و کەلتووریی عەرەبی بووەتە کەلتووریی سەرەکیمان. موسڵمانەکان وەك ئاینزایەکی ئیسلام تەماشامان ئەکەن، کەچی لەلایەنی بڕواوە، هەست بەیەکێتیی ناکەین لەگەڵ موسڵمانەکان. ئێمە باوەڕمان بەدۆنادۆنی گیان هەیە و پێمان وایە کەدوای مردن گیان ئەچێتە جستەی منداڵێکی دوورزییەوە کە لەوساتەدا لەدایك ئەبێت. بڕواشمان وایە خودا جارجارە لەشێوەی مرۆڤێکدا دەرئەکەوێت. گەر ئەشمان بینن بێ خەم و گرژبوون قایلین لاهوتی ئیسلامیی فێربین، لەبەر ناچاریانە. لەراستیدا ئایینی دوورزی باوەڕ و سیستەمێکی تایبەت و بۆچوون و رێورەسمێکە

لەژێر کاریگەریی هیندۆسیی و ئەفلاتونی و موسایی و کریستیانیی، زیاتر لەوەی کاریگەریی ئیسلامی لەسەربێت.

وێڕای ئەوەش بیری نەتەوەیی عەرەب توانیویەتی ئەفسونێکی گەورەمان لێبکات، زیاتر لەڕووناکبیرەکانمان، جگە لەوەش بیری بەعسی نەتەوەیی سۆفیانە هەستمان کێش ئەکات،بەتایبەت بەڵێنەکانی لەدادپەروەریی کۆمەڵایەتیی و ئەو سودە داراییەی لەوانەیە رۆژێك بۆ ناوچەکەمانی بهێنێت. کاتێکیش سەلیم حاتوم پەلاماری کۆشکی ئەمین حافزی سەرۆکی پێشووی سوریای دا، خۆراکی لەو خەونانە وەرئەگرت.

هەندێکی تریان وتیان:

-باوەڕ بکە سەلیم حاتو نەخەوتووە و بەم زوانە ناوی دێتەوە ناو ناوان.

دوای چەند رۆژێك واتەواتی جیاجیا بلاۆبووەوە سەبارەت بە جموجوڵ و رەفتاری ئەو پیاوەی تاقمەکەی سەلاح جەدید-ئەتاسی دەریانکرد و ئیزگەکانی ئوردون و ئیسرائیل ئاماژەیان دا بەجموجوڵەکانی حاتوم و بوونی لە حۆران.

بەوشێوە و دوای ماوەیەکی کورت سوەیدا بووە سەنتەری پێشهاتەکان.

دوو رۆژ دوای دەمەتەقێکەم لەگەڵ دوورزییەکان جموجوڵێکی سەرنج راکێش دەستی پێکرد. سەربازەکان چەکی دژەفڕۆکەیان لەگۆڕەپانە گەورەکەی شاردا دابەست و وردە وردە دووکانەکان داخران و شەقامەکان لەخەڵکی سیڤیل چۆڵ بوون وئەو سیخوڕانەش گۆڕیان گومبوو کەلەهەناسەدانیشدا چاودێرییان ئەکردم. تەنانەت خاوەن هۆتێلەکەش خۆی ون کرد و تەلارەکە تەنیا من و بازرگانێکی پیری تیا مابوو، کەلەدیمەشقەوە هاتبوو بەنیازی فرۆشتنی پێلاۆ بە کۆفرۆشەکانی سوەیدا.

کاتێکیش لێم پرسی تاچەند ئاگاداری چالاکییەکانی حاتومە، نەیوێرا تەنانەت سەر بەرزبکاتەوە و تەماشام بکات، بەڵکو کەسەیری دژەفڕۆکەکانی ئەکرد وەك گەڵای دار ئەلەرزی و بەپەلە چووە ژوورەکەی و دەرگەی لەخۆی داخست و کەوتە نوێژ و پاڕانەوە:

-خوایە گیان لێت ئەپاڕێمەوە بێوەی بگەڕێمەوە ناو کەسوکارەکەم!

هەوڵمدا بە گوێگرتن لەرادیۆکان زانیاریی زیاترم دەستکەوێت، بەڵام هیچ باسێك لە پێشهاتەکانی سوەیدا نەبوو. بەرەبەیان و کتوپڕ خاوەن هۆتێلەکە هات. پاش دوودڵییەکی درێژخایەن، چرپاندی بەگوێمدا:

-سەلیم حاتوم لێرەیە. گشت سەربازگەکەی ئێرە لەدەوری کۆبوونەتەوە، سەڵاح جەدید و نورەدین ئەتاسیی، کە لەدوێنێوە هاتوون بۆ دانوستاندن لەگەڵ لقی بەعس لە(جەبەل ئەلدروز)،بە بارمتە گرتوونی و ئێستا لە وتووێژدایە لەگەڵ دیمەشق. خۆ ئەگەر مەرجەکانی ڕەت بکرێتەوە، سوێندی خواردووە،بەرەو پایتەخت بکشێت.

بەبێ ئەوەی شاگەشکەییەکەی بشارێتەوە درێژەی دایە:

-زۆر لەتیپە سەربازییەکان بەڵێنی پشتیوانیان داوەتێ.

مەزەندەمان ئەکرد سەرکەوتنی دورزییەکان بەسەر عەلەوییەکاندا لەئانوساتدا ڕابگەینرێت، کەچی بەیانی تێپەڕی و تا درەنگانێکی پاشنیوەڕۆش، ئەو سەربازانەی سەر دژەفڕۆکەکانی بەردەم هۆتێلەکە لەجێی خۆیان نەبزووتن. دەوری سەعات چوار، چوار فڕۆکەی (میگ-٢١)کە لەدیمەشقەوە هاتن، زۆر بەنزمیی بەسەر شاردا فڕین، بەڵام سەیر ئەوەبوو،چەکە دژە فڕۆکەکان ورتەیان لێ نەهات و دوای نیوسەعات لەو ئاگادارکردنەی لەپایتەختەوە دەرچوو، سەربازەکان خۆیان کۆکردەوە و گەڕانەوە سەربازگەکانیان. ئێوارەش ڕادیۆی عەمان بڵاویکردەوە کە سەلیم حاتوم و چەند سەد کەس لەپیاوەکانی پەنایان بردووەتە ئوردون. ڕادیۆی دیمەشقیش کەوتە هاتوهاواری سەرکەوتن(بەسەر ئەوتاقمەی خۆیان فرۆشتووە بە ئیمپریالیزم و بەکرێگیراوانی).

دوو ڕۆژ دواتر، عەلەوییەکان کەوتنە پاکسازیی تەواوی سوپا و فەرمانگەکان و ئەو ئەفسەرانەی پشتیوانیی سەلیم حاتومیان کردبوو، یا هاوسۆزییان پیشاندابوو، دەستگیرکران. ئەو ئاسایشانەی ڕۆژانە چاودێریی منیان ئەکرد بەتەواویی ون بوون و

تەنانەت ئەفسەری بەرپرسی ئەوینکەیەی ئەبوو هەموو بەیانییەك سەردانی بکەم، ئەویش دیارنەما و تەنیا پۆلیسێك لەوێ مابوو، ئەویش هەر هێندەی وت:

-سوپاس بۆ هاتنت. وا من بینیمیت، کەواتە بگەڕێوە هۆتێلەکەت.

کەچی پێشتر ئەبوو خۆم بچمە بەردەمی ئەفسەرەکە.

لەدیمەشق،دوای ئەوەی(حافزلئەسەد)ی وەزیری بەرگریی و فەرماندەی گشتیی هێزی ئاسمانیی رۆڵی سەرەکیی بینی لەپوچەڵکردنەوەی پیلانەکەی سەلیم حاتومدا، ئەستێرەی درەوشایەوە و کاریگەریی زیادی کرد و کەوتە پتەوکردنی پێگە و دەسەڵاتی خۆی لەناو کاربەدەستاندا.

لەماوەی دوورخرانەوەم بۆ جەبەل ئەلدروز، زستانەکەی بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو سەخت بوو، و چەندین جار بەفرباری، شەوێکیان بارستاییەکەی گەیشتە نیومەتر و رۆژی دواتریش هەر ئەباری بەڵام کردی بەگەردەلول، لەبەرئەوەی فەرمانگەی رێگە و پردەکانیش ئامرازیی پێویستی نەبوو بۆ ماڵینی بەفرەکە، خەڵك بەناچاریی لەماڵەکانیاندا گیریان خوارد.

وێڕای ئەودۆخسەختە،کەچی هەواڵگریی بەتەلەفۆن داوایانکرد لەبنکەکەیان(نوزهە) ئامادەبم، بۆئەمەش یەك سەعاتم پێچوو.

لەرێی هەواڵگرییەوە چەندین نامەم نارد بۆوەزارەتی ناوخۆ و تکامکرد کۆتایی بە دوورخستنەوەم بێنن و پاسپۆرتێکم بدەنێ. بەڵام هەوڵەکانم بابردی و ناچاربووم بەدەم نامەی تر نوسینەوە، بەرگەی هەموو زستانی سوەیدا بگرم.

موعجیزەئاسا،دوانامە، کەلەرێی فەرمانداری سوەیداوە ناردم، لەهەموو نامەکانی پێشوو کاریگەرتر بوو و لەکۆتایی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٦٧ دا گواستیانەوە بۆ دیمەشق،بەنیشتەجێیی زۆرەملێ، بەمەرجی دەستنیشانکردنی نیشتەجێکەم بۆ ئاسایش.

ئەو شتە لەومرزێکی نەباردا روویدا و خێرا ژوورێکم دۆزییەوە، لەئوتێلێکدا کە فەلەستینییەکان سەرپەرشتییان ئەکرد و زۆر خۆشحاڵ بوون بە میوانداریی کردنم. کەچی هێشتا هەفتەیەك لەگەیشتنم تێنەپەڕی بوو، بینیم هەڵوێستیان بەرامبەرم گۆڕا و رەفتاریان بەرامبەرم دژ، یا هەر دوژمنانە بوو.

بەهۆی منەوە پۆلیس بەتوندیی چاودێریی هۆتێلەکەی ئەکرد، خاوەنەکەشیان ناچار کردبوو، ناوی هەموو میوانەکانیان بداتێ، هۆتێل چییەکەش بەهیچ جۆرێك ئەم چاودێرییەی پێ خۆش نەبوو.

سەرەنجام دۆستان ئاپارتمانێکی بچووکیان بۆ دۆزیمەوە لەدەوروبەری گەڕەکی کوردان، لەدامێنی لای خوارەوەی، بەدووریی چەند سەد مەترێك لەبێستانە بەناوبانگەکانی دیمەشق، کە لقەکانی رووباری(بەردی) ئاودێرییان ئەکرد.

کاتێك لەرۆژانی درێژ و خۆرەتاوی هاویندا تەماشای ئەو ئاسۆ فراوانەی سەوزاییم ئەکرد، هەستم بە گەرمیی و حەوانەوە ئەکرد. بێجگە لەوئەفسون و جوانییەش، هۆ و پاڵنەری ترم هەبوو، کەبەرەو دیمەشق کێشیان ئەکردم، لەنێویاندا ویستی درێژەدانی خەبات دژی فاشیزمی عەرەبیی، کەهەرەشە بوو لەسەر ژیان، بگرە بوونی گەلی کورد لەسوریا.

بەلاّم چۆن ئەتوانم درێژەپێدەری خەباتێکی ئاوا بم، لەولاّتێکی بێبەش لەئازادیدا؟ ولاّتێك کە رۆژبەڕۆژ زیاتر ئەکەوتە چنگاڵی سوپایەکی بەهێزەوە، کەبەردەوام هەڵگری ئالاّی نەتەوەی عەرەبی سەرلێشێواو بوو.

بەناچاریی تەنیا دوو رێگەم لەبەر بوو، گوزەران لەسایەی چاودێریی و پاسەوانیی بەردەوامی پۆلیسدا، یا دارزان لە زیندانەکانی ئاسایشدا.

بێهودەیی ئەو ژیانە و نەبوونی ئاسۆ و رزگارکەرێك، ناچاریان کردم رۆژ بەرۆژ عەوداڵی رێگەیەك بم بۆ بەجێهێشتنی سوریا. هەرچەندە پاسپۆرتیشم نەبوو. بەلاّم روو لەکوێ بکەم؟

لوبنانی(دیمۆکراسیی)؟ ئوردون؟یاپەڕینەوە بۆعێراق وخۆگەیاندنە ناوچە ئازادەکانی کوردستان؟

ئەمەیان مەحاڵ بوو،ئاخر دوای ئارامییەکی چەند مانگە، سەرلەنوێ شەڕ هەڵگیرسابوو و هەموو ڕێگەکان لە بندەستی سوپای عێراقدا بوون.

خۆ ولاتێکی تریش هاوسنووری سوریا بوو، تورکیا زێد و نیشتمانی مناڵیم.

ئایا بیرکردنەوە لەوەی بڕۆم و سەلامەت بگەمە ئەوێ، شتێکی شێتانە نەبوو؟!

ئامۆزایەکم کە بەتایبەت لەتورکیاوە هاتبوو بۆ دیتنم، وەڵامی دامەوە:

-نا بێگومان، ئاخر تورکیای ئەمڕۆ، تورکیاکەی دەساڵ لەمەوبەر نییە، لەساڵی ۱۹٦۳ وە حکومەت نەرمبووە و ئەمڕۆ هاوولاتیی نازدارە و هەموو ئازادییە دیمۆکراسییەکانی هەیە: ئازادیی بیروڕا،کۆبوونەوە و دیدار و هاتوچۆ و هتد. خۆ ئەگەر حەزی لەسەفەر بێت،ئەتوانێت لەماوەی ۲٤ سەعاتدا پاسپۆرت وەرگرێت. ئەگەر نیازی گەڕانەوەت هەیە بۆ تورکیا، من ئەتوانم هەموو بەڵگەنامە پێویستەکانت بۆ فەراهەم بکەم. بەدوای هەموو زانیارییەکانی پەیوەست بەتۆدا گەڕام، هێشتا ڕەگەزنامەی تورکیات لێ زەوت نەکراوە. تەنیا وێنەیەکی خۆتم بدەرێ، دوای مانگێك دێمەوە و ناسنامەیەکی قانونیت بۆ ئەهێنم. خۆشم بۆ پەڕینەوەی سنوور زامنت ئەبم و لەگەڵت ئەبم بۆ ئەو شوێنەی پێت خۆشە لە تورکیا.

-باشە، بەلام کە گەیشتمە تورکیا پێت وایە لێگەڕێن بە ئاسودەیی بژیم؟

-خێزانەکەت لەوێن و ئاگادارت ئەبن. لای خۆشمەوە بەڵێنت ئەدەمێ، کە پاسپۆرتێکی تورکیت وەرگرت، بوارت ئەبێت تورکیا جێبهێڵیت و بچیت بۆ هەرکوێ کە پێتخۆشە.

بەدەنگێکی بەرزی پڕ چێژ وشادمانەوە پێموت:

-دەی گەر وایە، کەواتە خێراکە پێش ئەوەی دیسان دووچاری زیندانێکی تری سوریا ببمەوە!

# توركیا

- هەلاّتن بۆ توركیا بەپێ و بەناو كێلگەكانی میندا

- كوردستانی توركیا دوای ٣٠ سالّ

- شادبوونەوە بە خێزانەكەم

- لە ئەستەنبولّ لەنێوان خۆشاردنەوە و ئاشكراییدا

- لێسەندنەوەی رەگەزنامەی توركیی

- هەلاّتن بۆ ئەوروپا

- پەنابەریی لە سویسرا و بوونە هاوولاّتیی هیلفیتیی

ساڵی١٩٦٧ پڕ ڕووداو بوو بۆخۆرهەڵاتی ناوەڕاست،گرژیی نێوان ئیسرائیل و وڵاتانی عەرەبی دراوسێی،گەیشتە لوتکە.

پاش ئەوەی ڕژێمی سوریا پشتیوانیی فەلەستنییەکانی کرد بۆ دامەزراندنی (ڕێکخراوی ئازادیی فەلەستین)، بەهەموو لایەکدا کەوتە هاتوهاواری تەفروتوناکردنی ئیسرائیل(بەجەنگی میللیی)، لەولاوە جەمال عەبدولناسر گەیشتبووە ئەوپەڕی هێزی خۆی و هەردەرفەتێکی ئەقۆستەوە تابەئاشکرا رایگەیێنێت(جولەکە فڕێنەداتە دەریاوە). لەبەرامبەر ئەوململانێیەدا ئیسرائیل هێزەکانی سەربازیی خۆی زیاتر پۆشتەوپەرداخ ئەکرد وهێرشە تۆڵەسێنەکانی بەردەوام بوو بەرامبەر کارە تێکدەرەکانی جەنگاوەرانی فەلەستین لەئیسرائیل،ئەوفڕۆکانەی(ئەستێرەی داود)یان پێوەبووسەرکێشیان ئەکرد و دوای فڕۆکەکانی(میگ)ی سوریا ئەکەوتن تەنانەت لەئاسمانی دیمەشقیشدا، و بۆردومانی هەندێك ئامانجی ستراتیژییان کرد، لەدەوروبەری پایتەختی سوریا.

رادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکانی سوریاش کە گوێ بەفرمانی سوپا بوون، پەلاماری ئیمپریالیزم و جولەکە ئەڵقەلەگوێکانی ئەدا و لەبەرنامەکانیدا بانگی تۆڵەسەندنەوە و تەفروتوناکردنی ئەدا دژی( زەوتکەرانی خاکی عەرەب) و بانگەوازی جەنگیی میللیی بەمارشەوە بڵاوئەکردەوە.

لە ٥ حوزەیرانی ١٩٦٧ دا و کاتێك ئیسرائیل بە داخرانی تەنگەی(تیران) و کشانەوەی هێزەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان، هەستی بەهەڕەشە کرد، بڕیاری هێرشی دا. هێرشە ناکاوەکەی ئیسرائیل سوپای سوریای خافڵگیر کرد، بۆیە چەك و تەقەمەنی و پۆشاك و پێڵاویان جێهێشت و بەرەو دیمەشق قوچاندیان. دەسەڵاتدارانی سوریاش کە هاتنە ناوەوەی

هێزەکانی ئیسرائیل زەندەقی بردبوون، دوای ئەوەی گەنجینەی ولاّتیان گواستەوە بۆ (حەڵەب)، خۆیان لەشاری(حمس) توند کرد.

لە ٦ ی حوزەیراندا حکومەت بڕیاریدا چەك بەسەر خەڵکدا دابەش بکات، بۆ بەرگریی لەپایتەخت و هاوولاّتیان ڕژانە بنکەکانی دابەشکردن. بەلاّم دوای ئەوەی ژمارەیەکی کەم چەکیان بەسەر خۆبەخشاندا دابەشکرد، ترسیان لێنیشت کە میللەت لەوانەیە ئەو چەکانە دژی خۆیان بەکاربەرێت، بۆیە داوایان کردەوە.

دوای دوو ڕۆژ، بەتکای یەکێتی سۆڤێت لای ئەمێرکا، ئیسرائیل وازی هێنا لەپلانەکەی بۆ داگیرکردنی(حۆران) و(چیای دروز) و گرتنی دیمەشق.

ڕۆژی ١٥ ی حوزەیران حکومەتی سوریا گەڕایەوە دیمەشق و کەوتەخۆ بۆ قوتارکردنی ولاّت لەکارەساتەکە. ئاسایش سەرقاڵی گەلێك کێشەی گەورەتربوو، بۆیە ناچارنەبووم ڕۆژانە سەردانی بنکەکەیان بکەم. هەرئەم دەست شلکردنەش پەیوەندییەکانمی لەگەڵ کەسوکارم لەتورکیا ئاسان کرد. لە ٢ی ئابدا ئامۆزا تورکیانشینەکەم هاتەوە بۆ دیمەشق و ناسنامەیەکی قانونیی بۆ هێنابووم، کە لێبووردنیشمی تیابوو لەخزمەتی سەربازیی. پلانێکیشی دانابوو بۆ پەڕینەوەم بەنهێنیی بۆ تورکیا. شل و شێوایی دەسەلاّتدارانی سوریا و نوقم بوونیان لە بێ سەروبەریدا،باشترین دەرفەت بوو بۆئەوەی خێرا پلانەکە ئەنجام بدەین.

ڕۆژی ٤ ی ئاب، شۆفێرێکی تەکسیی ئەرمەنیی، ئامادەبوو تا قامیشلی مان بەرێت. دوانێوەڕۆ بەدزییەوە دیمەشقمان بەرەو حەڵەب جێهێشت و سەعات ٨ ی شەو گەیشتین. لەناکاو شۆفێرەکە کەوتە بڕوبیانوو، گوایە زۆر شەکەت و ماندووە، چەندی لێپاڕامەوە و کرێکەم بۆ زیادکرد، قایل نەبوو لەوەزیاتر لەگەڵمان بێت. شۆفێرێکی تری ئەرمەنیی ئامادەبوو لەبری هاوکارەکەی بمانگەێنێت. یەکسەر سواری ئۆتۆمبیلەکەی کردین و سەفەرە درێژە ٧٠٠ کیلۆمەترییەکەمان لەحەڵەبەوە بۆ قامیشلی شەوی ٧\٦، بێ گرفت تەواوکرد.

کاتێك لەدەرگەی ماڵی پارێزەرێکی هاورێممدا، تازە خۆر هەڵات بوو، باوەشێکی گەرمی پیاکردم و بردمییە حەوشەی فراوانی ماڵەکەی، بینیم وەك نەریتی باوی ناوچەکە،سەرجەم ئەندامانی خێزانەکەی لەسەر چرپایەکی تەختەی بەرز و فراوان و داپۆشراو بەپەردەکوللە، نوستوون.

هەر زوو پلانەکەمم بۆ باسکرد بە جێهێشتنی سوریا و چوون بۆ کوردستانی تورکیا. دەرکەوت ئامانجەکەم سەرسامی کرد، ئاخر ئەو، خۆشی خەڵکی کوردستانی تورکیا بوو و بنەماڵەکەی زیاتر لە ١٢ ساڵ دژی لەشکرەکانی ئەتاتورك جەنگیبوون.

چەند جارێك لێی پرسیم:

-بەڕاستیی بیرت لە قووڵیی ئەم کارە کردووەتەوە؟

-بەڵێ،سوریا هیچم بۆفەراهەم ناکات،جگە لەژیانێکی گیاخۆریی،یامردنێکی لەسەرخۆ لەزیندانەکاندا، لێرە ناتوانم هیچ سودێکم بۆگەلەکەم هەبێت.

-ئەی لەتورکیا؟ بەراست پێتوایە ئاسایش و ئازادیت مسۆگەرە و بەسەلامەتیی لێی دەرباز ئەبیت؟

-یەکێ لەئامۆزاکانم هیواداری کردووم و هانی ئەم کارەی داوم. خەمی سەرەکیی ئێستا، تێپەڕبوونە لەسنوور، ئایا کەسێکی جێ متمانە ئەناسیت، لەناو قاچاخچییانی کوردا؟

-لەوبارەیەوە بێخەمبە. عەلیکی ناسراو بە(میر عەلیکی)، ئەو کارەت بۆ ئەکات. ئاخر ئەو پیاوە ژەندرمەی گومرگی سوریا و تورکیاشی خستووەتە گیرفانییەوە و لەهەردوو بەری سنوور پیاوی خۆی هەیە. شارەزای هەموو ئەورێگە بێوەیانەیە کە بەناو کێڵگەی مینەکانی تورکدا ئەڕۆن بەدرێژایی سنوور. دڵنیام ئەو یارمەتیت ئەدات بۆ ئاودیو بوون و ئەتپارێزێت. ئەچم بۆ لای و باسەکەی لەگەڵ ئەکەمەوە.

هاوڕێکەم یەکسەر جلەکانی پۆشی و چووە دەرەوە.پاش سەعاتێك هاتەوە و گەنجێکی چوارشانەی لەگەڵ بوو.

-ئەزبەنی، من لەخزمەتام، تەنیا پێم بڵێ کەی و لەکام لای سنوورەوە ئەتەوێت بپەڕیتەوە؟

ئامۆزاکەم کە لەتورکیاوە هاتبوو، پلانێکی هەبوو.

پاش نیوەڕۆی ٨ ی ئاب، عەلیکی بردمی بۆ گوندی(کێردان)،کەگوندێکی کوردنشینی سوریایە، لەقەراغی گوندەکە ئۆتۆمبیلەکەی ڕاگرت لەژێرپردێکی هێڵی ئاسنی ئەستەنبوڵ- بەغدا، کە وەك هێڵی سنووری نێوان تورکیا و سوریا وابوو. لەوێدا پیاوەکانی عەلیکی بەنهێنیی پەیدابوون و کەوتنە سەروکاری ٢ جانتاکەم،کەسیخناخ بوون لەپۆشاك و کتێب و هەندێك بەڵگەنامە و چەند دیارییەك بۆ کەسوکارە زۆر و زەوەندەکەم. لەو سەروبەندەشدا، عەلیکی خۆی گەیاندە لای تەلەدڕکاوییەکان، کە دەسەڵاتدارانی تورك بەدرێژایی سنوور دایانبوون،چونکە لەقەراغی ناوچەیەکی مینرێژ دا بووین. پاسەوانەکانی سنوور کەپێشتر هاوکارانی عەلیکی دەمیان چەورکردبوون، بە خۆشییەوە، بە زمانی تورکیی سلاوّیان لێکردین و تەلەدڕکاوییەکانیان بۆ هەڵبڕین تا تێپەڕین. دیاربوو عەلبەکی وای تێگەیاندبوون کە من بازرگانێکی زەنگینی تورکم و زۆرجاری تر لێرەوە ئەپەڕمەوە و پێویستم پێیان ئەبێت.

کاتێك لەکێڵگەمینەکان دەربازبووین، درەنگانێکی شەوبوو،بۆیە یەکێك لەشارەزاکان کەوتە پێشم وبەخێرایی بەرەو گوندەکە بردمی و گواستنەوەی جانتاکانی بە ٣ کەسی تر سپارد. ئامۆزاکەم کەپێشتر و بەرێگەی قانونیی بەنسێبیندا، لای کێرسوورەوە هاتبووە ئەمدیو سنوور، بەبینینم لەخۆشیدا هەڵبەزییەوە، بەلاّم نیگەرانی نەگەیشتنی جانتاکانم بوو.

-کاتمان بەدەستەوە نییە،ئاخر تەکسییەکم گرتووە تائەمشەو بمانگەیێنێتە دیاربەکر.

هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوو، دەنگی تەقوتۆقی رایچڵەکاندین،کەلەهەمان شوێنی پەڕینەوەمانەوە نەگەیشتە گوێمان.

لەبەرخۆمەوە وتم:

-کۆڵبەرکانمان.

ئامۆزەکەم بەدەم هێورکردنەوەمەوە، وتی:

-ئەوە پێکادانە، بڕواناکەم کۆڵبەرەکان چەکدارین و بەوجۆرە بکەونە شەڕەتەقە. بێگومان ئەوە پێکادانە لەنێوان قاچاغچی چەکدار و یەکەیەکی گەڕۆکی سوپادا.

وەڵامم دایەوە:

-ئەی کۆڵبەرەکان لەو نێوەدا چییان بەسەردێت؟! گەر جانتاکانم بەوهەموو وێنە و بەڵگەنامانەوە بکەونە دەست کاربەدەستانی تورك، هیچ دەرەتانێکم نامێنێ جگە لەگەڕانەوە بۆسوریا. راستییەکەی هەست ئەکەم باشتر وایە هەر ئێستا ئێرە بەجێبێڵین و خۆمان بگەیێنینە نوایەك لەو دێهاتانە.

-نەخێر، هەرگیز، بیرت نەچێت من بەرپرسی بێوەیی و ئاسایشی تۆم. دڵنیات ئەکەم کەس نایەت بۆ پشکنینی ئەم گوندە.

ئێمە لەم مشتومڕەدا بووین، کە گوێمان لەتەپەی قورسی چەند پێیەك بوو و دوای چەند ساتێك گوێمان لێبوو کۆڵبەرەکان جانتاکانیان دانا.

-ئێمە باشین و جانتاکانیشتان سەلامەتن. ئەوە شەڕەتەقەی نێوان دەستەیەکی ژەندرمە و چەند ئەفسەرێك بوو لەگەڵ کۆمەڵێك قاچاغچی، کە خەریکی ئاودیوکردنی ماڵاتێکی زۆر بوون بۆ سوریا، ئەوەی ئێمە بیستمان زۆربەی ماڵاتەکەیان پەراندبوووەوە قاچاغچییەکان کەوتنە تەقەکردن، تا رێگریی لەسەربازەکان بکەن بۆدەستبەسەراگرتنی جێماوی ماڵاتەکە.

تەقەکان، ژنانی گوندەکەی نیگەران کرد، چونکە برا و مێرد و باوك و ئامۆزاکانیان لەوکەسانە بوون کە ئەم کاسپییە ترسناکە ئەکەن.

یەکێکیان بەدەم گریانەوە نەیلاوانەوە:

-ئای برا نەگبەتەکانم! ئاخر چەندجار لێتان پاڕاینەوە کە لەگەڵ مەرگدا یاریی نەکەن؟!

یەکێ لەپیاوەکان وەڵامی دایەوە:

-ئەی چی بکەین خوشکم؟! ئەی لە کارگەکانی چنین و کیمیایی و پیشەسازیی و قوتووکاریی و چیمەنتۆ ئیش بکەین؟! ئاخر قەت ئەنکەرە ئەو کارگانە لێرە دروست ناکات. دەیان هەزار لەبراکانمان رۆشتوون و هەزاران کیلۆمەتر دوور لێرە بەدوای کاردا ئەگەڕێن، ئەویش بێبایەخ ترین و سەختترین کاری سەر زەوی. ئاخر چی بکەین خوشکە بچکۆلەکەم؟ ئەی قاچاغچێتیی باشتر نییە لەوەی لە هەژاریی و برسێتیدا بمرین؟!

ژنەکە بەدەم نزا و دەست بەرزکردنەوە بۆ ئاسمانی قیرئاسا، وەڵامی دایەوە:

-راستەکەی برای شیرینم. بەڵام ئاخر ئێمەش بێزار و ماندووبووین لەم دڵەڕاوکێیە. ئۆقرەمان لێبڕا،هەر ٢-٣رۆژ جارێك تەرمی ئاوساوی رۆڵەیەکمان لەناو کێڵگەمینەکاندا بدۆزینەوە. ئۆهـ! یارەبی خوایە، یارمەتیمان بەو وەرە بەهانامانەوە و لەم دۆخە رزگارمانکە. پەنامان بە تۆیە خوایە!

سەعاتێك دواتر، تاریکی باڵی کێشا و تەقوتۆقەکە وەستا، یەکێ لەو جوتیارانەی بەشداری ئاودیوکردنی ماڵاتەکەی کردبوو، بەهەناسەبڕکێ خۆی گەیاندەوە گوند و کەوتە هێورکردنەوەی گوندنشینەکان:

-کەس پێوە نەبووە و هەموو ماڵاتەکەشمان گەیاندە خوار هێڵی ئاسنەکە.

وشەی(سنوور) لای کوردانی ناوچەکە هیچ واتایەکی نەبوو، ئاخر بەلای ئەوانەوە تەنیا سەر و خواری ئەو هێڵە ئاسنە هەبوو، کە سوریای لە تورکیا جیا ئەکردەوە.

دێهاتییەکان کەلە گۆڕەپانی بچووکی گوندەکەدا کۆمەڵ بووبوون، هێور بوونەوە و سکاڵا و کڕوزانەوەی ژنەکانیش تەواوبوو، بەڵام دیاربوو شۆفێرەکەمان گرفتاری

نیگەرانییەکی توند بووبوو، هەزار بیانووی مەترسییەکانی هێنایەوە بۆئەوەی بەرەو دیاربەکر نەمانبات:

-ئامەوێت گوللەیەك بەر کەللەم کەوێت. دوای ئەم تەقوتۆقە، ئێستا فەرماندراوەتە سوپا، تەقە لەهەرشتێك بکەن کەئەمشەو لەم ناوچەیدا بجولێتەوە. باشترە ئەمشەو لێرە بمێنیتەوە و سبەینێ بەیانی زوو بەرێکەوین.

من و ئامۆزاکەم تەنیا ئومێدمان جێهێشتنی خێرای ئەو شوێنە بوو، بەلاَم شۆفێرەکە لەبڕیارەکەی پەشیمان نەبووەوە و دیاربوو دەنگی تەقەکان گۆتی کردبوو، بۆیە ئێمەش ناچاربووین مل بدەین بۆ داواکەی.

-باشە، بەلاَم لەکوێ بخەوین لەم گوندەدا کە نەهۆتێلێك نە میوانخانەیەکی تیانییە؟

دێهاتییەکانی دەوروبەرمان وەلاَمیاندایەوە:

-هەر شوێنێك و ماڵی هەرکام لەئێمەتان پێخۆشە. هەمیشە ئامادەین شوێن و جێ بۆ هەرمیوانێك دابین بکەین.

کەسێکیان لەئامۆزاکەم نزیك بووەوە و وتی:

-ماوەیەکی کەم لەمەوبەر ئاغاکەمان لەنەخۆشخانەی ماردین کۆچی دوایی کرد، ئەگینا ئەتانتوانی لەدیوەخانەکەی ئەودا بخەوێنەوە. کەواتە میوانی من بن و بۆخۆتان لەسەربان بنوون، کەلەم وەرزەدا بۆخەو خۆشە.

پێشوازیی میواندارییەکەی مان کرد و کەوتینە شوێنی بۆماڵەکەی. لەچاو تروکانێکدا ساوەر و ماست و دۆیان بۆهێناین. دوای ئەوە زۆر دانەنیشتین و ماندوویی و شەماڵێکی فێنك بردیانینە خەوێکی قووڵەوە.

بەیانی پێش هەتاوکەوتن بێداربووین و سواری ئۆتۆمبیلێکی شۆڤرلێتی کۆن بووین بەرەو دیاربەکر بەجادەیەکی پڕ چاڵ و بەرددا، بە ٢سەعات ٦٠ کیلۆمەتر ڕێمان بڕی تاماردین،کە کەوتووەتە سەرلوتکەی شاخێك و بە دەشتە پانوپۆڕەکانی میزۆپۆتامیای

باکووردا ئەڕوانێت. لەراستیدا ماردین شارێکی ئاسایی نییە، بەڵکو مێژووی قەڵاکەی هەزاران ساڵ لەمەوبەرە و بەردە سپییەکانی کەبەدەست هەڵکۆڵراون و کۆڵانە تەسك و پێچاوپێچەکانی، لەشوێنەکانی تری جیانەکاتەوە. خەڵکەکەشی بەزمانێکی عەرەبی ئەدوێن، بەڵام بەوشە و زاراوەی کوردی.

بۆ قاوە نۆشینێك لەوێ لاماندا، پێش ئەوەی بەرەو دیاربەکر بکەوینەرێ.

بەدرێژایی رێگە، بەژانەوە سەرنجی دۆخی کارەساتباری گوندە کوردنشینەکانم ئەدا، کە تۆپەڵێك خەرابەی قوڕین بوون، بێ کارەبا و تەلەفۆن و خوێندنگە و نەخۆشخانە، کەچی دیمەنی ژنانی کورد بە گۆزەی سەر سەر و مەڕدۆشینیان لەبەرتیشکی خۆردا، بەبەرگی باوباپیرانەوە، کراسی درێژ و کەوا و پشتوێن و دەرپێی فش و بریسکەدار و سەرپێچی رەنگاوڕەنگەوە، ئەیهێنامە دڵەکوتە.

بەسەری هەنێك پیاویشەوە جامانەی کوردیم بینی، ئەمانەش هەموو نیشانەی شکستی سیاسەتی تورکاندنی حکومەتی ئەنکەرەبوون. گەلی کورد وەك جاران لەسەر خاك و زێدی خۆی ئەژی و تەنیا هێندەی پێویستە کە بەرگرییە خۆرسك و پەرتەکەی لەچوارچێوەی رێکخستنێکی دیسپلینداردا کۆبکاتەوە، تا ویستی نەتەوەیی خۆی بسەپێنێت و لەم ون بوون و بێئومێدییە دەربازبێت.

خەونم بەو ئەرکە سەختەوە ئەبینی، کە دیوارە رەشە زەبەلاحەکانی دیاربەکرم دی و لەدەروازەی ماردینەوە چووینە قەڵاکەوە. جگە لەجادەیەکی پان بەدرێژایی دیوارەکان، ئەوا خانووە دێرینەکانی دروستکراو لەبەردی گرانیتیی رەش،سیمای کۆنی سەردەمی هەرەزووی خۆیان پاراستبوو. جادە و شەقامەکان جمەیان ئەهات و پڕبوون لەچالاکیی و جموجوڵ. ژمارەی دانیشتوانەکەشی لەساڵی ١٩٣٠ یەوە، چوارهێندە زیادی کردبوو و لە ٤٠ هەزارەوە بووبووە ٢٠٠ هەزارکەس.

هەرچەندە هیچ پیشەسازییەکی تیانەبوو،بەلاّم وەك ناوەندێکی کشتوکاڵ و بازرگانیی، بایەخێکی گەورەی هەبوو و ژمارەیەکی زۆری خەڵکی بۆ خۆی راکێشابوو لە جوتیار و شارنشین، کەلە شارو گوندەکانی دەوروبەرەوە روویان تێکردبوو.

خێزانە دەرەبەگ-بۆرژوازییەکەی ئامۆزاکەم لەدەشتی (ئەرگانی)، چاوەڕێمان بوون.

لەدەشتی کۆران ولەوکاتەدا کمشۆفێرەکەمان تایەی ئۆتۆمبیلەکەی ئەگۆڕی، منالێکی شوانکارەی تەمەن ١٠-١٢ ساڵ بەشەرمەوە لێمان نزیك بووەوە.

بەتورکی لێم پرسی:

-ئەم مەڕانە هی ئێوەیە؟

بەکوردی و بەدەنگێکی نێرەوە وەلاّمی دامەوە:

-تورکی نازانم.

بەسەرسوڕمانێکی دەستکردەوە و بەکوردی پێموت:

-چۆن، ئەی ناچیت بۆ قوتابخانە؟!

هێمنانە وەلاّمی دامەوە:

-نا.

-ئاخر بۆچی؟

-چونکە ناچارمان ئەکەن فێری تورکی بین و زمانەکەی خۆمان لەبیربکەین.

-ئەی وا باشتر نەبوو بچیتە قوتابخانەی تورکی، تە بەنەزانیی نەمێنیتەوە؟

بەهەراسانیی وەلاّمی دامەوە:

-بەلاّم نەزان نیم، بەرۆژ شوانی مەڕەکانی گوندم و ئێوارەش ئەچمە لای مەلا.

- ئەها، بەڵێ، بەلاّم بۆ چی؟

-بێگومان بۆ ئەوەی فێری زمانی کوردی بم.

-ئەی حکومەت رێئەدات، و هەقی نییە؟

-ئۆھ، وەك ئەزانی مەلاکەمان زۆر زیرەکە. بەفەرمیی ئەڵێت ئەو وانەی قورئان و فەلسەفەی ئیسلامیی ئەڵێتەوە.

-ئەی بەڕاست چیتان فێرئەکات؟

-بەتایبەت باسی شاعیرەکانمان بۆئەکات و چەندین دێڕمان پێ لەبەرئەکات.

-ئەتوانیت هەندێکیم بۆ بڵێیت؟

مناڵەکە دەستی کرد بە وتنی چەند دێڕێك شیعری کلاسیکی کۆنی کوردی.

-پێم بڵێ، ئەم ناوچەیە هیچ مەلای تری لێیە، وەك مەلاکەی ئێوە؟

- نازانم، چونکە هەرگیز گوندەکەی خۆمانم جێ نەهێشتووە، بەڵام ئەزانم مەلاکەمان شوێنکەوتەی هەیە، کەجارجارە دێنە سەردانی.

-ئەی ئەتەوێت هەر کوردبیت و بەنیازنیت ببیتە تورك؟

چاوە زەردە گەورە و درەوشاوەکانی بڕییە رووخسارم و وەڵامی دامەوە:

-نەخێر ئەزبەنی، ناتوانن بمانکەن بەتورك.

حەزم ئەکرد درێژە بەگفتوگۆکە بدەم لەگەڵ ئەو کوڕیژکەیە، بەڵام شۆفێرەکە بانگی کردین.

درەنگانێکی ئێوارە گەیشتینە ئەرگانی، ئەو شارۆچکەیەی دانیشتوانەکەی ٢٠ هەزار کەسێك ئەبن و بەبناری چیاکانی تۆرۆسدا درێژبووتەوە.

تەکسییەکە یەکسەرە بردینییە بەرماڵی ئامۆزاکەم، کەکەوتبووە ئەوبەری باکووری شارەکەوە و کۆشکەکەی ئەبیروانییە باخێکی لێژی گەورە، و لەرێی حەوزێکەوە ئاودێریی ئەکرا، کە کانییەکی بەقوڵپ پڕی ئەکرد، گۆشەیەکی دڵبەربوو، وەك ئەو شوێنەی مناڵیم لێ بەسەربردبوو.

دوای خۆرئاوا تەکسییەك بردمی بۆ (ئیلازیغ)، کە (ریزۆ) لەساڵی ١٩٥٠وە لێی ئەژی و ساڵانێکی درێژە ئەمدیووە. ناوی خۆی لەسەر لیستی پارتی دیمۆکرات تۆمارکردبوو و

دووجار بەنەندام پەرلەمان هەڵبژێردرابوو، بەڵام دوور لەهەرچالاکییەکی کوردانە ئەیگوزەراند. توانیبووشی تێڕوانینی دەسەڵاتدارانی تورك بگۆڕێت و ئاشتیانە لەگەڵیان هەڵبکات، کەپێشتر وەك گومانلاویی و کەسێکی بێ متمانە سەیریان ئەکرد. دژی هەر رەفتارێکی سەرکێش و توندڕەو بوو. منیش مەترسییەکی راستەقینە بووم کەچی خۆی و هاوڕێکانی بەفرمێسکی شادییەوە پێشوازییان کردم. هەفتەی یەکەمم لە ئیلازیغ بەخۆشیی و شادیی بەسەربرد و زۆرێك لە ئامۆزا و خاڵۆزاکانم سەردانیان کردم، کە پتر لە ۳۰ ساڵ بوو نەمدیبوون و گەنجەکانیشیان کەدوای کۆچی من لەدایك بووبوون. خۆشحاڵ بوون بەدیتن و دواندنم و بانگهێشتی خوانێکیان کردم لەدێهات، کەبەرخیان سەربڕیبوو و بەشیش ئەیانبرژاند. میوەی ئامدارشیان پێشکەش کردم، وەك ئەوەی لە سەردەمی مناڵیمدا خواردبووم. توانیشم بەئازادیی بە ئیلازیغدا بگەڕێم و بەراوردی بکەم بەو شارەی پێشتر بینیبووم.

وەلی مەخابن، ئیلازیغ لە ۲۰ ساڵی دواییدا، بێ سەروبەر و ناقۆڵا گەورە بووبوو. بەشێوەیەك فراوان بووبوو کەتاکە کارگەی چیمەنتۆی ناوچە کوردییەکەی تورکیا لەو دەمەدا، کە لەسایەی نوێنەرانی پارێزگەکەوە دروستکرابوو، لەناو شارەکەدا گەمارۆ درابوو.

ژمارەی دانیشتوانیشی کە تاساڵی ۱۹۲۰ بەحاڵ ئەگەیشتە ۲۰ هەزارێك، ئێستا گەیشتبووە زیاتر لە ۸۰ هەزار کەس، زۆربەشیان جوتیارانی دێهات و کۆمەڵگەکانی دەوروبەربوون. ئەم کۆچە گرفتی گەورەی کۆمەڵایەتیی دروستکردبوو، بە هەڵاوسانی ژمارەی دوکان و بازاڕ، ژمارەی بێکاران و تاوانکەران. هەروەك ناوەندی شاریش سیما ئەرم و هێمنەکەی لەدەستدابوو و باڵەخانەی زەبەلاحی کۆنکرێت جێی خانووە دێرینە خشتەقوڕەکانی گرتبووەوە،کەجاران بەحەوشەی سەوز دەورەدرابوون. شەقامەکانیشی کە گڵی کوتراوە بوون، یا ئەسفالتەکەی هەڵکەندرابوو، پۆخڵ و خۆڵاویی بوون. ئیلازیغ

وێنەیەکی دوور لەجوانیی و ئەفسونی پیشان ئەدا، بەشێوەیەك کە پێم خۆش نەبوو زیاتر لەهەر شارێکی تر تیایدا بەسەربەرم.

هەر لەمناڵیمەوە خەونی ئەوەم هەبوو لە(بیرماز) نیشتەجێ بم، کە ئەکەوتە دەشتێکی بەرز بەنزیکەی ۱۲۰۰ مەتر لەئاستی دەریاوە و بەچیای بریسەکەدار گەمارۆ درابوو بەلاّم کاکی بەکاکی بوو. گەلێك جار دەریاچەکەی ختووکەی ساڵانی لاوێتیمی ئەدا، و ئەو زەوییەی باوکم بۆ جێهێشتبووین،تەنیا چەند کیلۆمەترێك لێوەی دووربوو. زۆر تامەزرۆی دووبارە بینینەوەی بووم.

لەودەمەیدا چێژم لەهاتنی رۆژ نەبینی تاخەونەکەم بێنمەدی، هاورێکانی براکەم هاتن و چرپاندیان بەگوێیدا کە پۆلیس هەواڵی هاتنمی هەیە بۆ ئیلازیغ و زۆری پێناچێت میت-هەواڵگری تایبەت-یش هەواڵەکەی پێئەگات. بۆیە مۆچیاریی براکەمیان کرد تا لەناوچە کوردنشینەکان دوورمخاتەوە. هەرلەگەڵ ئەم ئاگادارکردنەدا براکەم جانتاکانی کۆکردەوە و سواری پاسێکی کردم بەرەو ئەستەنبوڵ، خۆشبەختانە لەرێ تووشی هیچ پشکنینێك نەبووین. ئاخر تورکیا بەیەکێك لەو سەردەمە دەگمەنانەی (دیمۆکراسیی) مێژووی خۆیدا تێئەپەری.

لەئەستەنبوڵ یەکێ لەئامۆزاکانمان، کەپێشتر کارمەند بوو، پەیوەندی باشی لەگەڵ بەرپرسانی حکومەت بنیات نابوو، بەتایبەت نێوانێکی پتەوی هەبوو لەگەڵ سەرۆکی دەزگەی میت. بۆیە خێرا کەوتە دابینکردنی رێوشوێنەکان.

بەتەلەفۆنێك بۆ دیاریەکر، بەرپرسی ئەستەنبوڵی میت زانیبووی دۆسیەیەکی زەبەلاحم هەیە،بەتایبەت لەسەر جموجوڵی سیاسیم لەبەیروت، پێش ئەوەی رادەستی سوریا بکرێم. هەروەك مۆچیاریی ئامۆزاکەمی کردبوو داوام لێبکات تا بگەرێمەوە بۆ تورکیا.

هەواڵەکە مایەی نیگەرانیی و هاوکات سەرسامیش بوو، چونکە دوای ئەوەی تازە هاتبوومەوە تورکیا، گەڕانەوەم بۆ سوریا سەخت بوو، کەواتە چی بکەین باشە؟ و چی ئەبێت ئەگەر میت بنکە سنووریەکان لەبارەمەوە ئاگاداربکات؟

ئاکامیش، هۆی گەڕانەوەم بۆ تورکیا ئەوەبوو بێنمەوە و لەناوچە کوردییەکە لەناو میللەتەکەی خۆمدا بژیم. بەلاّم سات بەسات ئەو پێشنیازە ئاڵۆزتر ئەبێت و بەرەو تێوەگلان و نادیار ئەڕوات.

براکەم وای بەچاك زانی خۆی دیداری کەسە دیارەکانی حکومەت بکات و کێشەکەیان بخاتە بەردەست. بۆیە بەرەو ئەنکەرە بەڕێکەوت و دیمیریل، کەنێوانێکی پتەوی هەبوو لەگەڵی بەگەرمیی پێشوازیی کرد، هەروەك وەزیری ناوخۆش پێشوازیی کرد.

-پرسیار لە(مادن)ئەکەین کە ئایا هێشتا براکەت رەگەزنامەی تورکیی ماوە. بۆی بنوسن تا بێ دواکەوتن بگەڕێتەوە زێدی خۆی و بەباوەشی کراوەوە پێشوازیی ئەکرێت. ئێستاش داوات لێ ئەکەم تکایەکمان بەنوسین بۆبنێریت و ئەوەی تیا روونکەیتەوە کە براکەت کاتێ تورکیای جێهێشتووە زۆر مناڵ بووە و ئێستاش ئارەزووی لەوەیە بگەڕێتەوە. ئەوپەڕی دوای مانگێك وەلاّمت ئەدەمەوە.

لەسەر بەڵێنی بەرپرسانی گەورەی حکومەت یەکسەر براکەم داواکەی بەرزکردەوە و رۆژی دواتر بەدڵێکی پڕ هیواوە گەڕایەوە ئەستەنبوڵ. بەوپێیەی گوایە من هێشتا لەسوریام، بڕیاردرا نیوەئاشکرا لەئەستەنبوڵ بەسەربەرم، لەچاوەڕوانیی وەلاّمی وەزیردا کەباوەڕمان وابوو، بێگومان ئەرێنی ئەبێت چونکە ناوم لەدۆسییەی سڤیلدا نەسڕابووەوە.

براکەم متمانەی بە راستگۆیی وەزیرەکان هەبوو، بۆیە ئاپارتمانێکی بۆگرتم لەیەکێ لەشەقامەکانی(بیۆغلۆ)و خۆی گەڕایەوە ئیلازیغ. کەچی مانەوەم لە ئەستەنبوڵ درێژەی کێشا وهیچ وەلاّمێکی ئاغای وەزیرم پێنەگەیشت. لەمانگی هەشتەمدا پۆلیسی ئیلازیغ سەردانی براکەمیان کردبوو.

-ئەزانین براکەت رەگەزنامەی تورکیی هەیە و ماوەیەکیشە لەتورکیایە. کەئەمەش مافی خۆیەتی و ریّ بەخۆمان نادەین دەست بەرینە ریّی، بەلاّم حەزنەکەین خۆی سەردانمان بکات و وەلاّمی چەند پرسیارێکمان بداتەوە.

براکەم قسەکانی ئەو دیدارەی پێوتم و بەپارێزەوە پێشنیازی کرد بچم بۆ ئیلازیغ، بەلاّم چونکە ترسی داوێکی حکومەتم هەبوو، رەتمکردەوە بەپێی خۆم برۆمە کونە گورگەوە، و لەئەستەنبوڵ مامەوە، بەلاّم بەپارێزێکی زیاتر لەجاران و بەدەگمەن ئەچوومە دەرەوە ئەویش دوای خۆرئاوابوون.

هێشتا دووهەفتەی تەواو تێپەرنەبووبوو کە براکەم کەسێکی تری ناردەلام و ئاگاداری کردم کەپۆلیس سوورە لەسەر بینینم و تەقەلایەکی فرەی ناوێت تا هەرکات ویستی بمدۆزێتەوە. لەبەرامبەر ئەم ئاگاییەدا چارەیەکم نەما جگە لەگرتنەبەری ریّی ئیلازیغ.

ئەوکۆمیسەرەی پۆلیس کەرۆژی دوای گەیشتنم سەردانم کرد هاورێ لەگەڵ یەکیّ لەدۆستانی خێزانەکەم،پرسیاری زۆرساکار وساویلکانەی لێکردم.وەك لەشێوازەکەشی تێگەیشتم، گرنگترینیان پەیوەست بوو بە رەگەزنامەی سوریا و ئایا وەرمگرتووە یا نا؟ ئەشزانی بەپێی قانونی تورکیا، وەرگرتنی رەگەزنامەی ولاّتێکی تر بیّ مۆڵەتی حکومەتی ئەنکەرە، لەوانەیە ببێتە مایەی لەدەستدانی رەگەزنامەی تورکیا. ئەشبێت داوای رەگەزنامە بەحەز و داوای خۆویستانەی کەسێکی پێگەیشتوو بێت، نەك بەسەر منالێکدا سەپێنرابێت، وەك ئەوەی لەمن روویدا.

سەرنجی کۆمیسەرەکەم بۆ ئەم خاڵە راکێشا و تکام لێکرد روون ئاماژەی پێبدات. ئەوەی کرد و ئامۆژگاریی کردم خاترجەم بم، چونکە کارەکان بەویستی خۆم رێکئەخرێن.

لەماڵەوە، براکەم و خێزانەکەی و خوشکەکانم و ئامۆزاکانم، بەنیگەرانییەوە چاوەرێی هەواڵی دیدارەکەم بوون لەگەڵ کۆمیسەر و کاتێك زانییان چی روویداوە و وتە دڵنیاکەرەکانی کۆمیسەرم پێوتن، کەوتنە سەمای شادی و لەئامێزگرتنم:

-خەمەکان تەواو بوون! ئیتر ڕێت نەدەن بیٚوەی لەناوماندا بژیت، ئێمە دڵنیا و بێگومانین لەوە.

کەچی شادییەکەیان درێژخایەن نەبوو، چونکە ڕۆژی دواتر سەرۆکی دەزگەی میتی ئیلازیغ داوای کردم و لەکاتی پێشوازیدا لەلایەن دوو کەسیانەوە،بۆم دەرکەوت هەراسانن، بەتایبەت بەڕێوەبەری پۆلیس، بەڵام بەرپرسی هەواڵگریی تایبەت، چاویلکەیەکی هەتاویی تۆخ و سەیری لەچاودا بوو، ئەگەرچی ژوورەکە بەحاڵ ڕووناکی تیابوو.

ماوەی سێ چارەکە سەعات ڕووبەڕووی مامەوە و بەپرسیار گەمارۆی دابووم. تەنانەت پرسیاری مانەوەم لەسویسرای کرد و جموجووڵەکانم لەئەورووپا بۆپشتیوانیی کورد. تێگەیشتم کەهەموو وردەکارییەکان لەدۆسییەکەمدایە و سەرۆکی دەزگەکەش هەمووی بەوردیی و تێبینییەوە خوێندووەتەوە.

ئەگەری گیرکردنم بۆ ئەو ماوە زۆرە لەلایەن سەرۆکی میتەوە، هەموویانی ترساندبوو بەتایبەت براکەم و ژنەکانیش نەکرووزانەوە و پیاوەکان سەخت بوو نیگەرانی خۆیان بشارنەوە.

-باشە ئێوە چیتانە؟ ئارام ببنەوە ئێستا میت وەك مەڕی بەستەزمانی لێهاتووە.

براکەم پرسی:

-ئەها بەڵێ! کەواتە خێرا پێمان بڵێ لەگەڵ فەرماندە چی ڕوویدا؟

براکەم پێی وابوو کە ئەوانە هەموو شتێك ئەزانن لەبارەمەوە و ئێستا ئەومیان بەلاوە گرنگە کەبزانن ئایا تەواو(عاقڵ)بووم، یا هێشتا هەمان(ماخۆلانی نەتەوەی کوردم).

براکەم ڕووی تێکردم:

-ئەزانم، ناوەندەکانی سەرکردایەتی تورك، ترسیان لەهەموو شتێك هەیە پەیوەست بێت بەکورد،ئەرکی سەرەکیی میتیش چڕبووەتەوە بۆ شەڕی دژی هەر ئاواتێکی نەتەوەیی

ئەم میللەتە، ئەگەر تۆش بەتەمایت لەتورکیا بمێنیتەوە و بێوەی بژیت، کەواتە ئەبێت بیر لەو شتانە نەکەیتەوە.

وەڵامم دایەوە:

-دەستبەرداربوونی مەسەلەیەك کەبەشی زۆری ژیانم رەنجم بۆ کێشاوە، بەهیچ شێوەیەك نابێت. بەڵام لەبەردۆخەکەی خۆمی تیام هەوڵئەدەم لانی کەم بۆ چەند ساڵێك نەبمە جێ سەرنجی دەسەڵاتداران.

براکەم روی کردە ئاسمان وەك یەکێ نزا بکات و پێی وتم:

-لەخوا ئەپاڕێمەوە تا مرادت بدات خۆت بگری و نەبیتە مەکۆیەك بۆ راکێشانی ئەو گەنجە کوردە نەتەوەییانەی سەرنەکەنە سەر حکومەت.

ریزۆ بەقوولیی باوەڕداربوو و ئەرکەکانی ئیسلامی بەراستگۆیی و بێگەردیی مناڵێکەوە ئەنجام ئەدا و هەمیشە چاوەڕێی بەزەیی خودا بوو لەکاتی دۆخە سەخت و ئاڵۆزەکاندا.

ملم بۆ دۆخەکە داو و قایل بووم بەچارەنووسەی مانەوە لای براکەم بۆم دیاریی ئەکات، لەچاوەڕوانیی بڕیاری حکومەتدا و دوومانگم لەوێ بەسەربرد بێ ئەوەی بچمە دەرەوە و پێشوازیی میوان بکەم، بە دەگمەن نەبێ.

سەرەتای تەموزی ١٩٦٨ ئامۆزایەکم کە کێڵگەیەکی هەبوو لەبیرماز، داوای کرد هاوین لای ئەو بەرێکەم و خۆشترین رۆژەکانی ژیانم تیا بەسەربرد.

دەمەوپاییز کاتێك بینیم حکومەت کاری بەسەرمەوە نییە، وام لێکدایەوە کەبەکردەوە قایل بووە بەمانەوەم لەتورکیا، بۆیە بڕیارمدا بەختی خۆم لەکشتوکاڵدا تاقیکەمەوە، بە وەبەرهێنان لەو کێڵگەیەی باوکم بۆی جێهێشتووین لەدەشتی کۆرانی نێوان ئەرغانی و دیاربەکر. تا باوکم مابوو زیاتر لە دەهەزار هیکتار زەوی بەپیت و گونجاو بۆ کشتی گەنمی

رەقمان هەبوو،بەلاّم تەنیا دووهەزار هیکتاری مابوو کەبراکەم دابووی بەکرێ، بەپارەیەکی لەجێی نەبووان، بەهۆی ئەو زیانەی مێرووی سن ئەیگەیاند.

پەیوەندیم لەگەلّ کۆمەلّێك کشتیار کرد، کە تراکتۆریان هەبوو بەلاّم زەوییەکانیان بچووك بوو و ئامانجەکەمم بۆ روونکردنەوە، دوو کەسی هاوبەش هاتنە پێشەوە و پێشنیازی بەشدارییان کرد لەگەلّم، بەمەرجی دابەشکردنی وەکیەکی قازانج، زەوی و تۆویش لەسەر من.

پێموتن:

-قایلم، بەلاّم چی ئەلّێن ئەگەر پێش دروێنە مێرووی سن لێیدا ؟

بەشان هەلّتەکاندنەوە وەلاّمیان دامەوە:

-ئێمە سەرکێشیی ئەکەین. بیستوومانە حکومەت چالاکانە ئەکەوێتە خۆ بۆ رشاندنی دژە مێروو بەفرۆکە و لەکاتی گونجاودا، پاشان ئێمە هەر گەنمی رەق ناچێنین، بەلّکو بەشێکی زەوییەکە ئەکەینە گەنەشامیی سپی، کەترسی سنی نییە.

چەند رۆژ دواتر دەستماندایە کار و بۆ ئەوەی بەرهەمێکی باشمان هەبێت پەیینی کیمیایی پێویستمان کڕی و بەباشم زانی لە (ئەرغانی) بەدووری ١٥ کیلۆمەتر لەکێلّگەکەمان بیهێنمەوە بۆسەرۆکاری کشتوکالّەکە. کارەکان بەویستی خۆمان ئەڕۆشتن و باران لەکاتی گونجاودا باری. سەرەتای مانگی مایس کشتەکەمان بەشێوەیەکی سەرنج راکێش بالاّی کرد و رەنگەسەوزە جوانەکەی نیشانەی بەهێزیی و ساغیی بوو و دلّنیابووین لەسەرکەوتنی پرۆژەکەمان و شادمانی ئەنجامەکان بووین، کەچی هەوالّێکم لەگۆشەیەکی(رۆژنامەی فەرمیی)دا خوێندەوە کە حکومەتی ئەنکەرە بێبەشی کردووم لەرەگەزنامە تورکییەکەم. ئەمە زەنگێکی ترسناك بوو.

کە هاتمەوە سەرخۆ، بەهەلّەداوان چووم بۆ سەرا بۆلای (نیازی ئینجە)ی نوسەری دادگە، کەنێوانێکی پتەومان هەبوو و بەرەگەز کورد بوو بەلاّم نەیئەوێرا ئاشکرای بکات. لەناخەوە

پیاوێکی دەستپاکی نیشتمانپەروەر بوو و هەوڵی ئەدا خزمەتی هەرکەس بکات کەلەدەرگەی ئەدات، بەتایبەت ئەگەر خەڵکی سادە و هاووڵاتیی ئاسایی و گیرۆدەی ئارەزووی فەرمانبەران بوایە.

ئاگاداری هەستی نەتەوەیی کوردیم بوو و ئەو رۆژەش کە رۆژنامەکەم پیشاندا، بەخەمێکی قووڵەوە چاوی بڕیە رووخسارم.

-مافی ئەوەت هەیە داوای پیاچوونەوەی بڕیارەکە بکەیت لای ئەنجومەنی وڵات، بۆیە ئەبێت خێرا بچیت بۆ دیاربەکر و لەوێشەوە بۆ ئەنکەرە. بەڵام ئەبێت سەرەتا بزانیت هۆکارە قانونییەکانی سەندنەوەی رەگەزنامە تورکییەکەت چین. دوو نامەت ئەدەمێ بۆ دوو هاورێ، یەکێکیان لە دیاربەکرە و ئەوی تر لە ئەنکەرە، و هەردووکیان لە بواری تۆماری سڤیلدا کارئەکەن و ئەتوانن یارمەتیدەربن.

سەرەتا چووم بۆ دیاربەکر بەنامەکەی نیازی ئینجەوە و کارمەندی تۆماری مەدەنیم بینی و هەر کە ناسیمی بە وشکیی وەڵامی دامەوە:

-بەڕێز تۆ بەهەڵە هاتوویت، ئەم شتانە بەکارەکەی من نامۆن.

دوای قسەکانی، کارتەکەی نیازی ئینجەی دڕاند و خستییە تەنەکەی خۆڵەکەوە. تەماشای رووخساریم ئەکرد کەچۆن زەرد ئەبێت و ئەلەرزێت. وادیارە ئەم کارمەندە رەچەڵەك کوردە کەوتووەتە داوی تورکاندنەوە و زندەقی ئەچێت لەهەرچی بۆنی کوردبوونی لێبکات. دواتر زانیم کەدەسەڵاتی تورك توانیویەتی ئەم هەستە لەناو زۆر لەکارمەندانی کورددا بچێنێت، بەتایبەت ئەوانەیان کەپۆستی بەرزیان هەیە.

لەفەرمانگەی تۆماری سڤیلی ئەنکەرەش کاتێك هاورێ تورکەکەی نیازی ئینجە، نامەکەی خوێندەوە، رۆشت بۆ ئەوەی پرسیاربکات و بەشێوەیەکی سەیر ونبوونەکەی زۆری خایاند، لەگەڕانەوەیدا و بەهۆی هەڵسوکەوت و دەنگییەوە سەرنجمدا زندەقی چووە و

بەهەزارحاڵ توانی بەگوێمدا بچرپێنێ کە هەوڵ بدەم بەڕێوەبەر ببینم. پاش چەند خولەکێك دەرگەوانێك کردمییە ژووری سکرتێرەوە کە یەکسەر دۆسییەکەمی دۆزییەوە.

بەتۆنێکی بەرزەفڕەوە پێی وتم:

-شتێکی سادەیە، رەگەزنامە تورکییەکەت لەدەستداوە چونکە بێ رێپێدانی حکومەتەکەمان رەگەزنامەی سوریات وەرگرتووە.

-بەڵام ئەو دەمە منداڵ بووم و ناکرێت ئەو قانونەم بەسەردا جێبەجێ بکرێت.

-ئەوە شتێکە پەیوەندیی بەئێمەوە نییە، برۆلەوبارەوە قسە لەگەڵ ئەنجومەنی دەوڵەت بکە.

سەراسیمەبووم، وەلی هێشتا تەواو هیوابڕاو نەبووم. غالب، ئەو پارێزەرەی لەسەرەتاوە راوێژم پێکردبوو، پێی وتم:

-کارەکەت ناسکە چونکە کێشەی کورد وەك مۆتەکەیەك خەڵکی وڵاتەکەمان نەهەژێنێت. نەبێت کەسێکی نەترس بدۆزینەوە ناشەرعیی بوونی بڕیارەکەی حکومەت لەبارەی تۆوە بسەلمێنێت. خۆ گەر بتوانین پشتیوانیی رەمزی لەقازانجی کێشەکەمان بەدەست بێنین، ئەوا هەر لەئێستاوە براوەین.

رەمزی،ئەندامی ئەنجومەنی وڵات و سەرۆکی نوسینگەی یانزەهەم بوو، بن ئامۆزایەکی دووری خێزانەکەمان بوو.

-ناتوانم بڕیارِ لەسەر رابردووت بدەم بەڵام بەپێی قانون حکومەت هەڵەی کردووە و بەڵێن نەدەم ئەنجومەنی وڵات ئەوبڕیارەی بەرامبەرت دەرکراوە، هەڵبوەشێنێتەوە.

هەڵوێستەکەی رەمزی، غالبی شادمان کرد و هانی دام لە نزیکترین نوسینگەی دادوەریی، بریکاریی نامەیەکی بۆدەرکەم.

بەو شێوەیەی رێکەوتبووین، غالب تانەی لەبڕیارەکە داو داوای چاوخشاندنەوەی کرد بە حوکمەکەدا. بەنیگەرانییەوە چاوەڕێی کۆبوونەوەی ئەنجومەن بووین، کەدوای ٢٠ رۆژ

بەسترا و چاوخشاندنەوەکەیان ڕەتکردەوە، لەبەر هۆیەکی سادە، کە کەس نەبوو بەرگریی لەمافەکانم بکات. چونکە ڕەمزی و دۆستێکی تری دیاربەکری بیانوویان دۆزیبووەوە تا ئامادەی کۆبوونەوەکەی ئەنجومەن نەبن. غالب ئەم ترسنۆکیی خوێڕییەتییەی بۆ قوت نەنەچوو.

کەوتە هاوار و پیاکێشانی مێزەکەدا:

-تورکەکان بەهۆی ترسنۆکیی ڕووناکبیرە ڕێ هەڵەکانمانەوە ژێرچنگیان خستووین و ئەمانچەوسێننەوە. بەڵام خەمت نەبێت ئەتوانین دووجار داوای پیاچوونەوە بکەین و هەرئەمرۆ داواکە بەرز ئەکەمەوە. تائەو کاتەش بگەڕێوە ئەرغانی بۆ سەروکاریی کێڵگەکەت.

کە پێشهاتەکانم بۆ نیازی ئینجە گێڕایەوە، نیگەران بوو و نەفرەتی لەوکەسانە کرد کە بۆ کێشەکەم بینیومن.

-گەر ئەنجومەنی وڵات داوای پیاچوونەوەی حوکمەکە ڕەت بکاتەوە، ئەو کات ئەبێت چاوەڕێی دەرچوونی فرمانی گرتن و دەرکردنت لەتورکیا بکەیت. لەبارەشەوە من یەکەم کەس ئەبم بڕیارەکەم ئەگاتەدەست و ئەبێت بەرزی بکەمەوە بۆبریکاری پارێزگار. لەوکاتەدا هەوڵ ئەدەم پەیوەندیت پێوە بکەم. کەواتە لەئێستاوە کارەکانت ڕێکبخە.

کارەکانم هیچ باش نەبوون و مێرووی سن بەرگی پرسەیان پۆشیبوو و کەوتبوونە وێرانکاریی،هاوکات هاوبەشەکانم بەداخ و کەسەرەوە، تەماشای ڕەوە مێرووی زەردیان ئەکرد کە بەسەر گوڵەگەنمەکانەوە ئەنیشتنەوە.

بەدڵێکی زامدارەوە پێموتن:

-ها! هەر ئاوا دەستەوەستان تەماشا ئەکەن؟

-جا چیمان پێئەکرێت؟ هیچ ئامرازێکمان نییە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیان.

-ئەی فڕۆکەکان؟

-حکومەت تەنیا دوو فرۆکەی ناردووە و ئەوانیش لە کێڵگەکەی ناجی یەڵمازن، پێنج کیلۆمەترێك لێرە بەرەو خوار.

- ئەوە کێیە؟

-کابرایەکی تورکی خەڵکی (ئەزمیر)ە. ساڵانێکە زەوییەکی زۆری ناوچەکەی کڕیوە و لەگەڵ فرۆکەوانەکان رێکەوتووە لەکێڵگەکانی ئەو زیاتر، هیچ کوێ نەرشێنن.

- با بچین ئەو فرۆکەوانانە ببینین.

وەڵامیان دامەوە:

-سوودی نییە. گوێت لێناگرن، جگەلەوەش تازە کات بەسەرچووە.

سواری ئەسپەکەم بووم و کەگەیشتمە لای چادری فرۆکەوانەکان، پاسەوانێك ئاگاداری کردم:

-لەبەیانییەوە ماندوو ئەبن و ئێستاش ئەحەوێنەوە.

کە بێداربوونەوە کەوتمە سەرکۆنە و گلەیی بەهۆی لایەنگرییان و داوامکرد بایەخ بەو کێڵگانەی تریش بن کەهەرەشەیان لەسەرە. خێرا یەکێ لەفرۆکەوانەکان کەوتە هێمن کردنەوەم:

-لەخۆڕا تووڕە مەبە. ئێمە نێردراوینە ئەم ناوچەیە بۆقەلاچۆکردنی سن لەهەرکوێ بێت، کە نەشهاتووین بۆ لای ئێوە لەبەر کەم توانایی ئەوا ئەبێت هەوڵی زیاتر بدەین. بەڵام پیشانم بدە کێڵگەکەت لەکوێدایە تا سبەینێ زوو بیرشێنم و چارەی بکەم.

بەراستیش سەعات هەشتی بەیانی رۆژی دواتر فرۆکەکە گەیشت و بەدەنگێکی زل و لەگەڵ باراندنی دوکەڵێکی سپی چڕ، بەسەر کێڵگەکەماندا تێپەڕی، کەچی هێشتا چارەکی زەوییە چێنراوەکەی نەرشاندبوو، دەرمانەکەی پێنەما. ئیتر چەندم هەوڵدا بێسود بوو بۆ قایلکردنی فرۆکەوانەکان بەبەردەوام بوون. ئەو بروسکانەشی ئەنێردرانە ئەدەنە و ئەنکەرە و داوای ناردنی مێرووکوژی زیاتریان ئەکرد، بێ وەڵام بوون، چونکە دەرمانەکە

لەئەمبارەکانی حکومەتدا نەمابوو و ئەبوو لەئەڵمانیا داوا بکرێت. حکومەتی تورکیاش دراوی قورسی پێویستی نەبوو. پاش دووهەفتە و کاتێك دەڕاسەکان کەوتنە دروێنە، لەبەرامبەر دە تۆن گەنمدا کە چاندبوومان،تەنیا چوار تۆن گەنمی کۆکردەوە کەلەسن رزگاری بووبوو، ئەمەش واتە نیوەی گوڵەگەنمەکان پووچ بوون. شۆکێکی توند بوو، بەڵام دڵنەوایی خۆمان بە گەنمەشامییە سپیەکە ئەدایەوە کەخۆشبەختانە بەردەوام گەشە و باڵای ئەکرد و هیواداربووین لانی کەم قەرەبووی زیانی گەنمەکەمان بۆبکاتەوە،کەچی رەوتی پێشهاتەکان خێراتربوون و ناچاربووم بەر لە وەرزی دروێنە ئەوێ جێبێڵم.

رۆژی ٢ ی تەموز هاوڕێ نەترسەکەم، نیازی ئینجە،خێرا بردمییە نوسینگەکەی خۆی و بەڵگەنامەیەکی وەزارەتی ناوخۆی پیشاندام، کەداوا ئەکات ناوم لەتۆماری سڤیلی شاری ئەرغانی بسڕدرێتەوە و پۆلیس ئاگاداربکرێت تادەستگیرمکەن و وەك بێگانەیەك لە وڵات دەرمکەن.

واتە دوای بەسەربردنی ماوەیەك لەزینداندا، نازانم لەکوێی تورکیا، رادەستی سوریام ئەکەن!....باوەڕم بەچاوی خۆم نەئەکرد!

نیازی هێوری کردمەوە:

-هیچ هۆیەك نابینم بۆئەم نیگەرانییەت. من فەرمانەکە وەك خۆی جێبەجێ ناکەم. ئەم بەڵگەنامەیە ئەخەمە ژێر هەموو ئەو شتانەی ترەوە کە ئەبێت بخرێنە بەردەستی فەرماندار و ١٥ رۆژێك لای خۆم ئەیهێڵمەوە. ناتوانیت لەو ماوەیەدا تورکیا جێبهێڵیت؟

-با، ئێستا پاسپۆرتەکەم پێیە. هاوڕێیەکم بەدەم چەورکردنی پۆلیسێکی دیاربەکر بۆی دەرهێناوم و میتیان لێ ئاگادار نەکردووە. قسە لەگەڵ پارێزەرەکەشم ئەکەم تا بزانم رێژنە ئومێدێك هەیە تا کارەکانم بەقانونیی بۆ رێکبخات.

لەودەمەیدا من قسەم ئەکرد نیازیی شوشەیەکی بچووکی لەگیرفانی دەرهێناو حەبێکی لێدەرهێنا و قوتیدا.

-ئەوەی خواردت (ترینترین)بوو. بۆ بەکاری ئەبەیت؟ خۆ نەخۆشی دڵت نییە؟

-چەند رۆژ لەمەوبەر گرفتێکی کەمم هەبوو، پزیشکەکەم وتی ترسناك نییە و ئامۆژگاریی کردم ئەو حەبە بخۆم، بۆیە کەهەست بە دڵگوشران ئەکەم،دەنکێکی لێ ئەخۆم.

جەختم لێکرد:

-بەڵام پێویست بوو پزیشکێکی دڵ بتبینێت.

-بۆ ئەوە پێویستە بچمە ئەنکەرە یا ئەستەنبوڵ،منیش نە کات و نەتوانای ئەوەم نییە، بێگومانیشم گرفتەکەم ئەو سەفەرەی ئیوێست نییە.

پێشنیازمکرد لەگەڵم بێت بۆ ئەنکەرە بۆئەوەی پسپۆڕێکی بەناوبانگ بیبینێت، بەڵام قایل نەبوو و دوای چەندین جار تکاکاریی، بەچاوی پڕئەسرینەوە جێمهێشت و سواری ئەو پاسە بووم کە لەرێی ئیلازیغەوە ئەچووە ئەنکەرە. هاورێ پارێزەرەکەم بێئومێد و رەشبین بوو لەبارەمەوە، چونکە هێشتا سایەی میت باڵی کێشابوو بەسەر ئەنجومەنی وڵاتدا و هیچ دادوەرێك نەبوو زات بکات، حوکمێك بدات دژی برِیارەکەی حوکمەت. ئامۆژگاری کردم دەستبەرداری سکاڵاکەبیم و پێش کاتبەسەرچوون تورکیا جێبهێڵم. هاورای ئەو بێ ورمییەی نەبووم و نیازم وابوو پارێزەرێکی نەترس و خۆراگرتر بدۆزمەوە. بەڵام کاتم نەما و رۆژی دواتر هەواڵێکی گورچکبرِم پێگەیشت، هاورێ دڵسۆزەکەم، نیازیی نینجە، کەهەموو شتێك و زیاتریشی بۆ کردبووم، کۆچی دوایی کردووە.

ئامۆزایەکی بۆی گێرِامەوە:

-هەر سێ رۆژێك دوای رۆشتنی تۆ، فرمانێکی نوێ هات لەبارەتەوە بۆ فەرماندار کەئەنجارمیان یەکسەرەبوو.نیگەرانی رووخساری نیازی ئیجەی داگرتبوو و نەیئەزانی چی بکات. وێڵی بیرکردنەوە و گەرِان بووین لەچارەیەك، کە نۆرەدڵەیەکی توند لەناکاو لێیدا و لەبەردەمدا کەوتە سەرمێزەکەی، کاتێك ئەو تەنیا پزیشکەی توانیم بیدۆزمەوە گەیشتەسەری، تەنیا هێندەی بۆکرا وەستانی دڵ و گیان دەرچوونی ئەو کڵۆڵە بسەلمێنێت.

کارەساتێکی گەورەبوو، ئاخر نیازی مرۆڤێکی رەوشت بەرز و نمونەیی بوو، لەنێوان خۆماندا پارەمان کۆکردەوە بۆدانەوەی قەرزەکانی بە عەتار و نانەوا و چایخانەکانی شارەکە.

لێوی خۆمم گەزی تا بەر بەگریانم بگرم. نیازی نەخۆش بوو بەلاّم نەمتوانی فریای کەوم و خەمخۆریی خۆی و گرفتەکانی منیش سەرباری، مردنەکەیان خێراتر کرد.

دلّم لەخەمدا خوێنی ئەدەلاّند و هەستم بە تاوان ئەکرد بەرامبەری و هێز و ئازایەتیی تێکۆشانم نەما بۆ وەرگرتنەوەی مافەکانم، ئیتر نەبوو خۆم ئامادەبکەم بۆ جێهێشتنی نیشتمانی زێد و جوانترین رۆژانی منالّیم بەیەکجاریی و بەناچاریی.

هەندێك دراوسێی ئیلازیغیی پێشنیازییان کرد لەگەلّ ئەوان برۆم بەو پاسەی ئەچێت بۆ میونخ، قایل بووم و بەخۆمم وت:

-هیچ نابێت ئەگەر لەسەر سنوور شتێکم بەسەرهات ئەوانن ئەتوانن خێزانەکەم ئاگاداربکەن.

لای ئێوارە پاسەکەمان ئەستەنبولّی جێهێشت و هەستێکی قولّ دلّمی داگرت، سەیری ئەو شوێنانەم ئەکرد کەخۆشم ئەویستن و ئیتر نایانبینمەوە: ئەو قاوەخانانەی ناساندیانم بەشاعیر و نوسەرانی کوردپەرست و خوێندکارانی شۆڕشگێڕ و زانکۆییەکان، کە رووبەڕووی ئەو باندە فاشییە مەشقدراوانە ئەبوونەوە کە ئەنێردرانە سەریان. خەمباری جێهێشتنی شانۆکانی ئەستەنبولّ بووم. لەخەیالّی ئەو رابردووەدا بووم، کە وشەی (کاپیکالا) هاتە گوێم، خالّێکی پشکنینی تورکیا بوو لەسەر سنووری بولگاریا. کات ٢٢:٣٠ خولەك بوو کەپاسەکە وەستا و کارمەندێکی سیڤیل سەرکەوت و داوای پاسپۆرتەکانمانی کرد و بردی بۆ بنکەکە. سەرۆکەکەیان لە بەلّگەنامەکانمان ورد ئەبووە و جارجار یەکێك لەگەشتیارەکانی بانگ ئەکرد. دوو ژەندرمەی چەکداریش بەچەکی ئۆتۆماتیکیی پاسەوانی ئەملاولای پاسەکە بوون.

دڵم وەك تەپڵ ئەیكوتی و قورگم ئەگوشرا وەك ئەوەی مارێك ئاڵابێتە گردنم و بمخنكێنێت، ئەم دڵەڕاوكێیە دوو سەعاتێكی خایاند و ئەتوت تەواوبوونی نییە. بێگومان بڕیاریان داوە تا بەیانی پاسەكە راگرن.یەكێ لەشۆفێرەكان چووە بنكەكە و دوای چەند ساتێك دەم بەخەندە گەڕایەوە و پاسپۆرتەكانی داینەوە. دوایش بینیمان خەندە نیشتە سەر لێوی كارمەندانی گومرگ و پۆلیسی توركیا و هیوای سەفەرێكی شادیان بۆ خواستین.

بڕوام بەچاوی خۆم نەبوو! هێشتا ئەترسام لەدواساتی پێش داخستنەوەی دەرگە ئاسنینەكەدا، كارمەندەكان رایان بگۆڕن. ترس بەرۆكی بەرنەدام تاچووینە خاكی بولگاریاوە. ئەمویست لەكاتەدا پڕبەدەنگم هاوار بكەم:

-ئازادی، ئازادی، ئێستا ئیتر ئازادم!

پاش كەمێك خەوێكی قووڵ وئارام راپێچی كردم و تا رۆژی دواتر بێدارنەبوومەوە. گەیشتبووینە شاری سۆفیا كەساڵی ١٩٤٩ سەردانم كردبوو و ئەودەمە شارەدێیەكی بچووك بوو، كەچی ئێستا شارێكی مۆدێرنە بە شەقامی پانوپۆڕ وتونێلە روناكەكانییەوە بەشێوەیەكی سەرنجبەر. دێهاتی بولگاریاش دڵگیربوون بەبێستانی سەرسەوز و بایەخپێدراو و مێوستانی گەشەوە.

لەوەیان هاتمە دەرێ تا دیمەنێكی تر بدۆزمەوە، ئەمسا خافڵگیری كردم بەو پێشكەوتنە مەزنەی لەساڵی ١٩٥٦ وە بەخۆوەی دیوە. بەڵام سەرسوڕمانی راستیی لەئەڵمانیا بوو، كاتێ رووبەڕووی كۆمەڵگەیەكی بەكاربەر بوومەوە، لەوجۆری بەردەوام میدیای خۆرئاوا باسی ئەكرد و سەركۆنەی ئەكرد، دیمەنی ناقۆڵای بازاڕەگەورەكان و ریزی بێكۆتایی كڕیاران.

تامەزرۆی گەڕانەوە بووم بۆ سویسرا و لێكۆڵینەوەكانم و هاوڕێیانی جێی شانازیم، كە گەرم و برایانە پێشوازییان كردم.

وا ئێستا لەساڵی ۱۹۷۰ داین و دوای چەند مانگێك مافی پەنابەریی سیاسیم وەرگرت و ساڵی ۱۹۷۲ خانمێکی سویسری بووە هاوسەرم، کە ئاگاداری کێشەی کورد بوو و سەردانی کوردستانی تورکیاشی کردبوو. بەهاری ۱۹۷۳ و دوو رۆژ بەر لەنەورۆز، کوڕەکەم هاتەجیهانەوە کە عاشقی گۆرانی کوردییە هێندەی عەشقی بۆ گۆرانی فەرەنسی و تورکی و عەرەبی و ئەرمەنی.

سەرەنجام لەپاییزی ۱۹۷۸ دا بوومە هاوولاتیی ولاتێك کەبەردەوام وەك نمونەی سیستەمێکی دیمۆکراسیی باسکردووە. ولاتێك کەهەمیشە لەئامێزیدا هەستمکردووە لەنیشتمانەکە خۆمدام، لە سویسرا هەست ئەکەم زیاتر و زیاتر هۆگری ئەو دیمەنانەی ئەبم کە سروشتی شاخاوی و دەریاچە و جۆگەلەکانی کوردستان دێننەوە یادم.

کاتێك تەماشای بەفربارینی بەزریان و گەردەلول ئەکەم، کاتێك رەشەبای سارد و وشك هەڵئەکات و وەك زللە ئەکێشێت بە روومەتەکانمدا، وا هەست ئەکەم کەهێشتا منالە بچکۆلەکەم و لەکوردستانم. بەتەڕیی لەسەر بەفرەکە خلیسکێنە ئەکەم. بەلام شادمانیش ئەبم کاتێك ئەبینم درەختەکان چرۆ ئەکەن و گوڵ ئەگرن و لەکێڵگەکانیشدا ئەبینم گوڵەگەنمەکان ئەکەونە سەما.

کوردستانیشم لەیاد ناچێت کەلەململانێدایە بۆمانەوە. کوردستانی پارچەکراوی نێوان تورکیا و ئێران و عێراق و سوریا. کوردستان کە رووبەڕووی قڕ و هەموو جۆرەکانی سەرکوت و چەوسانەوە بووەتەوە، تا ئەمڕۆش(۱۹۸۲) هەروەك دوێنێ.

وەك پیاوێکی ئازاد کەلەولاتێکی دیمۆکراسیدا ئەژی، ناتوانم بێدەنگ بم لەبینینی سیمای کوردانی نەدار و ژاندار کە تائەمڕۆش لەخۆرهەلاتی ناوەڕاستدا لەبەر کورد بوونیان ئازارئەدرێن، ناتوانم نیگای ئەو منال و ژن و پیاوانە پشتگوێ بخەم، کە بەتەماشاکانیان هەموو رۆژ و هەموو سەعات و چرکەیەك ئەمدوێنن.

کەی جیهان و سەرکردەکانی هەست بەنیگەرانیی راستەقینە ئەکەن و چارەیەك ئەدۆزنەوە بۆ هەموو کێشەکانی چەوسانەوە و دەستبەسەراگرتنی جیهان؟ نازانم. بەلآم ئەوە ئەزانم کە:(تا بەردەوام مرۆڤ پێشێل بکەن بیچەوسێننەوە لەهەرجێیەکی جیهاندا، ئەوا مرۆڤایەتی سبەینێیەکی باشتر نابینێت.)

بۆسینی، مانگی شوباتی ١٩٨٢

## وتەیەکی حەمید دەروێش

## کە بۆ پێشەکی بەشی یەکەمی کتێبەکەی نووسیووە:

سەرەتای ساڵی ١٩٥٦ چاوم کەوت بە(د. نورەدین زازا). ئەوساڵە من لەپۆلی ١١ بووم لەدواناوەندیی ئەهلیی لەگەڕەکی بەحسەی دیمەشق. دکتۆر زازاش تازە خوێندنی تەواوکردبوو،بڕوانامەی دکتۆرای لەزانستی کۆمەڵناسیدا وەرگرتبوو لەزانکۆی لۆزان لەسویسرا، و گەڕابۆوە بۆ سوریا. ئەودەمە پەیوەندییەکانی نێوانمان هێند پتەوبوو کە زۆربەی کاتمان بەیەکەوە بەسەرئەبرد و پێکەوە نانمان ئەخوارد لەچێشتخانەی (البرج الفضي)کە کەوتبووە شەقامی فیردەوس لەقاتی دووەمی باڵەخانەیەك لەدەروازەی خۆرهەلاتی شەقامەکە، کەئێستا هیچ شوێنەوارێکی نەماوە، یا لەچێشتخانەی (الریس)کە کەوتبووە باکووری خۆرهەلاتی تەلاری پارێزگەی دیمەشق و تا ئێستاش هەرماوە. زۆر ئاسایی بوو کە من وەك مامۆستا و پەروەردەکارێك سەیری بکەم، چونکە هەر لەمناڵییەوە پێی سەرسام بووم، ئەو کاتانەی سەردانی گوندی قەرمانییەی ئەکرد و خۆی و چەند کەسێکی تر وانەی کوردییان پیّ ئەوتین، منیش گوێم لەئامۆژگاریی و ڕاوبۆچوونە سەنگینەکانی ئەگرت سەبارەت بەبابەتە سیاسی،نەتەوەیی وبیرباریبەکان، ئەویش رێنمایی ئەکردین لەبوارە جیاجیاکاندا. پەیوەندیی باشیشی هەبوو لەگەڵ کوردە نیشتمانپەروەرەکانی دیمەشق وەك رەوشەن بەدرخان،عوسمان سەبری، قەدری جان و ئەوانیتر. هەروەك پەیوەندیشی باش بوو لەگەڵ هەموو کوردانی نیشتمانپەروەر لەسوریا بەجیاوازیی بیروڕای سیاسییانەوە.

کاتێك ساڵی ١٩٥٦من و عوسمان سەبری و هەمزە نوێران کەوتینە پێکهێنانی رێکخراوێکی سیاسیی بەناوی (پارتی دیموکراتی کورد لەسوریا)، نورەدین زازا پشتی گرتین

و هانیداین بۆ بەردەوامبوون لەکارەکە، پاشان هاوکاریی کردین بۆ دانانی بەرنامەی سیاسیی پارتەکە، ئەوەشی دووپاتکردەوە کەبەرنامەکە بابەتییانە بێت و دووربێت لەتوندڕەویی و دروشمی ناواقیعی. هێندەشی نەبرد لەساڵی ١٩٥٨دا هاتە ناو پارتەکەوە و لەئەنجامدا بەکۆی دەنگ بەسەرۆکی پارتەکە هەڵبژێراو بەلێهاتوویی و تواناوە سەرکردایەتیی پارتی کرد.

لەئەنجامی ئەو پەیوەندییە گەرموگوڕەی لەگەڵیدا هەمبوو، پێش هاتنی بۆ ناو پارتی و کاتی سەرکردایەتی لەکۆمیتەی ناوەندیی پارتیدا، من زۆر لەنزیکەوە دکتۆر نورەدینم ئەناسی.

نورەدین زازا، رووناکبیرێکی زۆر گەورەبوو، نەك تەنیا لەبەرئەوەی دکتۆرای هەبوو لەزانستی کۆمەڵایەتیدا، بەڵکو چونکە شارەزایەکی قووڵ بوو لەهەموو بوارەکانی رووناکبیریشدا.

نورەدین زازا، لەمامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکدا راستگۆبوو، جا ئەو خەڵکە هەرکەسێك بوایە. وەفاداربوو لەگەڵ هاوخەبات و هاوڕێکانی و فێڵ وغەدری نەئەزانی،گەلی کوردی لەناخەوە خۆشئەویست و شانازیی بەکوردبوونی خۆیەوەئەکرد، بەڵام هەرگیز هەستی رق و دوژمنایەتی لەبەرامبەرکەسدا نەبوو، بڕوای هەبوو بەخەباتی هاوبەش لەنێوان گەلی کورد و ئەو گەلانەی لەگەڵیان ئەژی لەپێناو ئازادیی و دیموکراسیدا.

دکتۆر نورەدین لەرەفتاردا دیموکراسی بوو، سیاسییەکی بەرچاو روون بوو، لەسەر بنەمای زانستیی و بابەتیانە بارودۆخی سوریا و ناوچەکە و جیهانی شیئەکردەوە، رۆژێك لەرۆژان تووشی هەڵچوون و هەستی شۆڤینییانە نەبوو لەوەرگرتنی هەڵوێستی سیاسیدا، هەر ئەمەش لەکەسانی تری جیائەکردەوە لەسەنگینی و واقیعی بووندا.

لەکاتێکدا پێشەکی بۆ کتێبەکەی دکتۆر نورەدین زازا ئەنووسم، بەداخەوە ئەڵێم ئێمە نەمانزانی مامەڵە لەگەڵ ئەوکەسایەتییە دیاربکەین و سوود لەوتوانا بیرییە گەورەیەی

نورەدین زازا وەرگرین، بەڵکو خراپەمان لەگەڵ کرد و بەئەنقەست و بەبڕوبیانووی جۆراوجۆرەوە هەوڵی شکاندنی کەسایەتی ئەوماندا. حاشا لەوەش ناکەم کە نورەدین وەك هەرمرۆڤێکی تر لەهەندێك بابەت و رەفتاردا هەڵەی کرد، بەڵام ئەمە بیانوو نییە بۆ ئەوهەڵسوکەوتە ناقۆڵا و دزێوەی لەلایەن هەندێك هاوڕێی پارتییەوە بەرامبەری کرا.

لەکۆتایی ئەم پێشەکییەدا سوپاسی برای ئەندازیار دەروێش غالب وەرگێڕی ئەم کتێبە ئەکەم، کەمنی هەڵبژارد بۆ پێشکەشکردنی کتێبەکە، بەوەش زیاتر شادمانم کاتێك لەبارەی نورەدین زازاوە ئەنووسم، یادگارییە شیرینەکانم لەگەڵ ئەو پیاوەدا دێتەوە یاد کەرێز و پێزانینێکی زۆرم بۆی هەیە. ئەویش هەرچەندە لەلایەن هاوزمانەکانییەوە رێزی شایانی خۆی لێنەگیرا، بەڵام یەکێکە لەوسومبولانەی چاوی لێنەکرێت لەکاروانی خەباتی نیشتمانیی گەلی کورددا.

حەمید حاجی دەروێش



نورەدین زازا - ناوەڕاست، عیفەت - لای چەپ

مادن- ١٩٢٣



کوردانی دیمشق- ١٩٢٩. نورەدین زازا، دانیشتووی یەکەمی لای چەپ



حەڵەب - ١٩٣٢



نورەدین زازا، سوریا — ١٩٣٢



بەیروت ١٩٤٦

د.نافیز، وەستاوی لای چەپ



ڤالىّ، سويسرا- ١٩٧١



نورەدین زازا، گیلبیرتی هاوسەری و شەنگۆی کوڕیان-سویسرا — ١٩٧٣



زازا و شەنگۆ- ١٩٧٤



گیلبیرت و زازا، سویسرا- ١٩٧٤



ڤۆد، سویسرا – ١٩٧٤



کریزۆن، سویسرا — ۱۹۷۹



گیلبیرت ڤاڤر، هاوسەری نورەدین زازا- قەلاّدزێ ۱۹۹۲




بەرگی چاپی فەرەنسی کتێبەکە

